پرۆژەی تیشك -53

# بیری ئوسووڵی ئیسلامی

## لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێنەواریدا

نەزانیو نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی لە کتێبی

بیری ئوسووڵی ئیسلامی

فوئاد مەجید میسری

فاضل قەرەداغی

2009-1430

**ناوی كتێب:** بیری ئوسووڵیی ئیسلامی لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێنەواریدا.. نـەزانیو نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی لە كتێبی بـیری ئوسـووڵیی ئیـسلامیی فوئـاد مەجیـد میسری

**نووسینی:** فاضل قەرەداغی

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (١٦٤٧) ساڵی (٢٠٠٩)

**نۆرەی چاپ:** یەكەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٩

**نەخشەسازیی بەرگو ناوەوە:** فاضل قەرەداغی

**لە بڵاوكراوەكانی:** پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٥٣)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆری ئینتەرنێت:** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:**
info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

## ناوەرۆك

# پێشەکی
## ئەم وەڵامە پێویستە؟

پێداچوونەوەی کارو فیکری ئیسلامی، هەروەها کەلتووری ئیسلامی لەڕووی فیکرو مومارەسەوە، پرۆژەیەکی پێویستە، لەوەش پێویستتر پێداچوونەوەکە کەسانێك بیکەن سەر بەو تەوژمە بن چونکە ئەوان لەناو ماڵەکەدان‌و دەزانن چی لەپشت دەرگاوە هەیە، مەبەستی ئەوانیش، کە بنیاتنانە نەك تەشهیرکردن‌و دۆزینەوەی عەیب، دەچێتە پاڵ ئەو توانایە، بێگومان هەموو ئەمە ئەگەر توێژەرەوەی ئیسلامی بەئینساف بێت بەتایبەت بەرامبەر بەو ئیسلامییانەی ترکە هاوفیکر یان هاوئینتیمای حزبیی ئەو نین.

لەبەردەم پرۆژەیەکی گرنگی وەك پێداچوونەوە کارو فیکری ئیسلامیشدا کارێکی وەك وەڵامدانەوەی ئەو نووسینانەی ڕەخنەی نابەجێ لە ڕەوتی ئیسلامی دەگرن دەبێتە کارێکی لاوەکی، بەڵام وەك چۆن لە ئابووریدا یاسایەك یان دیاردەیەك هەیە دەڵێت دراوی خراپ دراوی باش لە بازاڕ دەردەکات، وەهاش ئەو ڕەخنە نابەجێیانە بەش بەحاڵی خۆیان ڕیگر دەبن لەبەردەم پرۆژەی جیددی.

کتێبەکەی میسری (بیری ئوسووڵیی ئیسلامی، خوێندنەوەیەکی سوسیۆلۆژی ڕەخنەیی) [1] نموونەیەکە لە سەدان نووسینی لەو جۆرە، لەبەر ئەوەش کە لە وڵاتێکی وەکو کوردستان کەسانێکی وەکو میسری پەیدا دەبن سوود لە نەشارەزایی خوێنەران وەردەگرن‌و نووسینی پڕ لە هەڵەو پڕ لە خیانەت لە ئەمانەتی زانستی، پڕیش لە نەزانی‌و تێنەگەیشتن لەو شتانەی

---

[1] چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣، بە یارمەتیی وەزارەتی ڕۆشنبیری (سلێمانی) لەچاپدراوە، چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٥.

باسیان دەکەن، بڵاودەکەنەوەو بەهۆی ئەو نەشارەزاییەی خوێنەرەوە دەبنە پسپۆڕ بۆیە بەر لە ئەنجامدانی ڕەخنەیەکی جیددی لە ڕەوتی ئیسلامی، یان بەلای کەمەوە لەهەمان کاتدا، بێگومان لەسەر دەستی کەسانی ئەو تەوژمە، ئاشکراکردنی فەزاحەتەکانی ئەو جۆرە نووسینانە پێویست دەبێت.

کتێبەکەی میسری بەرهەمێکی ڕەخنەیی نییە بەڵکو لیستێکی تاوانبارکردنە (لائحة اتهام)، بەڵام هێندە بەنەشارەزایی ئامادەکراوە ناچاری کردین لە هەندێك شوێندا گاڵتەجاڕی بەکاربهێنین، کەسێکیش گاڵتە بە عەقڵی خوێنەر دەکاتو دەیەوێت خۆی وەکو شارەزاو پسپۆڕ پیشانی ئەو خوێنەرە بدات ئەوەی شایەنە.

ئەم کتێبەمان دوو کاری سەرەکیی گرتۆتە خۆ:

یەکەم: ئاشکراکردنی ئەو خیانەتەی لە ئەمانەتی زانستی کراوە کە پڕی کتێبەکەی میسرییە.

دووەم: ئاشکراکردنی تێگەیشتنی هەڵەو وەرگێڕانی هەڵەو هەڵگێڕانەوەی ڕاستییەکانو هەڵبژاردنی زانیارییەکانو نەشارەزایی لە زانستە ئیسلامییەکانو لە مێژوو.. تاد کە دیسان پڕی کتێبەکەن.

هەموو کتێبەکەی میسریشمان نەخستۆتە بەر نەشتەرگەریی ڕەخنە بەڵام هێشتا ئەم کتێبەمان بەم قەبارەیە دەرچووە، ئەی ئەگەر ڕەخنەکە پەڕە بەپەڕەو دێڕ بەدێڕ بوایە؟ لەڕاستیشدا لەکاتی کارکردن لە کتێبێکی وادا مرۆڤ دەگاتە قۆناغێك کە پێویستە تا زووە دەست لەو کتێبە هەڵبگرێت چونکە ڕەخنەکان هێندە کەڵەکە دەبن کتێبەکە بەرەو قەبارەیەك دەبەن لە ئەندازەی مەعقوول دەردەچێت. من دەستم لە ڕەخنەی زۆر هەڵگرت.. کەواتە زۆرم بۆ ڕەخنەگری تر جێهێشتووە.

## بەشی یەکەم

# مەنهەج و مەبەستی کتێبەکە

دەتوانین لەمیانەی باس لە پێشەکیی چاپی یەکەم و پێشەکیی چاپی دووەمی کتێبەکەی میسری باس لە مەبەستی میسری لە نووسینەوە ئەو کتێبە، هەروەها باس لەو مەنهەجەی پەیڕەویی کردووە بۆ نووسینەوە، بکەین. بەدرێژایی کتێبەکەش ئەو مەبەستو ئەو مەنهەجە دەبینین و لەم خاڵانەی خوارەوە کورت دەبنەوە:

مەنهەجەکەی میسری، کە مەنهەجی چەندین کەسانی تریشە، دوو کاری سەرەکیی لەخۆ گرتووە: یەکەمیان نەپاراستنی ئەمانەتی زانستییە بەو واتایەی کە ژمارەیەکی زۆری سەرچاوە ڕیز دەکات تا قورسایی بە کتێبەکەی بدات لەکاتێکدا ئەو تەنها بەشێکی کەمی ئەو کتێبانەی بینیوە، ناو و ناواخنی بەشە زۆرەکەی سەرچاوەکانیشی لەو بەشە کەمە ((بردووە)). دووەم کاری سەرەکیی مەنهەجی میسری و هاوشێوەکانی بریتییە لەو گیان و عەقڵیەتەی ئەو کتێبەی پێ نووسراوەتەوە. لەخوارەوەشدا وردکارییەکانی ئەو مەنهەجییەتە دەخەمەڕوو ئەگەرچیش بەکورتی بێت:

### یەکەم: ((بردن))و نەپاراستنی ئەمانەتی نووسین

نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی لەو کتێبەدا بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١-زۆربەی کات موناقەشەکە هی نووسەری ترە بەڵام ئەو دەیکات بەهی خۆی گوایە خۆی پرسیار دەکات و موناقەشەی شتەکان دەکات و بەدوایاندا

دەچێت، کاتێکیش خۆی خاوەنی ڕاستەقینەی موناقەشەکە بێت دەبینین جار وایە شتەکان بە هەڵە تێدەگاتو زۆر جار موناقەشەی سادە دەکات، جاریش هەیە بە سادەییەکەی دەتخاتە پێکەنین.

٢–وەکو زۆر نووسەری لای خۆمان ئەو کارە دەکات کە لەبەر پاراستنی ئەدەبی گفتوگۆ ناوم ناوە ((بردن)). ئەو نووسەرانە لەبەر بێبەهرەییو تەمبەڵیو حەزکردن بە زووگەیشتن بە ئامانج، دەستکەوی ماددیش بچێتە پاڵ ئەوانەوە، دەستکەوتنی ناوبانگیش پێش هەموو ئەوانە.. دەڵێم ئەو نووسەرانە بۆ ئەو مەبەستانە ڕێگە کورتە ئاسانەکە دەگرنەبەر کە دزینی سەرچاوەیە، ئێستاش بەدوورودرێژی لەسەری دەڕۆم:

بەرلەهەموو شتێك با ئەو ڕاستییە بزانین کە ژمارەی زۆری سەرچاوەی بەکارهێنراو بۆ نووسینی لێکۆڵینەوە نیشانەی بەهێزیی ئەو لێکۆڵینەوەیە نییە. گریمان نووسەرەکە بەڕاستی ئەو هەموو سەرچاوەیەی بەکارهێنابێتو گریمان هەر هەموویان سەرچاوەی سەرەکیی بابەتەکەنو شتی لاوەکیی کەمیان تێدایەو گریمان شتە دووبارەکراوەکانیان کەمن بەڵام هێشتا لەوە گرنگتر دەمێنێتەوە ئەویش عەقڵی ئەو نووسەرە؛ پێویستە نووسەرەکە توانایەکی فیکریی وای هەبێت زانیارییەکان پێکەوە گرێبداتو بگاتە ئەنجامی تایبەتی خۆی نەك ئیشەکەی تەنها کۆکردنەوە زانیارییەکان بێت. باشە ئەی ئەگەر ئەو نووسەرە نەك تەنها عەقڵێکی چالاکی نییە بەڵکو بەشێکی ئەو سەرچاوانەی ناویان دەبات ئەو مەرجانەی سەرەوەیان تێدا نەبێت؟ با بزانین نووسەرە بێبەهرەکانمان، کە لەهەموو جیهاندا وێنەیان هەیە، چی دەکەن:

ئەوانە چەند سەرچاوەیەك دەهێننو زانیارییەکانیان نەقڵ دەکەن بەڵام ئەوان دەزانن کە کتێبەکەی خۆیان ئەو بەهێزە نییە لەبەرچاوی خوێنەر

چونکە ناوی چەند سەرچاوەیەکی کەمی تێدایە، چارەسەرەکەش زیادکرینی ژمارەی سەرچاوەکانە. هەر ئەو زیادکردنە بۆ خۆی سوودی نییە ئەگەر زۆری سەرچاوەکان لاوەکی بن یان ئەو زانیارییانەی لێیان وەرگیراون زانراون یان سادەن، یان کتێبەکە بەشێوەیەکی لاوەکی باسی ئەو زانیارییەی کردبێت، یان هەمان زانیاری لەو سەرچاوانە دووبارە دەبنەوە. بەکارهێنانی ئەو جۆرە سەرچاوانە لێکۆڵینەوەکە بەهێز ناکات، ئەی ئەگەر نووسەرەکە ئەسڵەن سەرچاوەکانی نەبینیبێت؟

زۆر لە نووسەرەکانمان ئەم کارەی تر دەکەن: نووسەرەکەمان سوود، بۆ نموونە، لە پێنج سەرچاوە وەردەگرێت بەڵام نایەوێت ناوی تەنها ئەو پێنجە بەرێت بۆیە کاتێك زانیارییەکان نەقڵ دەکات هەموو جارێك نالێت: بڕوانە کتێبی (س)، بەڵکو دەچێت ناوی ئەو کتێبە دەنووسێت کە کتێبی (س) بۆ ئەو زانیارییە ئاماژەی بۆ کردووە، بەم جۆرە ژمارەی سەرچاوەکانی دەبێتە شەش؛ پێنجیانی بینیوەو بەکارهێناوەو شەشەمیانی دزیوە، ئینجا بەردەوام دەبێت تا لێکۆڵینەوەکەی خۆی پڕ دەکات لە ناوی سەرچاوەو ئەو پێنج کتێبە دەکاتە سەد کتێب. پاش ئەوەش خوێنەری ڕواڵەتخوێن بەو کاری جەردەییە دەڵێت: ((کتێبەکە بە دەیان سەرچاوە دەوڵەمەند کراوە)).

ڕەخنەگرتنو ئاشکراکردنی ئەو دزییانە کارێکی گران نییەو پێویستی بە دوو شتە: دەستکەوتنی ئەو سەرچاوانەی کە نووسەر ناویهێناون لەگەڵ تاقەتێکی باش. بۆیەش ئەو کارە زەحمەت نییە چونکە کەسێك لێکۆڵینەوە بەو شێوەیە بنووسێت نووسینەکەی پڕ لە خاڵی لاواز دەبێتو لەدوای خۆیدا شوێنەواری دزییەکە جێدەهێڵێت. ئەو کە بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ سەرچاوەدا دەکات (تەنها پێنج یان دە سەرچاوە دەخوێنێتەوەو دەیانکاتە

سەدو دوو سەد) نابێتە شارەزا لەو بوارەی لەبارەیەوە دەنووسێت بۆیە نەك تەنها بەئاسانی هەڵەی سەرچاوەکانی بەسەریدا تێدەپەڕێت بەڵکو هەڵەی منداڵانەش دەکاتو ڕەخنەگر درەفەتی زۆری لەبەردەمدا دەبێت بۆ ئەوەی پێبکەنێتو خوێنەر بخاتە پێکەنین.

لەگەڵ ئەو هەموو جەردەییەی نووسەران پێویستە ڕەخنە بەپێی مەنهەجییەتێکی زانستی بێتو بەحەزەرەوە ئاماژە بۆ زانیارییەکانو سەرچاوەکان وەکو زانیاریو سەرچاوەی دزراو بکرێت، ئەوەش زیاتر لە بەرهەمی ئەدەبیی وەك شیعرو چیرۆك کە ئیحتیمال زۆرە نووسەر شتێك بڵێت کە بەڕاستی خۆی خاوەنی بێت بەڵام ئەو شتە پێشتر وتراوە. بێگومان هێشتا زۆر بۆ دزیی ئەدەبی دەمێنێتەوە. ئەوەی لە بازاڕی ئەدەبیی کوردیشدا بینیومانە نموونەی دزیی زەقی تێدایە، هەرچەندە هەندێ جار کە باس لە دزیی ئەدەبی دەکرێت بەڵگەکان لاوازن یان هەر هەڵەن.

ئاشکراکردنی دزیی ئەدەبی لە لێکۆڵینەوە ئاسانترە چونکە ناکرێت زانیارییەکانو ئەنجامەکانو ناوی سەرچاوەکان بەو ئەندازەیە لەیەك بچن، بەڵام دیسانەوە دەڵێم کە لێرەشدا حەزەرکردن هەر پێویستە.

ئەگەر باسی میسرییەکەی کوردستانو کتێبەکەی بکەم پێویستە بڵێم کە ئەوە کتێب نییە بەڵکو جەواڵە؛ جەواڵێکە کەلوپەلیماڵی خەڵکی تێدایە. میسری دەیان سەرچاوە ڕیز دەکات گوایە بەکاریهێناون، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو سەرچاوانەی بەڕاستی بینیونیو بەکاریهێناون زۆر لەوە کەمترن. بۆ خۆم بەشێکم لەو کتێبانەم لایە کە ناویان لەو کتێبەی میسریدا هاتووە، بۆیە کارەکەم لەو ئاستەدا دەوەستێتو کارکردن لەسەر ئەو کتێبانەی دەستم نەکەوتوون جێدەهێڵم بۆ ڕەخنەگرانی تر. کتێبەکەی میسری لەو

جۆرەیە کە ناوم ناوە ((بەهەشتی ڕەخنەگران)).

((بردن)) لای میسری بە ((بردن))ی زانیاریو ناوی سەرچاوە ناوەستێت بەڵکو ئەو تەنانەت بەهەمان تەرتیب زانیارییەکان ((دەبات))، واتەو وەك نموونە نووسەری کتێبی (س) زانیاریی (أ) دەنووسێت، پاشان زانیاریی (ب) ئینجا (ج)، دوایی (د). میسریش، کە تەنها زانیاریی (أ)ی لە کتێبی (س) وەرگرتووە، بە ((بردنی))ی زانیارییەکان (ب)و (ج)و (د)و بە کردنی ئەو کتێبانەی ئەو زانیارییانەیان وتووەو ناوەکانیان لە کتێبی (أ)دا هاتوون بە حەلاڵی خۆی ناوەستێت بەڵکو بەهەمان تەرتیب ئەو زانیارییانە ڕیز دەکات، دەشبینین لە چەندین شوێنی کتێبەکەیدا بە یەك جار چەند لاپەڕەیەك ((دەبات))و بەهەمان تەرتیب ڕیزیان دەکات.

## دووەم: گیانو عەقڵیەتی پشت ئەو جۆرە نووسینانە

کتێبەکەی میسری نموونەیەکە لەسەر جۆرێکی نووسینی باو. ئەمانەی خوارەوە تایبەتیی دیاری ئەو جۆرە نووسینانەن:

یەکەم: ئەو جۆرە نووسینانە بە گیانی ڕیشەکێشکردن لەگەڵ نەیاردا دەجووڵێنەوە. ئەوانە جیاوازی لەنێوان باڵەکانی ڕەوتی ئیسلامی ناکەنو لای ئەوان ئەوانەی کە بە خۆیان دەڵێن ((میانڕەو)) وەکو پەڕگیرەکان پەڕگیرنو توندڕەونو پێویستە هەر دوو جۆر ڕیشەکێش بکرێن. ئەو ڕەوتی ڕیشەکێشکردنەش لەهەموو جیهاندا هەیە.

دووەم: ئەوانە دژ بە ڕەوتی تەکفیر قسە دەکەن بەڵام هەر خۆیان جۆرە تەکفیرێکی عەلمانی پیادە دەکەن.

سێیەم: ڕەخنەیەکی ئەوانە لە ڕەوتە ئاینییەکان ئەوەیە ڕەوتی ئاینی

بەناوی حەقیقەتەوە قسە دەکات، ئاگاشیان لەوە نییە کە خۆشیان هەروەها بەناوی ئەو حەقیقەتەوە قسە دەکەن.

چوارەم: ئەوانە ناڕێکیی زۆر لەخۆیاندا کۆدەکەنەوە، ڕەخنەش لە بەرامبەر دەگرنو نازانن ئەگەر ناوی کەسەکانو گرووپەکان لەو ڕەخنەیە لابرێن دەبێتە ڕەخنەیەکی گشتی کە خۆشیان دەگرێتەوە.

پێنجەم: ڕەفتارێکی تایبەت بە کوردستان بریتییە لە تۆمەتی خزمەتکردنی عەرەبو ناوزڕاندنی ئیسلامییەکانی کوردستان بەو تۆمەتە کە ڕێگەیەکی ئاسانە بۆ خۆدزینەوە لە وتووێژێکی جیددی.[1]

شەشەم: هەندێ جاریش لەبەرئەوەی مەبەستی سەرەکی دژایەتیکردنو ناوزڕاندنە مەسەلەکان تێکەڵ دەکرێن، ئەویش چونکە ((ڕەخنەگر)) چیی دەکەوێتە بەردەست دەیهێنێتو بەکاریدەهێنێت با ئەو شتە لەگەڵ ڕەوتی موناقەشەکەشدا نەگونجێت.

---

[1] لە کوردستاندا بۆتە باو ئەوانەی پەیوەندییان بە بەعسەوە هەبووە گەورەترین لافی کوردایەتی لێبدەن، گەورەترین موزایەدەی کوردایەتیش بکەن، بەتایبەتیش کاتێك هێرش دەکەنە سەر ئیسلامییەکان. نموونەش زۆرن لەسەر ئەو کۆنە بەعسییانەی پاش ڕاپەڕین ڕەنگی پێستی خۆیان گۆڕیوە. بەشێکی ئەوانە بۆ ڕازیکردنی دەسەڵات، کە ئیسلامییەکان بە موونافسی خۆی دەزانێتو بۆ ئەوەی بە حسابی خۆیان ڕابوردووی خۆیان پاکبکەنەوە هێرش دەکەنە سەر ئیسلامییەکان گوایە کوردایەتی ناکەن، بەڵکو دژی کوردایەتیشن. میسری ئەندامێکی کۆنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو بەڵام زوو تەسلیم بە ڕژێم ببوو، بڕوانە یادداشتەکانی (ئاوات قارەمانی) بەناوی (ڕێگا باریکەکان، ڕووداوەکانی ١٩٦٣-١٩٩٩، چاپی دووەم، خانەی ڕەهەند، ٢٠٠٩، ل٣٢-٣٣). بابەتێکی (جەمال حەسەن کەریم)یش بەناوونیشانی (نەبەز گۆرانو فۆاد مەجید میسری) لە ١٠-٣-٢٠٠٧ نووسراوەو لە ٤-٤-٢٠٠٧ لە سایتی کوردستان نێت بڵاوکراوەتەوەو باسێکی دووردورێژترە لەبارەی ڕابوردووی میسری.

حەوتەم: زۆر پەنا بۆ موبالغە دەبەن بەتایبەتیش لە پێشکەشکردنی وێنەیەکی ناشیرین بۆ ئیسلامییەکان.

هەشتەم: قسەی زۆری بێبەڵگەش دەوترێن.

نۆیەم: هەڵبژاردنڕەوی (انتقائیە)، واتە ئەو کەسە بەپێی بەرژەوەندی شت هەڵدەبژێرێت‌و شت پشتگوێ دەخات.

دەیەم: زۆر لەو کەسانە دەبینین ناتوانن لە مەسەلەکان قووڵ ببنەوەو گیانی (سطحیة) بەسەریاندا زاڵە.

یانزەیەم: زۆریشیان بێئەوەی لە مەسەلەکان شارەزا بن قسەیان لەسەر دەکەن.

سیانزەیەم: میسری، هەروەکو زۆری تری وەکو ئەو، لە چەندین شوێندا لەو دەقە تێناگات کە نەقڵی کردووە.

جگە لەوانەی سەرەوە میسری ئەم کتێبەو کتێبەکەی پێش ئەو، واتە (کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)، بۆ دەستکەوتی ماددی نووسیوە، کورتترین ڕێگەش ڕێگەی دەسەڵاتە، لەحاڵەتی ئێستاشماندا هێرشکردنە سەر دیاردەی ((ئیسلامی سیاسی))، هەندێ جاریش کردنی ئیسلام بە نیشانەی تیربارانەکە ڕێگەیەکی کورتی ترە. بێگومان پێویستە هەموو ڕێگەکان کورت بن، بۆیە تەنها نووسینەوەی کتێبەکە دەمێنێتەوە، ئەویش ئاسانەو نووسەر ئەوەندەی بەسە ڕەچەتەکەی سەرەوە بەکاربهێنێت. هەوڵی میسریش بێبەرهەم نەبوو و دەزگای چاپو پەخشی (حەمدی)ی بۆ دامەزرێنراو چووە پاڵ دەزگا سستەکانی تر، هەقیشە وابێت چونکە بەردی بناغەی ئەو جۆرە دەزگایانە خۆبەخێو کردنە، بەهەرحاڵیش شەڕی بچووك لە بەتاڵیی گەورە

باشترە.[٢]

هەڵبەت ئەوانەی سەرەوە شێوازی بیرکردنەوەی تەنها عەلمانییەکان نییە (مەبەستم لە عەلمانییە پەڕگیرەکان نەك هەموو عەلمانییەکان) بەڵکو ئیسلامییەکان کەم تا زۆر ئەو عەیبانەیان تێدایە مەگەر کەسێك بزانێت قسەکردن بەئینسافەوە نیشانەیەکی پابەندبوونە بە ئاین، پاشان بەپێی ئەو زانینە ڕەفتار بکات‌و ئەو هەڵانە دووبارە نەکاتەوە. ئیسلامییەکانیش هێندەی عەلمانییەکان گیریان خواردووە بەدەست ئەو کەسە بێئینسافانەی ناو ڕەوتی ئیسلامی کە زۆر جار چەکی ڕەخنەی کوێرانەو عەیب دۆزینەوە بەڕووی ئیسلامییەکانی تر هەڵدەگرن، هەروەك چۆن عەلمانییەکان گیریان بەدەست عەلمانییە پەڕگیرەکان خواردووە.

لەخوارەوەدا دوورودرێژتر باس لەو بەشەی مەنهەجییەتەی میسری دەکەم ئەویش ئەوەی پەیوەندیی بە مەبەست‌و گیان‌و عەقڵیەتی نووسینەکەییەوە هەیە، سەبارەت بە نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی‌و کاری ((بردن))یش ئەوە لە ناواخنی ئەم کتێبەماندا باس دەکرێت.

## ریشەکێشکردن

مەبەست لە ڕیشەکێشکردن ئەوەیە خاوەنی ئەو ڕەوتە هەبوونی بەرامبەرەکەی قبووڵ ناکات‌و داوای نەمانی دەکات، لەو ڕووەش کە باس لە

---

[2] میسری دەنووسێت کە بەرپەرچدانەوەی ئەو میتۆدە فیکرییەی تیرۆر بەرهەمدەهێنێت دەچێتە خانەی ئەمنی قەومی‌و پێویستە لێکۆڵینەوەی زانستیی بۆ بکرێ تا دەگاتە تەرخانکردنی دەزگاو سەنتەری تایبەت(ل٨). ئەمە گاڵتەجاڕییە: ((لێکۆڵینەوە))کەی میسری کام جۆرەیە؟ میسری پاش ئەو کتێبە گەیشت بە ئاواتی خۆی‌و دەزگایەکی بۆ دانرا بەڵام بەرهەمی ئەو دەزگایە چی بووە جگەلە بەخێوکردنی خاوەنەکەی؟ ئەو دەزگایە نەك تەنها نەیتوانیوە زانستی بێت بەڵکو خۆشی تەرخان نەکردووە بۆ دیاردەکە.

ئیسلامییەکان دەکرێت ڕیشەکێشکردن بریتییە لە ئامادەنەبوون بۆ حیوار یان بەشداریکردن لە دەسەڵاتو چارەسەری ڕەوتی ئیسلامی قەدەغەکردنی چالاکیو ڕاونانو گرتنو لەناوبردنە. تایبەتمەندییەکی ڕەوتی ڕیشەکێشکردن ئەوەیە جیاناکاتەوە لەنێوان میانڕەوو پەڕگیر، ئەوەش چاوەڕێکراوە چونکە ڕەوتی ڕیشەکێشکردن لە حاڵەتێکی عەقڵیو ئەخلاقیی ئاساییدا ناژی بۆیە ئەو ڕەوتە ناتوانێت ئەوە بە مێشکی خۆیدا بهێنێت کە دەکرێت ڕۆژێك لە ڕۆژان دەستی هاوڕێتی بۆ بەشێکی ئەو ڕەوتە ڕابکێشرێت.

ریشەکێشکردن لەناو ڕەوتی ئیسلامیشدا هەیەو خاوەنەکانی ئەو بیرکردنەوەیە جیاناکەنەوە لەنێوان عەلمانییەکی میانڕەوو پەڕگیر، لەنێوان عەلمانییەك ئامادەی حیوارەو عەلمانییەك تاکە چارەسەر لای ئەو بەندیخانەو پەتی قەنارەیە، لەنێوان عەلمانییەك ڕێز لە ئاین دەگرێتو عەلمانییەك داوای نەمانی ئاین دەکات.

ئەو چاوەی بەردەمەکەی ڕەشهەڵگەڕاو دەبینێت بەخۆی نازانێت کە چاوێکی نەخۆشە، ئەو نەزانییەش بۆیە هەیە چونکە خۆی بە خاوەنی ڕاستی دەزانێت، واش دەزانێت ڕاستی یەك ڕاستییەو بەش ناکرێت، ناشکرێت لە بەشێك لە بۆچوونەکانی هەڵە بێت.. ئەو ئەسڵەن بیرکردنەوەی خۆی بە بۆچوون نازانێت.. بیرکردنەوەی خۆی ئەو ڕاستییەیە کە پێویستە هەموو ئەوانی تر ملکەچی بن. بەکورتی تێکەڵکردنی ئەوەی بەشێکی جەوهەرییە لە ئاین بەوەی ئاین نییەو زانینی هەمووی بە ئاین، ئیتر ئاسمانی بێت یان عەلمانی.

ئەوانەی خوارەوە هەڵبژاردەیەکن لە دەرکەوتەکانی نەخۆشیی ڕیشەکێشکردن لای میسری، بەهۆی ئەو نەخۆشییەشەوە دەیسەلمێنێت کە

کەسی شیاو نییە بۆ قسەکردن لەسەر دیاردەی ئیسلامی، وەك باسیشم کرد دواتر دەزانین کە بەپاڵ تێڕوانینی پڕ لە نەخۆشیی کینە ئەمانەتی زانستیشی نەپاراستووە، هەروەها بە نەشارەزایی قسەی کردووەو زانیارییەکانی پڕ هەڵەن، بۆیە زیاتر دەیسەلمێنێت کە ئەو کەسە شیاوە نییە بۆ قسە کردن لە ڕەوتی ئیسلامی.

کتێبەکەی میسری ئاسۆیەکی داخراوی هەیەو بەیەك چاو تەماشای ئوسوولیيەتی ئیسلامی دەکات: یەکەم: وەکو کێشەیەك دووەم وەکو کێشەیەك پێویستی بە ڕیشەکێشکردن هەیە. ئەم ڕەوتی ڕیشەکێشکردنەش لەناو جیهانی ئیسلامیدا هەیە بەڵام بەتایبەتی لەناو جیهانی عەرەبیدا (رەنگە ئەمە سەیر بێت بەڵام ڕاستیشە)و تەعبیر لە بۆچوونی حکومەتەکانی جیهانی ئیسلام (بەتایبەتی عەرەبی)، یان لە باشترین حاڵەتدا بۆچوونی باڵێکی ناو ئەو حکومەتانە، دەکات. باشترین حاڵەتیش بریتییە لە هەوڵی حکومەت بۆ سنووردانان بۆ ئەو ڕەوتە چونکە ڕیشەکێشکردن دەست نادات.

کتێبێکیش بەو گیانە نووسرابێتەوە (ڕاستتر کۆکرابێتەوە) وێنەیەکی دروستمان ناداتێ هەروەك ئەو کتێبانەی تەنها بە شانوباڵی ڕەوتی ئیسلامی هەڵدەدەنو باس لە هەڵەکانی ناکەن.

میسری جیاناکاتەوە لەنێوان دوو وتاری میانڕەو پەرگیرو جیاوازییەکان لای ئەو یەك خاڵی ڕووکەشییە ئەویش کاتی بەرکارهێنانی توندوتیژییە کە ئەوانەی گوایە میانڕەون دەڵێن هێشتا کاتی توندوتیژی نەهاتووە(ل٥) ئەوەش یەکێکە لە پێکهاتەکان ڕەوتی ڕیشەکێشکردن کە پاساوێك لەوجۆرە بۆ لەناوبردنی ئیسلامییەکان دەهێنێتەوە کە هەمان پاساوی ڕیشەکێشکرنی ئیسلامییە کە عەلمانییەکان بەیەك چاو تەماشا دەکات.

میسری رەخنەش لە دەسەڵاتی کوردی دەگرێت کە دەرفەتی بۆ ئیسلامییەکان ڕەخساندووە ((لەکاتێکدا هیچ دەسەڵاتێکی عەلمانی ڕێگا بە پێکهێنان‌و دامەزراندنی حزبی ئایینی نادا)) ل٩.

ئەوانەی باوەڕیان بە ڕیشەکێشی هەیە نازانن کە لەوە ئەهوەنتر هەیە ئەویش بێبەشکردنە کە بەشێکی گەورەی گوناهی دروستکردنی توندوتیژی لە جیهاندا هەڵدەگرێت. بێبەشکردن دەروازەی ناڕەزاییە، ئەو ناڕەزاییەی یەکێکە لە ڕێگەکان بۆ توندوتیژی.

## تەکفیری عەلمانی

تەکفیر هەر تەکفیری ئاینی نییە بەڵکو جۆرێکی دیکەی هەیە، ئەگەر چی بەشێوە لەو ناچێت، ئەویش تەکفیری عەلمانی. نموونەیەکی ئەو تەکفیرە قسەکەی میسرییە کە لەناو کەسانی عەلمانیی عەرەب باوەو دیارە لەوانی وەرگرتووە. ئەو هانی دەسەڵاتی کوردی دەدات بۆ ڕیشەکێشکردنی ئیسلامییەکان‌و حوکمێکی تەکفیرییان بۆ دەردەکات: ((تێکڕای ئیسلامی سیاسی دژ بە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و سیستەمی دیموکراسی‌و کۆمەڵگەی سیڤلن)) ل٨. ئەوەش بچێتە ئەولاوە کە ئەو دەسەڵاتە، هەروەها دەسەڵاتەکانی وڵاتە عەرەبییەکان، چەند پابەندی دیموکراسین‌و چەند بۆ پێشکەوتن قازانج یان زیانیان هەیە.

## دژی قۆرخکردنی حەقیقەت.. بەناوی حەقیقەتەوە

میسری‌و هاوشێوەکانی ڕەخنە لە ئوسووڵییەتی ئیسلامی دەگرن کە حەقیقەتەکانی ئاین بە ڕەها دەزانن بەڵام بێئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت شتەکانی خۆیان وەکو حەقیقەت باس دەکەن. ئەوە لە سەرجەم بیرکردنەوەو قسەکردنیاندا هەیە، یەکەم حەقیقەتیش کە باوەڕیان پێیەتی

ئەوەی بەرامبەر، زیاتر بەرامبەری ئیسلامی، هەڵەیەو ئەوان ڕاستن. زۆریش لە بۆچوونەکانیان وەکو ڕاستی دەخەنە ڕوو، بێگومان لەبیریشان ناچێت جاروبار بڵێن کە ئەوەی دەیڵێن تەنها بۆچوونە. چەند نموونەیەك لە کتێبەکەی میسریدا هەن کە چۆن ئەو باوەڕە بە حەقیقەت لە هەندێ هەڵوێستدا بەرجەستە دەبێت:

میسری دەڵێت مرۆڤی تیرۆریست ئامادە نییە گوێ لە ڕای بەرامبەرەکەی بگرێ (ل٧) یەکسەریش دوای ئەوە دەڵێت: ئامادە نییە حەقیقەتەکان بسەلمێنێ.. بەڵام کام حەقیقەت؟ ئەوەی میسری ڕاستییەو دەبێت مرۆڤ باوەڕی پێ بهێنێت بەڵام ئەوەی ئەو مرۆڤە بە حەقیقەتی دەزانێ جێگەی ڕەخنەیەو باوەڕهێنانیش پێی جێگەی ڕەخنەیە.

میسری سڵ لە وشەی (حەقیقەت) ناکاتەوە، بۆ نموونە باس لە چاکسازیی ئاینی لەسەدەی نۆزدەیەمو گوایە جەمالوددینی ئەفغانی ((لەهەموو کەس زیاتر)) باوەڕی بە تیرۆر هەبووە.. ئینجا ئەو ((حەقیقەتە مێژوویانە))، کە تەنها دوو نموونەی لێ هێناوەتەوە، دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی جیاوازی لەنێوان میانڕەو توندڕەو جیاوازییەکی مەنهەجی نییە (ل٧).

## فرێدانی قسەی بێسەروبن

قسەی بێسەروبن لەو کتێبەکەدا وەکو شارا هەڵدراوەتـەوە، لەخوارەوەشداو لەم بەشە لاوەکییەدا تەنها دوو نموونە دەخەینە ڕوو، باقی نموونەکان لە ناواخنی باسەکانی ئەم کتێبەماندا هەن:

١–باسی مامۆستای قوتابخانە دەکات کە بەپێی ئاین نەك بەپێی زانست وانەکەی باس دەکات گوایە لەجیاتی ئەوەی پێیان بڵێت هەورە بروسکە

شەپۆلێکی کارەبابییە دەڵێت فریشتەیەکەو لە ئاسماندا قامچی دەوەشێنێت(ل٦) بەردەوامیش دەبێتو دەڵێت: دەستەدەستە قوتابیی سەرەتاییو منداڵانی گەڕەك بۆ گۆڕستان دەباتو بە سزای قەبرو قیامەت دەیانتۆقێنێ(ل٦) گوایە ئەم کارەش مرۆڤێك بەرهەمدەهێنێت ئامادەیە لەپێناوی سەرخستنی بیروباوەڕەکەی توندوتیژی بەڕەوا بزانێتو بەکردەوەش بیکات(ل٦).

نەمازانیوە لەکوێی ئەم سەرزەوییە مامۆستای قوتابخانە دەڵێت هەورە بروسکە قامچیی فریشتەکانە، دەشبێت بڵێین ئەم قسەیە لەکام گیرفان هێنراوەتە دەرەوە. نەك تەنها مامۆستای قوتابخانە وا دەڵێت بەڵکو ئایینیش وا باسی هەورەبروسکە ناکات. بردنی منداڵانیش بۆ گۆڕستان ئەگەر هەبێت لە سنوورێکی تەسکدا هەیەو بەش بە حاڵی خۆم نە لە کوردستانو نە لە دەرەوەی کوردستان شتی وام نەبیستووە، قسەکەی دواتریش لە هەمووی تورڕەهاترە چونکە پەروەردەی بیرخستنەوە گۆڕو قیامەت مرۆڤ فێری زوهدو دوورکەوتن لە هەڵپەی ژیان دەکات، بەڵکو لە توندوتیژیش دووریدەخاتەوە. شتێکی زانراویشە کە لە مێژووی ئیسلامدا زۆر لە زاهیدەکانو موتەسەووفەکان ڕۆچووبوون لە یادی مردنو قیامەت تا وایان لێ هات هەموو جۆرە کۆششێکیان بە زیادەو زیانبەخش دەزانیو ئەوانە کەمترین بەشدارییان لە جیهاد دەکرد.

٢ –گوایە ئوسووڵییەت ڕێگە لە هەر هەوڵێکی نوێ دەگرێت بنەماکانی شەریعەت لەگەڵ واقیعی نوێدا بگونجێنێت(ل٢٠) لەکاتێکدا ئەم گونجاندنە یەکێکە لە کارەکانی ئوسووڵییەت بەڵام بەو مەرجەی حەرامکردنی حەڵاڵو حەلاڵکردنی حەرامی تێدا نەبێت.

میسریش کە دڵی بەو تاوانە خۆش بوو و پێش ئەوەی ساغیبکاتەوە دەچێتە ئەنجامێك کە ئەم دژایەتیکردنەی گونجاندن بۆ ئەوەیە وزەی عەقڵ ئیفلیج بکاتو بۆ ئەوەی ئەفسانەو سیحرو خورافە بێنێتەوە مەیدان(ل٢٠–٢١) بێئەوەی ئەو میسرییە بزانێت کە نەك تەنها ئوسوولێیەت بەڵکو فەقیهەکانی زەمانی زووش چۆن دەیانڕوانییە ئەفسانەو جادوو (کە لای هەندێك مەزهەب سزای جادووگەر کوشتنە)و خورافە. میسری کە بە زمانی دەیان ساڵی پێش ئێستا قسە دەکاتو تەنانەت ناشزانێت کە پێش دوو لاپەڕە باسی هەڵوێستی ئوسوولێیەت لە شارستانیی ڕۆژئاوا کردووەوکە ئەو شتانەی پەیوەندییان بە بەرهەمهێنانی سامانی ماددییەوە هەیە پەسەندیان دەکات(ل١٩) کەچی لێرەدا دەڵێت ئەو ئوسوولێیەتە دەیەوێت مرۆڤی سەردەم کۆیلە بکاتو نەتوانێت سوود لەو هەموو دەستکەوتانەی مرۆڤایەتی وەربگرێت (ل٢١)... زانیمان سەرچاوەی ئەو ناڕێکییە چییە.

بەئاسانیش لەوێوە ئەنجامێکی تری دەستدەکەوێت ئەویش کە سەیرنییە ئوسوولێیەت ئەدەبییاتێك بەرهەم بهێنێت دەقاودەق لەگەڵ میتۆدەکەیدا بگونجێتو باس لە کتێبەکانی (بووكو زاوای ئیسلامی)و (ژیانی جنۆکە)و (ڕەوشتی چوونە سەر ئاودەست)، (پۆشاكو حیجابی ئیسلامی) دەکات(ل٢١).

دیارە تەنها ئەو ناونیشانانە لە ئەدەبییاتی ئیسلامی دەزانێت کەچی بۆ خۆی بەڕەوا دەزانێت قسە لەسەر ئوسوولێیەت بکات. بڕوانە کە هەرخۆی ناوی چەندین سەرچاوەی ئیسلامی بردووە کە ناوی یەك جنۆکەیان تێدا نییە: کتیبو وتارەکانی حەسەن ئەلبەننا، دادپەروەریی کۆمەلایەتی لە ئیسلامدا (سەید قوتب)، دوو کتێبی تری سەید قوتب، قورئانو دەسەلات

(فەهمی هوەیدی)، سۆشیالیزمی ئیسلامی (مستەفا ئەلسباعی)، چەند کتێبێکی (محمد عماره)، ڕابوونی ئیسلامی... (قەرەزاوی)..تاد، ئیتر میسری هیچ نادۆزێتەوە بیکاتە ڕەخنە (ژیانی جنۆکە)و (ڕەوشتی چوونە سەر ئاودەست) نەبێت کە ئەگەر سەدان کتێبی لەو جۆرەش هەبن (ڕاستتر ئەو جۆرە نووسینانە نامیلکەن) ناتوانین بیانکەینە ئەدەبییاتی ئوسووڵییەت نەك تەنها لەبەرئەوەی ئەوانە بەشێکی کەمن لە بەرهەمەکان بەڵکو لەبەرئەوەی ئوسووڵییەت کەمتر بایەخ بەو جۆرە بابەتانە دەداتو زیاتر بایەخ بە بابەتی فیکریو سیاسی دەدات تا ئەو ڕادەیەی هەندێك موسڵمان ڕەخنەی لێ دەگرێت کە بابەتە ئیمانییەکانو بابەتە فیقهییەکانی فەرامۆش کردووە.

## نارێکی

شێوەیەکی نارێکیی میسری هەیە کە لای زۆربەی خەڵك هەیە ئەویش بەو واتایەی کە کەسێك ڕەخنە دەگرێت بەڵام ئەو ڕەخنەیە لە خۆشیدا هەیە. میسری چەند ڕەخنەیەك لە ئوسووڵییەت دەگرێت کە خۆی یان کەسانی تری غەیری ئیسلامی دەگرنەوە، جاری واشە ئەوە ڕەخنە نییە بەڵام لەبەرئەوەی باس لە ئوسووڵییەتی ئیسلامی دەکرێت خاڵی باسکراو دەبێتە ڕەخنە. ئەمانەی خوارەوە نموونەن لەسەر ئەو جۆرە نارێکییە:

<u>یەکەم:</u> لای میسریو هاوشێوەکانی ڕەوتی ئیسلامی سیاسی هەمیشە ڕوو لەو جێگایانە دەکات کە هەژارنو لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە دواکەوتوون(ل١٣— ١٤).

ئەگەر ئەمەش عەیب بێت پێویستە بۆ چەپیش عەیب بێت چونکە چەپیش بەهەمان شێوە ڕووی لەو جێگایانە کردبوو، بەڵام دیارە ئەوە عەیب نییە، نە بۆ ڕەوتی ئیسلامەو نە بۆ ڕەوتی چەپ چونکە ئەو ڕووتێکردنەوئەو

بەدەمەوەچوونەی خەڵك بۆ ئەو دوو ڕەوتە نیشانەی ئەوەن کە ئەو دوو ڕەوتە توانیبوویان بەدەم خواستەکانی هەژارانەوە بچنو بەرەکەی تر، بەرەی حکومەتو دەوڵەمەندانو قەڵەمبەدەستانی هاوشێوەی میسری لە خەمەکانی هەژاران دووربوون.

پێشەکی چاپی دووەم تەواو دەبێتو میسری مارکسیەتی خۆی لەیاد دەچێت بەڵام ئێمە زوڵم لە مارکسیەت ناکەینو دەڵێین ئەوە مارکسیەتێکی ساختەیە.

دووەم— لەمیانەی باسی میانڕەوەکان کە گوایە میانڕەو نین باسی بەنتا دەکات لە نامەکەیدا: هەر نەتەوەیەك نەیتوانی مەرگ بچێنێو نەزانێ چۆن بەشەرەفەوە بمرێ نەتەوە نییە، ئەوەش کە ئێمەی زەلیل کردووە ئەوەیە ژیانمان زۆر خۆش دەوێو ڕقمان لە مردنە(ل٧). ئەم دەقە بخەرە سەر کاغەزێکی جیا نازانێ کێ نووسیویەتی: کەسێکی ئیسلامی یان چەپڕەوێکی چەکداری ئەمریکای لاتین یان پێشمەرگەیەکی کورد!

ئاشکراشە ئەوە بانگەوازی خۆبەختکردنە نەك کوشتنی بەرامبەر، بانگەوازی کوشتنی بەرامبەر زیاتر توندڕەوەکان دەیکەن.

سێیەم— زەرووورەتی هەبوونی حزبی ئیسلامی

میسری بەڵگەیەك دەهێنێتەوە کە حزبی ئیسلامی زەروور نییە، ئەمەش بەڵگەکەیە: زۆربەی زۆری مرۆڤەکان موسڵمانو پەیڕەوی ڕێوڕەسمی ئایینیی خۆیان دەکەن ئیتر چ پێویست دەکات حزبی ئایینی هەبێ؟(ل٥)، بەڵام هەمان بەڵگە ڕووبەرووی حزبە قەومییەکان دەبێتەوە: خۆ هەموومان کوردین کەواتە چ پێویست دەکات حزبی قەومی هەبن؟

پێویستیی هەبوونی حزبی ئیسلامی هەر لەو قسەیەدا دەردەکەوێت:

خەڵك موسڵمانن‌و پەیڕەویی ڕێوڕەسمی خۆیان دەکەن بەڵام عەلمانیەت دەڵێت ئەو ڕێوڕەسمانە پەیوەندییان بە دەوڵەتەوە نییە، ئاسمان بۆ ئێوەو زەوی بۆ ئێمە، لەکۆتاییشدا هیچ شتێك لەو دەوڵەتەدا لەگەڵ ئایندا ناگونجێت‌و لەوەبەدوا دابڕانی کۆمەڵگە لە ئاین هێندە گەورە دەبێت دەرگای ئاسمانیش بەڕوویدا دادەخرێت. عەلمانیەت بەرنامەی خۆی جێبەجێ دەکات بۆیە پێویستە حزبی ئیسلامی هەبێت بۆ بەدیهێنانی بەرنامەی خۆی، بەرنامەکەش پەیوەندیی بە پێگەی ئاین لە هەردوو دەوڵەت‌و کۆمەڵگەوە هەیە. ئەوەی دواییش، واتە پێگەی ئاین لە کۆمەڵگە زەرووورەتێکی تری هەبوونی حزبی ئیسلامییە چونکە بەهۆی سەردەمانی دواکەوتن‌و شێواندنی ئاین‌و بەهۆی سەردەمانی خۆسەپاندنی دەوڵەتی دوور لە ئاین بەسەر کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا ئەو کۆمەڵگانە کەم تا زۆر لە تێگەیشتنی دروستی ئاین‌و لە مومارەسەی ڕاستی ئاین دوورکەوتوونەتەوە. بێگومان کاتێك حزبی ئیسلامی لە دەسەڵاتدا بێت توانایەکی گەورەتری دەبێت بۆ گەڕاندنەوە کۆمەڵگە بۆ تێگەیشتن‌و مومارەسەی دروستی ئاین، وەك پێچەوانەکەش هەروا ڕاستە، واتە دەسەڵاتێکی دوور لە ئاین دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی زیاتری کۆمەڵگە لەو ئاینە.

چوارەم: ڕەگەکانی تیرۆر: میسری دەنووسێت: تیرۆر تەنها کوشتن‌و غافلکوژی ناگرێتەوە.. بەڵکو کوشتن‌و غافڵکوژی بەشێکن لە تیرۆر، تیرۆریزم ئیلغاکردنی بەرامبەرە بەشێوەیەکی فیزیکی بێت یان فیکری. تیرۆرزم فیکرە باوەڕی بە ململانەی سیاسی‌و دیالۆگ‌و ئازادیی بیرو ململانەی کۆمەڵایەتی نییەو لەهەمان کاتدا دەرەنجامی گۆشەگیری‌و دابڕانە، کاتێکیش هێزێکی سیاسی ناتوانێت پرۆژە سیاسییەکەی خۆی بەشێوەیەکی سروشتی پیادە

بکاتو هەست بکات لە بازنەیەکدا گیری خواردووە هەوڵ دەدات بەشێوەیەکی تر بوونی خۆی بسەلمێنێت تا ئەو ئاستەی ترسو تۆقاندنو خۆسەپاندن دەکاتە سەرمەشقی کاروکردەوەی خۆی(ل٣).

ئەم چەندە دێڕەی بەکورتی هێنامن بۆ کۆمەڵە پەڕگیرەکان (چەپو ڕاستو ئیسلامی) ڕاستن هەروەك چۆن بۆ حکومەتەکانیش هەر ڕاستن، کۆمەڵەکانی دەرەوەی دەسەڵات کە باوەڕیان بە حیوارو ئازادیی بیروڕا نەبێتو کە لە گۆشەیەکدا گیر دەخۆن پەنا بۆ کاری توندوتیژی دەبەن (هەشیانە بە پووکانەوە ڕازی دەبن)، حکومەتەکانیش بەهەمان شێوە کە باوەڕیان بە حیوارو ئازادیی بیروڕا نەبێتو بەرامبەر گەلو موعارەزە لە گۆشەیەکدا گیردەخۆن پەنا بۆ توندوتیژیو تۆقاندنو خۆسەپاندن دەبەن. بەڵام بۆچی میسریو هاوشێوەکانی ئەوە بەسەر تەنها کۆمەڵە ئاینییەکاندا دادەبڕن؟ چونکە میسریو هاوشێوەکانی پشتی دەسەڵات دەگرن.

پیاوانی دەسەڵات ئەو قسانە دەکەن بەڵام واقیع قسەیەکی تری هەیە: حکومەتەکان گەمەی تۆقاندنو خۆسەپاندن دەست پێدەکەن، پریشکی ئەوانەش نەك تەنها بەر ئەوانە دەکەوێت کە بە پەڕگیر ناودەبرێن بەڵکو ئەوانەش پێوەی گیرۆدە دەبن کە کەس گومانی لەوەدا نییە میانڕەون، گوناهەکەشیان ئەوەیە موعارەزەن، گوناهەکەشیان گەورەتر دەبێت ئەگەر موعارەزەیەکی بەهێز بنو هەڕەشەیەکی جیددی بن لەسەر هەیمەنەتی تاقمی دەسەڵاتدار.

خۆسەپاندنی کەمایەتییەکی سەربازی یان دەرەبەگ یان بنەماڵەوڕەفزی نەیارەکانو توندکردنی چنگ لە جەستەی دەوڵەتو گیانی هاوڵاتییان، لەبەرامبەرشیدا نەیارەکان ڕێگەی توندوتیژی دەگرنەبەر، بە ئەندازەی

زەبری حكومەتیش بیری توندڕەو پاساوەكانی خۆی دەدۆزێتەوە.

نموونە: توندوتیژیی ئیخوانی میسر كاتی پادشایەتی كەمتر بوو لەچاو توندوتیژیی ئیسلامیی سەردەمی ئەنوەر ئەلسادات چونكە لە سەردەمی پادشایەتی گەمەیەكی سیاسی هەبووە، بەڵام كاتی عەبدولناصر بەدواوە تەنها گەمەی دەسەڵات مایەوە، تەنانەت توندوتیژیی ئیخوان هی خودی ئەوان نەبوو بەڵكو بەشێك بوو لە كەشوهەوای گشتیی میسرو جیهان. بیروڕای شۆڕشگێر بەچەپو ڕاستەوە (فاشییەتیش جۆرێك بوو لە شۆڕش) جیهانی داگیركردبوو، وڵاتی میسریش لەوە بێبەش نەبوو، جگە لەوەش دەسەڵات بەشی خۆی توندوتیژ بوو ئەگەرچی توندوتیژییەكەی لەچاو وەحشیگەرییەكەی سەردەمی عەبدولناصر یاریی منداڵان بوو.

میسریی خۆمانو هاوشێوەكانی كە ئەو جۆرە شتانە دەڵێن ناگەنە ئەنجامە مەنتقییەكە كە بریتییە لەوەی ستەمو دیكتاتۆریەتی فەرمانڕەوا یەكەم دروستكەری كەشوهەوای گونجاون بۆ توندڕەوی، ئەوان ناگەنە ئەو ئەنجامە چونكە مەبەستیان تەنیا تاوانباركردنی ڕەوتی ئیسلامییە، ئەو مەبەستەش زۆربەی كات دەیانخاتە ناو باوەشی دەسەڵات، هەرچەندە چەپڕەوەییەكەی میسریش چەپڕەوەییەكی ((عەشایەری))یە بەڵام خەڵكی ترمان بینیوە چەپڕەوێكی ساغترە كەچی پاڵیداوەتە بەر دەسەڵات (بەڵام مەبەستمان نییە هەموو چەپەكان ئەوەیان كردووەو مەبەستمان لە چەند نموونەیەكە)، بەهۆی ئەمەشەوە باسێك لەو شێوەی میسری نرخێكی وای نییە چونكە یەك لای مەسەلەكە وەردەگرێت ئەویش بەسەقەتی، چۆنیش نرخی دەبێت كاتێك دەبینین شتی لەم جۆرە نووسراوە: ((هەموو ئاینەكان لەسەر هەر زەمینەیەكو لەهەر دەورو زەمانێك هەستیان بە مەترسیی

بەرامبەرکەیان کردبێ دەستیان لەکاری تیرۆریزمی نەپاراستوە))(ل٣).
دەزانین ئەمە تایبەت نییە بە ئاینەکان بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری گەمەکارانی ناو کۆمەڵگە دەیکەن: حکومەت بەشێوەیەکی سەرەکی، چەپڕەوەکان، ڕاستڕەوەکان..

توندڕەوی لەناو نابرێت بەڵام دەتوانرێت سنووری بۆ دابنرێت ئەوەش بەوەی ئازادیی بیروڕا بۆ نەیارەکان بە قەدەغە نەزانرێت، بەڵام ئازادییەك نا لەو جۆرەی میسری کە تەنها ئازادی لەوەدا دەبینێت عەلمانیەت بەرنامەی خۆی جێبەجێ بکاتو ئەوانی تر سەرکوت بکرێن بەبیانووی ئەوەی مەترسییەکی موحتەمەلی دواڕۆژن، بەڵام تەنها ئازادیی بیروڕا بەس نییە چونکە ئەو ئازادییە ڕووکەشییە ئەگەر هەبێت بەڵام کەس نەتوانێت وەزعی دەسەڵات بگۆڕێت.

پێنجەم: ئوسوولییەتو عەقلانیەت

ڕەخنەکە تەنها بۆ ڕەخنە بێت وەکو قسەکەی میسریی لێ دێت کە ئیبداعی ئەوی تێدا نییە بەڵکو قسەی کەسانی پێش ئەوە کە ئوسوولییەت هەڵوێستێکی پراگماتیی لەمەڕ سوودوەرگرتن لەشارستانیی ڕۆژئاوا هەیە چونکە هەرچییەك پەیوەندیی بە بەرهەمی سامانی ماددییەوە هەیە پەسەندی دەکاو ئەوانەیش پەیوەندییان بە بواری فیکرو ڕۆشنبیرییەوە هەیە حەرامیان دەکات(ل١٩).

جارێ ئەمە هەنگاوێکە بۆ دواوە چونکە لای میسری ئوسوولییەت ناعەقلانییەو دواکەوتنەو هەوڵی دواخستنی مرۆڤ دەدات، بەڵام لێرەدا پێشکەوتنی ماددیی ڕۆژئاوای لا پەسەندە، واشی بۆ دەچم میسری باسی ئەم هەڵوێستەی ئوسوولییەت لە سەرچاوەکەیەوە وەرگرتووەو قسەکانی تر

کە ئوسوولّییەت هەولّی دواکەوتن دەدات لە سەرچاوەیەکی تر وەرگرتووە (رەنگە ئەمەیان قسەی خۆی بێت)و وەکو هەموو نووسەرە جەوالّ لەشانەکان ئەو دوانەی تەنیشت یەك داناوە بێئەوەی لەیەکیان بداتو بزانێت چەند لەگەلّ یەکتردا نارێكو ناتەبان.

شەشەم: ئوسوولّییەتو ئیرادە

بیری ئوسوولّی بەهۆی بیروباوەڕی غەیبییەوە ڕۆلّی مێژوویی ئادەمیزاد دەکاتە بوونەوەرێکی بیّ ئیرادە(!)و دەیەوێت لە موسلّمان بگەیەنیّ هەرچی شتێك زانستو تەکنۆلۆجیا بەرهەمیهێناون ئیرادەی خوای لەسەربووە. بەم لێکدانەوە نەهلیستییە مەبەستێتی پرۆژە سیاسییەکەی تیۆریزە بکاتو ڕاییگەیەنێت مادام هەموو شتەکان بەندن بە ئیرادەی خوداوە لە ئایندەیەکی نزیکدا سیستەمی ئیسلامی سەرتاسەری دونیا کۆنترۆل دەکات(ل٢٣).

میسری نازانێت چی دەلّێت، لەلایەکەوە بیری ئوسوولّی بە بێئیرادەکردنی مرۆڤ تاوانبار دەکات بەپێی وتەی: هەموو شتێك ئیرادەی خوای لەسەربووە، بەلاّم یەکسەر دوای ئەوە شتێك دەخاتە پالّ ئەو بیرە کە کاری ئەو کەسانە نییە کە مرۆڤ بێئیرادە دەکەن، بەلّی بیری ئوسوولّی دەلّێت ئیسلام سەرکەوتنی گەورە بەدەستدەهێنێت بەلاّم ئەوە وزە بە موسلّمانان دەداتو پێیان دەلّێت گویّ مەدەنە شکستو دواکەوتوویی ئێستاو مەڕووخێن. میسری ڕەخنەی کۆنی سەردەمی مارکسیەت لە ئاینی پڕکراو لە خورافەمان بۆ دەهێنێتەوە لە سەردەمێك کە ئوسوولّییەت خاوەنی ئەوپەڕی ئیرادەیە، ئیرادەیەك وای لێکردووە بەرامبەر هێزە گەورەکانیش بوەستێتەوە.

ڕەنگە پێویستە ڕەخنەکە ئەوە بێت کە ئامانجەکانی ئوسوولّییەت هێندە گەورەن لەگەلّ تواناکانیدا ناگونجێن بەلاّم ئوسوولّییەت وەلاّمی ئەوەشی

پێیە: ئوسوولێیەت دەڵێت ئیرادەی پۆڵایین بەربەستەکان دەشکێنێت بەڵام ئەوەیان ئیرادەی خودی خۆمان نییە بەڵکو پشتیوانی خودایەو ئەو بەڵێنانەی خوداو پێغەمبەر داویانە. بەواتایەکی تر کێشەکە، ئەگەر ئەسڵەن ئەوە کێشە بێت، زیادە ئیرادەیە نەك بێئیرادەکردنی مرۆڤ وەکو میسریی خاوەن عەقڵی پێش چلو پەنجا ساڵ دەڵێت... ئاشکراشە چونکە ئەوعەقڵە کۆنەی هەیە کە لەگەڵ واقعی نوێدا ناگونجێت قسەکانی دژ بەیەکن... بەوە دەزانێت یان نازانێت؟ ئەوە کێشەی ئەو نییە، کێشەی ئەو شکاندنی بەرامبەرو ڕەزامەندیی دەسەڵاتەو بەس.

## هەڵبژاردن لە ڕەخنە

میسری ڕەخنەی ئەوەی دەگرێت کە ئەگەر باوەڕ یەك باوەڕەو شەریعەت یەك شەریعەتە ئیتر بۆچی چەند حزبو ڕێکخراو بۆ ئەو مەبەستە هەن(ل١٦).

ئەمەش نەك تەنها بەو پرسیارە وەڵام دەدرێتەوە ئەگەر نەتەوە یەك نەتەوە بێت بۆچی چەند حزبێکی قەومی هەن بەڵکو هەروەها ئاگاداریشمان لە ڕەخنەیەکی پێچەوانە دەکاتەوە کە ئەوان لە شوێنی تردا دەڵێن بۆچی ئاین یەك ئاینە کەچی مەزهەبەکان زۆرن؟ ئەو هەمەجۆرەییەش کە لەکاتی تر داوای دەکەنو لێرەدا ڕەفزی دەکەن، لە حاڵەتی ئێستای میسریدا حیساب بۆ ئەو هەمەجۆرییەش ناکرێت.

تایبەتییەکی تری ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە بانگەشە بۆ ڕەخنە دەکەن بەڵام ڕەخنەکە بەفعلی تەنها ئاڕاستەی توێژێکی یان ڕەوتێك یان دیاردەیەکی دیاریکراو دەکەن. میسری داوا دەکات جەماوەر فێر بکرێت کە هەموو دیاردەیەك بابەتی ڕەخنەیەو هیچ شتێك بڤە نییە(ل٨)، ئەوەش لەمیانەی هاندانی دەسەڵات دژی ئیسلامییەکان دەڵێت، واتە ئەو توخنی

ڕەخنە لە دەسەڵات ناکەوێت تەنها لە یەك کاتدا نەبێت ئەویش حاڵەتی نەرمیی دەسەڵات (ئەگەر نەرمی بنوێنێت) بەرامبەر بە ئیسلامییەکان کەچی داوا دەکات جەماوەر فێر بکرێت گیانی ڕەخنەی هەبێت.

## ناوزڕاندن بە عەرەبایەتی

هەوڵدان بۆ ناشیرینکردنی دیاردەی ئیسلامی لەڕێگەی لکاندنی سیفەتی نەتەوەپەرستیی عەرەبی شێوەی سەیر وەردەگرێت. میسری باسی ئەوە دەکات چۆن ئوسووڵییەکان دەبینین شارستانیی ڕۆژئاوا کۆمەڵگەی ئیسلامیی تێپەڕاندووە بۆیە تێزێکی تر بەرهەمدەهێنن گوایە هەرچییەکی شارستانیی ڕۆژئاوا لە شارستانیی ئیسلامی وەرگیراوە بۆیە موسڵمان مافی خۆیانە کەڵکی لێوەربگرن(ل١٩).

تا ئێرە قسەیەکە ئەگەر لەگەڵیشدا نەبین ناتوانین بڵێین ئەوەڵی لەگەڵ ئاخریدا نارێکە بەڵام ڕستەیەك هەیە لە قسەی میسری پەڕاندوومانە.

ئەمەش کورتەی هەموو قسەیەکە بەو ڕستەیەوە: ئوسووڵییەکان دەبینن شارستانیی ڕۆژئاوا کۆمەڵگەی ئیسلامیی تێپەڕاندووە بۆیە تێزێکی تر بەرهەمدەهێنن گوایە هەرچییەکی شارستانیی ڕۆژئاوا لەشارستانیی ئیسلامییەوە وەرگیراوە، ئیسلامیش دیاریی عەرەبە بۆ گشت مرۆڤایەتی، بۆیە موسڵمانان مافی خۆیانە کەڵکی لێ وەربگرن.

بزانە چۆن ڕستەی (ئیسلام دیاریی عەرەبە بۆ گشت مرۆڤایەتی) هیچ پەیوەندییەکی بەسەرو قنگی پاراگرافەکەوە نییە بەڵام خراوەتە ناویەوە تەنها بۆ ئەوەی ناوی عەرەب بخرێتە ناو باسەوەو بۆ ئەوەی ئەو قسەیە دووبارە بکرێتەوە کە ئیسلام هی تەنها عەرەبە. بەڵام هۆیەکی تر هەیە بۆ ئەم تێخنینە:

ئەو ویستوویەتی ڕەبتێك دروست بکات لەنێوان ئەو پاراگرافەو پاراگرافەکانی دوای ئەوە کە باسی هەڵوێست لە شارستانیی ڕۆژئاوا دەکەن لەلایەكو پاراگرافەکەی پێشوو کە باس لە بەکارهێنانی ئاین بۆ سەروەریی عەرەب، لەم ڕێگەیەش سەقەتتری نەدۆزییەوە، واتە تێخنینی ڕستەیەك کە پەیوەندیی بە پاراگرافی پێشوووە هەیە، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بەم پاراگرافەوە نییە.

میسری لە کۆتایی پێشەکییەکەیدا دەگەڕێتەوە سەر خاڵێك کە بەبڕوای خۆی گونجاوە بۆ دوورخستنەوەی خوێنەر لە ڕەوتی ئیسلامی ئەویش گوایە ناوەرۆکی وتارەکە لەپێناو ژیاندنەوەی ڕۆڵی نەتەوەی عەرەبدایەو لەمەدا هاوبەشە لەگەڵ نیزامە شۆڤینییە عەرەبەکان پاشان باسی پشتگیریکردنی ڕژێمی بەعس لەرێکخراوەی (ئەلقاعیدە)– شتێك کە ئەمەریکا بۆ گرتنی عێراق کردبوویە بیانوو بەڵام دوایی هەر خۆی بەدرۆیخستەوە– لەکۆتاییشدا دەڵێت ئوسوولییەتی ئیسلامیی سوننە بەرئەنجامی شکستی بزوتنەوەی قەومیی عەرەبەو ئەمجارە دەیەوێت لەبەرگی ئاینیدا خۆی دووبارەبکاتەوە، کە ئەمە ڕێك پێچەوانەی واقعە لەبەرئەوەی ڕەوتی ئیسلامی لەگەڵ ڕەوتی قەومیدا هەبووەو گەورەترین زەبر بەریکەوتبێت بەدەستی ڕەوتە قەومییەکانەوە بوو (عەبدولناصر، ئەلئەسەد، صەددام).

جگەلەوەش ئەوەی شارەزاییەکی کەمی لە ڕەوتە ئیسلامییەکان هەیە دەزانێت کە ئێستا کەمێك عەرەبایەتی تێکەڵ بە فیکری هەندێ لە حزبە ئیسلامییەکان بووە، چەندیش ئەو حزبە بەرەو میانڕەویو دیموکراسیو نزیکبوونەوە لە عەلمانییەت دەچێت هێندە عەرەبایەتی تێکەڵ بە فیکری بووە، چەندیش ئەو حزبە لەو شتانەوە دوور بێت (پەڕگیرەکانو ئەوانەش کە

پابەندی ئیسلامن بەلاّم پەڕگیر نین) ئەوەندە لە فیکری قەومیی عەرەبییەوە دوورە تا لای هەندێکیان دەگاتە ڕادەی تەکفیرکردن، ئەوەی سەیر نییەو پەیوەندیی بە کوردەوە هەیە ئەوەیە عەرەبە ئیسلامییە میانڕەوەکان خۆیان لەناوی (کوردستان) دەپارێزن لەکاتێکدا ئەلقاعیدەو ڕێکخراوە وابەستەکانی بەشێوەیەکی ئاسایی ئەو ناوە بەکاردەهێنن، لە (بن لان)یشەوە بەرەو خوار ناوی کوردستان بێ هیچ ئیحراجییەك دەبەن، ناشلێن کوردستانی عیراق، خۆ ئەگەر میانڕەوێك بوایە دەیوت باکووری عیراق یان چینێك ئارەقی دەردەکرد ئینجا دەیوت کوردستان.

میسری کە بەئارەزووی خۆی مێژوو دادەڕێژێت دەڵێت ئایدیۆلۆجیای بۆرجوازی شۆڤێنییەکی عەرەبییەو ئیسلام بە بەشێك لە کەلتووری نەتەوەی خۆی دەزانیێو لەدوای سەربەخۆییەوە بە دوو ئاراستەی جیا پیادەی کردووە؛ بەرامبەر کرێکارانو توێژە هەژارە عەرەبەکان مۆرکێکی نەتەوەیی بەو کەلتوورە دەداو ((تۆمەتی دژایەتیکردنی سەرورەریی عەرەب شوێن هەر هێزێکی کۆمەلاّیەتی دەخا کە سیستەمی عەلمانی بکاتە ئامانج))(ل١٣).

سەرلەبەری قسەکەش نەشارەزاییە ئەگەر نەڵێین تەزویرە چونکە ڕاستە عەرەبچێتی ئیسلام بە کەلتووری خۆی دەزانی بەلاّم هەرگیز وەك مەرجەعێکی فیکریو سیاسیی خۆی نەدەزانی، عەرەبچێتی تا سەر ئێسقان عەلمانی بووەو ئەدەبییاتی دوو ڕەوتی گەورەی عەرەبچێتی (ناصریەتو بەعسیەت) لەبەردەستدا هەنو هەموو کەس دەتوانێت بەئاسانی حەزنەکردنی ئەو دوو ڕەوتە بە تێکەڵکردنی ئاین بە دەوڵەت ببینێت، میسری جگەلەوەی بەو تەزویرە دەیەوێت ڕووی عەلمانییەتی عەرەبی سپی بکات پەنا دەباتە بەر موبالەغەو دەڵێت ئەو شۆڤێنییەتە عەرەبییە بۆ

هێشتنەوەی نەتەوەکانی غەیری عەرەب لەژێر دەستیدا دروشمی یەکێتیی نەتەوەیی موسڵمان بەرزدەکاتەوە(ل١٣) ڕاستییەکەش ئەوەیە گەشەسەندنی ڕەوتی عەرەبچێتی یەکێتیی ئوممەتی موسڵمانی لەگۆڕناو هەموو کێشەکان کرانە کێشەی نەتەوەییو هەندێك حزبو وڵات خۆیان لە بەرەی سوشیالست نزیك کردەوە نەك جیهانی ئیسلامی.

میسری (ل١٩ پەراوێز) لەبەرئەوەی شارەزای ئیسلامییەکانی کوردستان نییەو لەدوورەوە تەماشایان دەکات تەنها بۆ ناشیرین کردنیان چیی بەمێشکدا دێت دەیڵێت گوایە دامودەزگاکان بەناوی عەرەبی دەنێن، برەوبە کەلتووری عەرەبو پۆشاکی عەرەب دەدەن، بەرنامەی پەروەردەو فێرکردن بەو مەرجە قبووڵ دەکەن عەرەبی بن، تەنانەت کە باس لە خواردنو میوانداری دەکەن مەبەستیان لە خۆراکو میوانداری لە شێوەی عەرەبە، ئاشکراشە ئەمانە هەموو خەیاڵی میسرینو تەنها یەك شت ڕاستە ئەویش بەکارهێنانی ناوی عەرەبی بۆ منداڵ بەڵام دیسان ئەوەش بەو ڕەهاییە نییە؛ ئەوەتا ئیسلامییەکان لەبەردەستدانو دەتوانرێت بزانرێت ڕێژەی ناوی عەرەبی کە لە منداڵەکانیان دەنرێن چەندە؟ هەروەها مەبەست هەر ناوێکی عەرەبی نییە بەڵکو بایەخ تەنها بەو ناوانەی کە ئیسلامییەتیان پێوە دیارە واتە کەس لەو ئیسلامیيانە لەبەر عەرەبایەتی ئەو ناوانە هەڵنابژێرێت، ئەمەش شایەتیی کەسێکە لەناویاندا دەژی نەك قسەی کەسێکی وەکو میسری کە تەنها لە دوورەوە ئیسلامییەکانی بینیوە کەچی ئیدیعای ئەوە دەکات لە فیکریان دەکۆڵێتەوە، حاڵیش هەرچۆنێك بێت میسری دوایەمین کەسە بۆی هەبێت باسی کوردایەتی بکات.

## موبالەغە

میسری لە خەیاڵدا دەژی‌و دەڵێت ئیسلامییەکان هێندەی لە ڕۆشنبیران دەترسن هێندە لە هێزە سیاسییەکان ناترسن چونکە ڕۆشنبیران بەتایبەت ئەوانەی تەفاعول لەگەڵ مەسەلە جەوهەرییەکانی ژیاندا دەکەن خاوەنی پرۆژەیەکی ڕۆشنگەرین(ل٩) دیارە لە هەسارەیەکی تردا دەژی چونکە وردبوونەوەیەکی زۆری لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی کوردیی ناوێت تا بزانرێت کە جگە لە کەسانێکی کەمی خاوەن دیدی جیددی ڕۆشنبیریی کورد چەند لەدواوەیە.

موبالەغەو تۆمەتبارکردن بەڕوونی لەو کتێبەدا دیارە، ئەوەتا میسری بۆ تۆمەتبارکردنی ئیسلامییەکان دەڵێت: لەپێناو کەڵەکەکردنی زیاتر سەرمایەی ماڵیدا دەیان فەتواو حوکمی شەرعی دەردەهێنن‌و سوود (الربا) حەلاڵ دەکەن (ل٢١) تەنها مەنتقی موبالغەشە ژمارە زیادە دەکات چونکە چ پێویست بە(دەیان) فەتوا بۆ ئەوە دەکات؟

نیازی هاوشێوەکانی میسری پاڵیان پێوەدەنێت بۆ بەکارهێنانی بەردەوامی وشەکانی (هەموو)، (دەیان)، (سەدان)، (تێکڕای)و خوشك‌و براکانی تری ئەو جۆرە وشانە.

میسری دەرفەتێك لە پێشەکییەکەیدا دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی چەند قسەیەکی دووروودرێژی بێسەروبنی (فەرەج فوودە)ی میسری نەقڵ بکات. ناوبراو دوژمنایەتیی سەرسەختی ئیسلامییەکانی دەکردو نووسینەکانی پڕ لە تانەوتەشەرو تۆمەتبارکردن‌و سووکایەتی پێکردنن.

قسەکان بەوە دەستپێدەکەن: قورئان سووی حەرام کردووەو ئوسووڵییەت حەلاڵی دەکات، بەلام گەشتوگوزار لە خەڵك حەرام دەکەن،

ئەویش گوایە لەبەرئەوەی موسڵمانان تێکەڵ بەخەڵکی وڵاتانی تر دەبن و لە شارستانییەکەیان بەهرەمەند دەبن.

ئەم قسەیە ئاساییە بۆ نووسەرێك کەسانێکی کەم بکاتە نموونەی دیاردەیەك، ئەوانە بەدوای نموونەی سەیردا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بەسەر زۆرینەدا بیسەپێنن.

ئینجا گوایە فەرەج فوودە قسەکانی کەسێکی ئوسووڵی دەهێنێتەوە کە ئاوای وتووە:

گەشتیارەکان شارستانییەك دەهێنن ئیسلام قەدەغەی کردووە. دراوێك دەهێنن کە لەئاینی ئێمە نەبووە چونکە ئیسلام جگە لەدرهەم و دینار هیچ دراوێکی تری قبووڵ نییە. باشتر لە گەشتوگوزار ئەوەیە مرۆڤ بچێتە گۆڕستان و کەمێك لەوێ بیربکاتەوە... کەی پیاوچاکانمان ئاودەستیان بەکارهێناوە؟ دەبێت لەپێناوی ئاودەستدا دەوڵەت بە ملیار پارە بۆ زێراب و ئاوەڕۆ خەرج بکات لەکاتێکدا دەتوانین لەجیاتی ئەوە بۆ سەرئاوکردن بچینە دەرودەشت ئیتر هەم پارەیەکی زۆر بۆ دەوڵەت دەگەڕێتەوە هەم بۆ موسڵمانانیش گەشتوگوزارە. (بەکورتی، ل٢٢–٢٣).

ئەو قسانەی فوودە بۆنی زێرابیان لێ دێت و میسری ئەو بۆنەی پێ خۆشە بۆیە بەدرێژایی زیاتر لاپەڕەو نیوێك نەقڵیان دەکات گوایە قسەی کەسێکی ئوسووڵین. ناوی ئەو کەسە نەبراوە، قسەکانیش جێگەی گومانن بەڵام گریمان وترابن فوودە قسەی لەو جۆرە هەڵدەبژێرێت بۆ باسی دیاردەیەکی فراوان و گەورەو جیهانیی وەك ئەوەی ئوسووڵییەتی ئیسلامی، ئایا دروستە ئیسلامییەك نموونەیەکی وا سەقەت هەڵبژێرێت و بیکاتە نموونە لەسەر

عەلمانیەت؟[٣]

## تێخنینی مەسەلەکان

نموونەیەکی تر لەسەر تێخنینی زانیاری لەشوێنی نەگونجاودا ئەوەی لاپەڕە(٢٠) کە تێیدا باس لە هەوڵەکانی ئوسووڵییەت سەبارەت بەئیسلامیکردنی زانستەکان (أسلمة العلوم) کراوە کە دەیەوێت دەستکەوتەکانی زانستی بە باوەڕی ئاینی لێکبداتەوەو هەرچییەك لەگەڵ بنەماکانی ئایندا ناگونجێت لایباتو بۆ گەیشتنیش بۆ ئەم مەبەستە زاراوەی دوو لانە (مصطلحات ثنائیة) دووبارە دەکاتەوە(ل٢٠).

با خوێنەر هەوڵبدات بزانێت ئەو زاراوانە چین کە بۆ وەرگرتنو قبووڵکردنی دەستکەوتەکانی زانست بەپێی باوەڕی ئاینی بەکاردێن، دڵنیام خوێنەر ناتوانێت ئەو زاراوانە بدۆزێتەوە، ئەو کارە بۆ میسریش زەحمەتە هەر بۆیە دەبینین ئەم زاراوانە دەنووسێت: ڕزگاربوونو لەناوچوون (الخلاص و الهلاك)و ملکەچبوونو یاخیبوون (الطاعة والمعصیة) حەرامو حەڵاڵ، باوەڕو بێباوەڕی، کۆنو نوێ، ئیسلامیو عەلمانی، حزبی ئیسلامیو

3 بەپاڵ سووکایەتی پێکردنو هێرشی کوێرانەی (فوودە) لەسەر ئیسلامییەکان ئەو جۆرە کەسانە دەچنە ڕیزی دەوڵەت دژ بەو ئیسلامییانە، دەوڵەتی موخابەراتو سیخوڕو ئەشکەنجەو گرتنی هەرەمەکی. (فوودە) بەم شێوەیە لە سەنگەری دەسەڵاتداری سەرکوتکەر بوو لەگەڵ ئەوەشدا کوشتنی هەڵە بوو. لەڕاستیشداو وەك چۆن ئەگەر حساب بۆ عەقڵ بکەین ئیسلامیی عاقڵمان هەن سوود بە ئیسلام دەگەیەنن لەگەڵ ئیسلامیی بێعەقڵ کە زیانیان بۆ ئیسلام زیاترە بەهەمان شێوە عەلمانیی عاقڵو عەلمانیی بێعەقڵ هەن کە بەبڕوای خۆم پێویستە ژیانی هەردووکیان، عاقڵەکەو بێعەقڵەکە، بپارێزرێت، یەکەمیان لەبەرئەوەی سوود لەعەقڵەکەی وەردەگرینو دووەمیان لەبەرئەوەی کوشتنی لە نوکتەکانی بێبەشمان دەکات جگەلەوەی کوشتنی شەرەفێکی پێدەبەخشێت کە شایەنی نییە.

حزبی شەیتان، خواکردو مرۆڤکرد(ل٢٠).

خوێنەر ئێستا هەقیەتی ئەو پرسیارە بکات: ئەم زاراوانـە چ پەیوەندییەکیان هەیە بە بەئیسلامیکردنی زانستەکانو قبوولکردن یان ڕەفزکردنی دەستکەوتەکانی زانست؟ بەڵام تەنانەت میسریش ئەوەی نەزانیوە چونکە ئەوەی لە شوێنێکدا بینیوەو بەسەقەتی ((بردوویەتی)).

بۆیە یەکسەر دوای ئەوە قسەی پێش دێڕێکی لەبیر دەچێتو دەڵێت کە هەر یەك لەو زاراوانە کە لەسەر بناغەی دوو جەمسەری دژ بەیەك بنیات نراوە بۆ ئەوەی هەر کەس پشتیوانی لێنەکرد بخەنە سەنگەری دوژمنەوەو تۆمەتی دژایەتیکردنی شوێن بخەن. کوا بەئیسلامیکردنی زانستەکان؟ میسری ئەمجارەش ڕەبتەکەی لەدەستداوە، میسری لەکۆتاییدا ڕەبتێکی لاوازتر دەدۆزێتەوە کە ئوسووڵییەت هەموو حەقیقەتەکان لە ئاییندا دەبینێتەوە ئیتر مرۆڤ پێویستی بە سەرچاوەیەکی تری مەعریفە نییە. ئەمە بەڵگەیە کە میسری شتەکانی کۆکردۆتەوە بەڵام نەیزانیوە بەباشی بەیەکەوە بیانبەستێتەوەو بیانخاتە کار.

## نەشارەزایی لە ئوسووڵییەتو لە مێژوو

هەرچەندە کتێبەکە یەك پارچە نەشارەزاییە بەڵام بەباشترم زانی ئەم بەشە تایبەت بکەم بۆ نەشارەزایی میسری لە ئوسووڵییەتو مێژووی وڵاتانی ئیسلام بەهەموو قۆناغەکانییەوە. ئەو نەزانییە نووسەری خستبووە ناو گۆمی هەڵەوە، ئێنجا حەزو ئارەزووو هەڵوێستی ئامادەی دژایەتیکردنی ڕەوتی ئیسلامی دەچێتە پاڵ ئەو نەشارەزاییە بۆ ئەوەی پێکەوە بەرهەمێکی پڕ لە هەڵە پێشکەش بکەن.

میسری دەیسەلمێنێت کە سەرچاوەکانی ((ئوسووڵییەتی)) ئیسلامیی

نەخوێندۆتەوە چونکە دەڵێت تیۆریستەکانی ڕەوتی ئیسلامی دەزانن کە زاراوەی ئوسووڵی زاراوەیەکی ڕۆژئاواییە کەچی پەسەندیشی دەکەن(ل١٦).

ڕاستەکەش ئەوەیە کە ئەو ئوسووڵییانەی باسیان دەکات ددان بەو زاراوەیە نانێنو بۆ وەسفی خۆیان بەکاریناهێنن، میسری کە ئەوەی نەزانیوە نەشێزانیوە کە تەفسیری بەکارهێنانی وشەی ئوسووڵی هەڵەیە.

ئەو دەڵێت: ئوسووڵی بە کەسێك دەوترێت کە بتوانێت لەسەر بنەمایەکی تیۆری حوکمەکانی باوەڕ بەرجەستە بکات(ل١٦)

ئەمەش پێناسەیەکی ((گێرفانە)) چونکە ئەگەر ئەمە ئوسووڵی بێت کەواتە موتەسەووفەکانیش ئوسووڵین چونکە ئەوانیش دەیانەوێت حوکمەکانی باوەڕ بەرجەستە بکەن، تەنانەت کەسێکی دینداری ئاساییش هەر ئوسووڵییە، خۆ ئەگەر مەبەست لە بەرجەستەکردنی حوکمەکانی باوەڕ لە ئاست سەرجەم کۆمەڵگەو بەتایبەت فەرمانڕەواییو ئەگەر بزانین کە ئوسووڵییەت سەرەتا بۆ ڕەوتێکی مەسیحی بەکار دەهات دەزانین کە ئوسووڵییەتی مەسیحی بەو جۆرە پێناسە نەکراوە.

ئینجا گوایە ((ئوسووڵییە)) ئیسلامییەکان لەوەش زیاتر بە زاراوەی ئوسووڵییەت دەبەخشن کاتێك ئوسووڵی دەکەنە ئەو کەسەی لە باوەڕو شەریعەت (العقیدە و الشریعە) تێگەیشتووەو کاری بۆ بکات(ل١٦)، دیسانیش ئەوە ئوسووڵییەت نییە چونکە پێویستە تێکڕای موسڵمانان، نەك تەنها ئوسووڵییەکان، لە عەقیدەو شەریعەت تێبگەن چونکە ئەو دوو شتە خاڵی هاوبەشیانە، کارکردنیش بۆ عەقیدەو شەریعەت تایبەت بە ئوسووڵییەکان نەبووەو کەسانی زۆر هەبوون پێش سەرهەڵدانی ئوسووڵییەت کاریان بۆ کردوونو هێشتا هەن کاریان بۆ دەکەن بێئەوەی بتوانین بە

ئوسوولیان بزانین.

میسری تەنانەت ناشزانێت عەقیدە چییە چونکە وشەی (باوەڕ)ی بۆ بەکاردەهێنێت لە کاتێکدا باوەڕ بریتییە لە (ئیمان) کە هەردوو لایەنی فیکریو ڕۆحی دەگرێتەوە، لەکاتێکدا عەقیدە بریتییە لە چەند بنەمایەکی فیکریی پەیوەست بە ئیمان وەکو هەبوونو وەحدانیەتی خوداو سیفاتەکانیو قەدەرو مەرجەکانی ئیمانبوونو هۆکانی کافربوون... تاد نەزانینی ئەو زاراوەیەش چاوەڕێ کراوە لە کەسێك شتی لەچەند سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە بێئەوەی لەو مەسەلانە بکۆڵێتەوە.

دوایین هەڵەی میسری لەو شەش دێرەدا، کە هۆکەی بۆ نەشارەزایی دەگەڕێتەوە، ئەوەیە کە گوایە ئوسوولییەکان دەیانەوێت ئوسوولییەت بکەنە زاراوەیەك بەرامبەر عەلمانیەت کە حەقیقەت بە بەرهەمی عەقلانییەت دەزانێ(ل١٦) کە لەو ڕستەیەدا چوار هەڵە هەن: یەکەمیان ئوسوولییەکان نایانەوێت زاراوەکە بکەنە بەرامبەری عەلمانیەت چونکە ئەسڵەن ئەو زاراوەیە بۆ خۆیان بەکارناهێنن، دووەمیش عەلمانیەت ناڵێت حەقیقەت بەرهەمی عەقلانییەتە بەڵکو عەلمانیەت باس لە شتی تر دەکات، سێیەم عەلمانیەت باسی حەقیقەت ناکات بەڵکو باسی پەیوەندیی نێوان ئاینو دەوڵەت، هەروەها نێوان ئاینو کۆمەڵگە دەکات... بڕوانە کە میسری بەردەوام باسی حەقیقەت دەکاتو عەلمانییەکانی ئەمڕۆ شەرم لە ناوبردنی حەقیقەت دەکەن چونکە ئەو باسە بەهی مارکسیەکانو ئایندارەکان دەزانن.

چوارەم هەڵەش پەیوەستکردنی عەلمانییەتە بە عەقلانییەت کە ئەمە هەڵەیەکە کەسانی تریش دەیکەن، هۆی هەڵەکەش ئەوەیە عەلمانییەتو عەقلانییەت دوو بواری جیان لەیەك، ئەمەش زیاتر لە بواری ئابووریدا

دەردەکەوێت.

میسری لەخۆیەوە قسە دەکات کاتێك دەڵێت ئوسووڵییەتی ئیسلامی دەیەوێت خورافەو بێئیرادەکردنی مرۆڤ بژیێنێتەوە(ل١٧). ئەمەش وێنەیەکی کۆنی چەپە کۆنەکانە سەبارەت بە ئاین بەگشتی کاتێك دەیانوت ئاین مرۆڤ فێری خورافەت دەکاتو ئەو مرۆڤە بێئیرادە دەکات، بۆیەش وێنەیەکی کۆنە چونکە باوەڕی عەلمانیی کۆن سەبارەت بە ئاین ئەوە بوو ئاین باوەڕێکی سلبییەو مرۆڤ بۆ گۆڕانکاری هان نادات، بۆیەش بەزۆر فیکری چەپە کۆنەکان بوو چونکە ئەوان هەوڵیان دەدا لەمیانەی دژایەتیی ئیستعمارو توێژی فەرمانڕەوا کۆمەڵگە بگۆڕنو دەیانبینی پیاوانی ئاینو خەڵکی دیندار (بێئەوەی ئەو چەپانە بپرسن ئەو جۆرە دینداریيە تا چەند لەگەڵ خودی ئایندا گونجاوە) بەرامبەر بە گۆڕان سلبینو زۆر جار دژ بەو گۆڕانەن، لەڕووی عەقڵیشەوە نوقمی خورافەت بوون، بەڵام ئەم وەسفە بۆ ((ئوسووڵییەتی)) ئیسلامی نەك هەر نەگونجاوە بەڵکو هەڵەیەکی گەورەیە لەبەرئەوەی ئوسووڵییەت نەك تەنها خورافەت ناژیێنێتەوە بەڵکو دژ بە خورافەتە کە لەچەند بیروباوەڕو مومارەسەیەکی ناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا بەرجەستە ببوو وەك: باوەڕ بە فاڵچێتیو زانینی دوارۆژ، باوەڕی کۆن سەبارەت بە دیاردەکان وەك ڕۆژگیرانو مانگگیرانو باران، هەموو ئەو چیرۆکانەی جیهانی غەیب کە لە قورئانو فەرموودەی صەحیحدا نەهاتوون وەك چیرۆکە سەیرەکانی شاخی گاو خێوەکانی شەوانی گۆڕستانو دێوو درنجو نیشانە خراپەکانی خوێندنی بایەقووشو کوندەپەپوو و شوومێتیی ڕۆژو مانگی دیاریکراوی ساڵ... تاد، لەهەمووش گرنگتر باوەڕی زۆرباوی ناو جەماوەری موسڵمان بە توانای شێخەکان، مردووو زیندوو و هانا بردن بۆ شێخە

مردووەکانو گۆڕەکانیان.

ئوسوولیيەت باوەڕی بە جیهانی غەیب هەیە کە قورئانو فەرموودە باسیان کردووە بەڵام تەنها لە سنووری قورئانو فەرموودە بێ ئاوەڕدانەوە لە فەرموودە هەڵبەستراوەکان یان چیرۆکە سەیرەکان.. بێگومان جۆرێکی تری خورافەت هەیە کە بریتییە لەو باوەڕە ماددییە کە غەیری جیهانی بینراو باوەڕی بە هیچ جیهانێکی تر نییە بەڵام ئەمەیان خورافەتێکە لە بەرگی زانستدا.

ئوسوولیيەت هەروەها دژ بە بێئیرادەکردنی مرۆڤە چونکە بەرنامەی ئوسوولیيەت بەرنامەی کارکردنی لە کۆمەڵگەو لە کایەی سیاسیدا، بەلای کەمیشەوە کارکردنە لە کۆمەڵگە بێئەوەی توخنی سیاسەت بکەوێت وەك لە هەندێ ڕەوتی ئیسلامیدا هەیە، واتە هەوڵێکە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگەو تا دەگاتە ڕادەی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا، ئەوەش وێنەیەکی کاریکاتێرییە کە میسری پیشانمانی دەدات: هەموو ئەوانە کە ئامانجەکەیان پێویستی بە ئیرادەی گەورەیە: کەسانێك لەڕێگەی مەوعیزە هەوڵی گۆڕینی کۆمەڵگە دەدەن، کەسانێك لەڕێگەی کاری سیاسییەوە هەوڵی گۆڕینی کۆمەڵگەو نیزامی حوکم دەدەن، کەسانێك چەکیان هەڵگرتووەو لەڕێگەی جیهادەوە ئەو هەوڵە دەدەنو بە چەکە سووکەکانی دەستیان بەرامبەرهێزە گەورەکانی جیهان دەوەستن.. هەموو ئەمانە لای میسری کار بۆ بێئیرادەکردنی مرۆڤ دەکەن!

میسری ڕەوتی ((ئوسوولی)) بەوە تاوانبار دەکات کە ئامادە نییە بە چاوی ڕەخنە ئاوڕ لە مێژووی پانزە سەدەی ڕابوردوو بداتەوە کە مێژووناسانی ئیسلام پەردەیان لەسەر دەیان دیاردەی دزێو هەڵماڵیوە،

ئوسووڵییەتیش لایەنە ئیجابییەکانی ئەو مێژووە دەکاتە قوربانیی لایەنە تاریکەکانیو هەر ئەم لایەنە بە مێژووی حەقیقی دەزانێت(ل١٧).

ئەمە نیشانەیەکی ترە کە میسری خۆشی نازانێت چیی نووسیوە. ئایا کام لایەنی تاریکییە کە ئوسووڵییەت بایەخی پێداوەو بە مێژووی حەقیقەت زانیوە؟

ئاشکرایە ئوسووڵییەت سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و خەلیفە ڕاشیدەکان دەکاتە مەرجەع بۆ فیکری خۆیو تەنها لەڕووی زانستییەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەمەویو عەبباسی ئەوەش کە پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە نییە بەڵکو پەیوەندیی بە کۆمەڵگەوە هەیە کە پێویستی بەو زانستە هەبووە. سەردەمی ئەمەویو عەبباسی کە لادان لە دوو ئامانجی سەرەکیی ئیسلام تێیاندا ڕووی دا، پاکیی بیروباوەڕو ئیسلامییەتی ڕەفتار لەلایەکو عەدالەتی ئابووریو سیاسی لەلایەکی تر، ئەو دوو سەردەمەش وەکو فەرمانڕەواییو سەروەری بەزۆری زۆردار لەلایەن ڕەوتی قەومیی عەرەبییەوە شکۆمەند کراون، سەردەمی پێغەمبەرایەتیو خەلیفە ڕاشیدەکان بەشە هەر ڕووناکەکەی مێژووی ئیسلامەو ((ئوسووڵییەکان)) بۆ ئەو بەشە دەگەڕێنەوەو دەیکەنە یەکێك لە مەرجەعەکانیان.

کەسێك ئەو ڕاستییە سادەیە نەزانێت دیارە ئەوەش نازانێت کە نابێت مێژووی ئیسلامی کە مێژووناسانی موسڵمان نووسیویانە بێ قەیدو شەرت وەربگیرێت بەڵکو پێویستە بخرێتە ژێر تیشکی ڕەخنەی زانستی کە بەشی هەرە گەورەی ئەو ڕەخنەیە بریتییە لە ڕەخنە لەو سەنەدانەی ئەو مێژووەی پێ گێڕدراوەتەوە، واتە حاڵی ئەو کەسانەی ئەو مێژووەیان گێڕاوەتەوە، ئەویش بەپێی بنەماکانی زانستی فەرموودە.

ئەو کارەشە کە ڕابوونی ئیسلامی بایەخی پێداوە، مەبەستم لە ڕابوون حاڵەتە ئیسلامییەکەیە بەگشتی کە تێیدا ئەوەی تەنها خەریکی کاری زانستە ئیسلامییەکانە (قورئان، فەرموودە، مێژوو)و ئەوانەش کە خەریکی کاری سیاسین، بەڵام ئەوە بێئاگاییەکی گەورەیە مرۆڤ پێی وا بێت بۆ شارەزابوون لە مێژووی ئیسلامی خوێندنەوەی کتێبەکانی مێژوو بەسن، هەمووشیان جێگەی قبووڵ بن.

میسری چەند وشەیەك دووبارە دەکاتەوە مەگەر تەنها خۆی بزانێت لەکوێی بیستوون. ئەو دەڵێت مێژوو لە میتۆدی ئوسووڵییەت مێژووی مرۆڤ نییە بەڵکو مێژووی ئاینەو دەبێت تەقدیس بکرێت(ل١٨). یانی چی مێژووی ئاین؟ یانی چی مێژووی مرۆڤ؟ مێژوو لەکوێدا بووە؟ لەسەر زەوی؟ لە ئاسمان؟ ئاین لەناو کێدا کاری کردووە؟ هەر لەناو مرۆڤدا کاری نەکردووە؟ وەك وتم میسری تەنها چەند وشەیەك دووبارە دەکاتەوە بێئەوەی بزانێت واتەکانیان چییە.

میسری بۆ جاری چەندەم دەیسەلمێنێت کە نەشارەزایە لە ((ئوسووڵییەتی)) ئیسلامی بەوەی دەڵێت ئەو وتارە بڕیارو حوکمی موجتەهیدانی پێشوو دەکاتە چەند دەقێکی چەسپاو و نەگۆڕ(ل١٨).

((ئوسووڵییەتی)) ئیسلامی دژ بە تەقدیسکردنی موجتەهیدانی کۆنە، بەلای کەمیشەوە لە مەسەلەی موجتەهیدان بێدەنگە، هەندێ ڕەوتی ئیسلامی لەو مەسەلانە ناکۆڵنەوە چونکە لە بواری کارکردنی ئەواندا نییە یان نایانەوێت مەسەلەی موجتەهیدەکان بورووژێنن، هەندێکی تریش قسەیان لەسەر دەکەنو هەوڵدەدەن ئەو موجتەهیدانە وەکو بوونەوەرێکی پیرۆز تەماشا نەکرێن، زۆریش لەو لایەنە ئیسلامییانە حوکمێکی ئیسلامیی دروست

بەسەر موجتەهیدان دەدەن کە مرۆڤنو قسەیان وەردەگیرێتو قسەیان ڕەتدەکرێتەوە. قسەکەی میسریش نموونەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتێکی بیستووەو دووبارەی دەکاتەوە.

میسری دەڵێت ئەو کەلتوورەی ئوسووڵییەت پەسەندی دەکات کەلتوورێکە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتدا بووە(ل١٩)، ئەوەش یەکێکە ترە لە قسە بازاڕییەکان چونکە بەشی هەرە گەورەی ڕەوتی ((ئوسووڵی)) لەسەر پێگەی وتەی گۆڕانکاری ڕاوەستاوە، ئەو ڕەوتەش دەزانێت کە سەردەمی ئەمەویو عەبباسی، کە تێیاندا ئاین بۆ خزمەتی دەسەڵات خرایە گەڕ، بریتی بوو لەو گۆڕانکارییە تراجیدییەی بەسەر دەسەڵاتی خیلافەتی ڕاشیدیدا هات بۆیە وتارەکەی ناگەڕێتەوە بۆ کەلتووری ئاوێتەبوو لەگەڵ دەسەڵاتدا، ئەوەش زیاتر لە کۆمەڵە جیهادییەکاندا ڕەنگیداوەتەوە هەرچەندە لای زۆربەی کۆمەڵەکانی تریش ئامادەیە. میسری بەدوای عەیبێکدا گەڕاوەو لێرەدا عەیبی کارکردن بۆ بەرژەوەندیی دەسەڵاتی خستۆتە پاڵ ئوسووڵییەتو نەدەبوایە لای میسری، کە خزمەت بە دەسەڵات دەکات، ئەوەی بە عەیب بزانیایە.

## نەشارەزایی لە فیقه

میسری تاوانی ئەوە دەخاتە ئەستۆی بیری ئوسووڵی کە فیقهی ئیسلامی، کە دەستکردو داهێنانی مرۆڤە، دەکاتە هاوشانی قورئانو ڕواڵەتێکی موقەددەسی پێدەبەخشیو دەیکاتە بەشێك لەباوەڕ (العقیدە)(ل٢٠).

ئەمە ڕستەیەکی درێژی پڕ لە هەڵەیە؛ یەکەم: بیری ئوسووڵی نییە کە ئەو قودسیەتەی بە فیقه بەخشیوە بەڵکو ئەوە عەقڵییەتی سەردەمەکانی

داڕووخانە کە ئوسوولییەت بۆ ڕزگارکردنی موسڵمان لەو عەقڵییەتە هاتووە، دووەم: هەموو فیقھ کاری مرۆڤ نییە چونکە بەشێکی فیقھ بریتییە لە ئایەتەکانی (احکام) کە لە قورئاندا هاتوون هەروەها فەرموودەکان. سێیەم: نەئوسوولییەتو نەهیچ کەسێك لە سەردەمەکانی دواکەوتنو داڕووخان فیقهی نەکردووەتە بەشێك لە (عەقیدە) لەبەرئەوەی بواری عەقیدە جیایە لە فیقھ، چوارەمیش: میسری دیسانەوە وشەی باوەڕ (ئیمان) بۆ عەقیدە بەکاردەهێنێت.

## نەشارەزایی لە فەلسەفە

نیشانەیەکی تر کە میسری نازانێت باس لەچی دەکات ئەوەیە کە دەڵێت ئوسوولییەتی ئیسلامی وەکو کەنیسەی سەدەکانی ناوەڕست دژ بەهەموو دەستکەوتێکی زانستییە، باسی دژایەتیکردنی داروینو فیکرو فەلسەفەی زانستیش دەکات تا دەگاتە ((قوناغەکانی پەرەسەندی مێژووی مرۆڤایەتیو دیالکتیکی سروشت)) کە ئوسوولییەتی ئیسلامی ئەم دوانە بە فیکرو فەلسەفەی جوولەکە دەزانێت(ل١٨).

یەکەم هەڵە ئەوەیە باسی کەنیسەی سەدەکانی ناوەڕست دەکات کە دژ بە هەموو دەستکەوتێکی زانستی بووە... ئەوە ڕاستەو نموونە لەسەر ئەوە هەیە بەڵام لەسەر ئاستێکی زۆر بچووك چونکە سەدەکانی ناوەڕاست پێشکەوتنی زانستیی گەورەیان بەخۆوە نەبینیبوو، سەرەتای ئەو پێشکەوتنە دوای سەدەکانی ناوەڕاست بوو بەڵام زمانی میسری وەك زۆر کەسی تر بە چەند زاراوەیەكو قسەیەك ڕاهاتووە.

دووەم: میسری بۆچوونێکی نازانستیی مارکسیەت دەخاتە ناو باسەکانەوە، ئەو باس لە داروینو گەشەکردنی بوونەوەر دەکات دواییش

(دیالێكتیكی سروشت)مان بۆ باس دەكات. سەرچاوەی ئەو دیالێكتیكەی سروشتە دەگەڕێتەوە بۆ (هێگل)و لە بەشی دووەمی فەلسەفەی هێگلدا، كە فەلسەفەی سروشتە، خۆی دەبینێتەوە. بەهۆی نازانستیی ئەو بەشەی فەلسەفەی هێگلیشەوە ئەو بووە یەكەم بەش بمرێتو پشتگوێ بخرێت، ماركسیەتیش، پێبەپێی هێگل، دیالێكیتكی كردە یاسایەكی (یان پرۆسەیەكی) گەردوونی كە لە سروشتدا هەیە (ئەوەش زیاتر كاری ئێنگلز بوو)و بەهۆی ئەوەوە تووشی ڕەخنەی زۆر بوو... مەبەست ئەوەیە میسری تۆمەتی دژایەتیی زانست دەخاتە پاڵ ئوسووڵییەتی ئیسلامیو ناوی دیالێكیتكی سروشت دەبات كە هەر زوو زانرابوو زانست نییە.

## نەشارەزایی لە موفەككیرانی ئیسلامی

كەسێك نەزانێت (في ظلال القرآن) چییە چۆن چاوەڕێ بكەین حوكمی ڕەوا بەسەر (سەید قوتب)دا بدات؟ میسری دەڵێت هەركەس ئاوڕێكی خێرا لە تێزەكانی (سەید قوتب)و (ئەبولئەعلا ئەلمەودوودی)و (موستەفا شوكری)و (عەبدولسەلام مەحەمەد فەرج)و (حەسەن ئەلبەننا)و (محمد ڕشید ڕەزا)و زووتر (شافعی) بداتەوە دەگاتە ئەوەی تەعبیر لە فیكری ناسیۆنالی شۆڤێنزمی عەرەب دەكات بەڵام لەژێر پەردەی ئاینەوە(ل١٩).

دیارە میسری كە دەیەوێت بەخێرایی بگاتە ئەو ئەنجامە هەر بەخێرایی ناوی بەرهەمێكی سەید قوتبی بینیوەو لەبارەیەوە نووسیویەتی: قوتب بابەتێكی هەیە بەناوی (في ظلال القرآن)! بابەت! ئەو كتێبەی كە چاپێكی شەش بەرگی قەبارە گەورەیەو چاپی تری هەشت بەرگەو بریتییە لە تەفسیری هەموو قورئان لەگەڵ بۆچوونو تەنزیری سەید لە هەندێ مەسەلەو بڕێكی زۆر وردكردنی ماناكانو دیمەنەكان.. هەموو ئەمە لای میسری دەبێتە

((بابەتێك)) [٤]، بەڵام نەك تەنها ئەو ((بابەتە)) بەڵکو دیارە کتێبە گرنگەکەی تری سەیدیشی نەخوێندۆتەوە(معالم في الطريق) هەرچەندە چەندین جارناوی وەکو سەرچاوە بردووە، یەکەم لەبەرئەوەی سەید لە پێشەکیی (مەعالم)دا دەڵێت چوار بەشی ئەو کتێبە لە کتێبی (في ظلال القرآن) وەرگیراون[5]، دووەمیش لەبەرئەوەی سەید لەو کتێبەیدا بەئاشکرایی موفاصەلەی لەگەڵ فیکری قەومیدا کردووە، بڕوانە کە سەید دەڵێت: ڕەنگە بوترێت کە موحەممەد دەیتوانی لەجیاتی ئەو ناڕەحەتییە زۆرەی بەدەستی بانگەوازی (لااله الا الله) چەشتبووی بەناوی عروبەتەوە عەرەبی لەدەوری خۆیدا کۆبکردایەتەوە ئەویش دژی ڕۆمو فارس کە لەڕێگەی عەرەبە وابەستەکانی خۆیانەوە بەشێکی وڵاتی عەرەبیان حوکم دەکرد بەڵام خودا دەیزانی ڕێگەکە ئەوە نییە زەوی لە دەستی تاغووتێکی فارسی یان ڕۆمی ڕزگاری ببێت بۆ ئەوەی بکەوێتە دەست تاغووتێکی عەرەبی چونکە تاغووت هەر تاغووتە، ڕێگەش ئەوە نییە خەڵکی لەدەستی تاغووتێکی فارسی یان ڕۆمی ڕزگاریان ببێت بۆ ئەوەی بکەونە دەستی تاغووتێکی عەرەبی.[٦]

سەید نموونەی ئەوپەڕی پوختی عەقیدەیە بەتایبەتیش لەڕووی نەتەوایەتییەوە. کەسێکی قەومیی عەرەبیشە کە ڕەخنە لە سەید دەگرێت چونکە هیچ نرخێکی بۆ فیکرەی قەومی (پێش هەمووشیان عەرەبی)

---

[4] نەزانییەکی تریش دەخاتە پاڵ نەزانییە کەڵەکەبووەکانی کاتێك دەڵێت سەید لەو ((بابەت))ـەدا ((لە هێڵە گشتییەکانی تەکفیری کۆمەڵگە دواوە))(ل٣٧٣)، وەك چۆن کتێبێکی هەشت بەرگیی هاوشێوەی تەفسیرەکانی قورئان بۆ تەنها تەکفیری کۆمەڵگە تەرخان کرابێت.

[5] سيد قطب، معالم في الطريق، ل١٢.

[6] معالم في الطريق، ل٢٨.

نەهێشتووەو بە جاهیلیەتی زانیوە.

جگەلە بێئاگایی لە سەید، میسری ناوی (ئەلمەودوودی)ی پاکستانیش دەهێنێت وەك یەکێك لەوانەی لەژێر پەردەی ئاینەوە تەعبیر لە فیکری قەومیی شۆڤێنیی عەرەب دەکات، ئەم قسەیەش نەك تەنها شایەنی پێکەنینە لەبەرئەوەی ئەلمەودوودی عەرەب نییە چجای ئەوەی عەرەبی شۆڤێنی بێت بەڵکو هەروەها لەبەرئەوەی فیکری ئەلمەودوودی تەعبیر لە قەومییەتی خۆشی ناکات. ئەوەی لەهەمووی خۆشترە ئەوەیە میسری لێرەدا (لاپەڕە ١٩) نازانێت دواتر (لاپەڕە ٣٥٧ بەدواوە) بەدووردرێژی باسی مەودوودی دەکاتو لەو باسەدا خوێنەر دەزانێت کابرا خەڵکی هیندستان بوو (پێش جیابوونەوەی پاکستان)و تەنانەت قسەکەی مەودوودیش نەقڵ دەکات کە دەڵێت عەرەب ئاینی ئیسلامیان لە سەردەمێکدا بڵاوکردەوە کە هێشتا دامانیان بە ئامانجی نەتەوایەتی گڵاونەکردبوو(ل٣٦٠).[٧]

جگە لە مەودوودی، نووسەرێك (حەسەن ئەلبەننا) بە دەربڕی شۆڤێنیەتی عەرەبی بزانێت دەیسەلمێنێت کە ئاگای لە نووسینەکانی

---

[7] بڕوانە نامیلکەکەی ئەلمەودوودی، الجهاد فی سبیل الله، ل٤١. میسری ئەم نامیلکەکەی لە سەرچاوەیەکی تر ((بردووە)). میسری قسەی مەودوودی لەبارەی جیهادەوە دەهێنێتەوەو دوایی گوایە مەودوودی دەڵێت دوای بەئیسلامکردنی کۆمەڵگە و دامەزراندنی دەوڵەتی تیۆکراتی دەبێت بەپێی نەخشەو پلانی...تاد(میسری، ل٣٦٠)، بەڵام مەودوودی باسی دەوڵەتی تیۆکراتی (دەوڵەتی پیاوانی ئاینی)ی نەکردووەو دیارە ئەوە قسەو تەفسیری سەرچاوە ئەسڵییەکەی میسرییە کە زانیارییەکانی نامیلکەکەی مەودوودیی لێ ((بردووە)). سەرباری ئەوە میسری دەڵێت مەودووی شیعە مەزهەبە( ل٣٧٠)، ئەوەش سەیر نییە بۆ کەسێك لەملاو لەولا شت لەبارەی کەسانەوە وەربگرێت.

(ئەلبەندا) نییە. نووسینەکانی ئەوانەی تریشم لەبەردەستدا نییە بەڵام گومانم نییە کە میسری لەخۆیەوە هەمان شتیان بۆ دەڵێت، شۆڤێنییەتی شافعیش قسەیەکە وەکو ئەوانی تر.

## تێنەگەیشتن لە نووسینەکان

میسری چەندین نموونەمان پێشکەش دەکات بۆ تێنەگەیشتن لەو شتانەی دەیانخوێنێتەوە، ئەمەش یەکێکە لە نموونەکان، لە بەشەکانی داهاتووشدا زۆرتر دەبینین:

میسری (لاپەڕە١٥١) باسی نووسینێکی ئەفغانی دەکات لەبارەی کۆمیونی پاریس. میسری دەڵێت: لەبارەی پراکتیکیشەوە دوو فاقییەك لە هەڵوێستیدا بەدی دەکرێ. لەکاتێکدا کە دروشمی یەکسانیی ئینسانەکان بەرزدەکاتەوە دژ بە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە دەوەستێ کە ئامانجی دابینکردن یەکسانیی راستەقینە بوو. بەهەموو تواناوە دوژمنایەتیی کرێکارانی (کۆمۆنی پاریس) دەکات، هەر خۆیشی ددان بەوەدا دەنێ کە رێبەرانی (کۆمۆن) (بەرگرییان لە خەڵکی هەژارو رووت دەکرد)، بەڵام ئەم بۆیە دژیان دەوەستێ چونکە (داوایان دەکرد ئیمتیازی تایبەتی نەمێنێو خەڵکی یەکسان بژین)و باوەڕیشیان وا بوو (ئینسان دەستکردی سروشتەو بەپێی یاسایەکی سروشتی پەرەی سەندووە)، بۆیە بەپێویستی دەزانێ (تەفروتونا بکرێن).

ئەمە دەقی قسەکەی میسرییەو بۆ هەر یەك لەو چوار قسەیەی ناو کەوانەکان ناوی کتێبەکەی دوکتۆر عەلی ئەلوەردی (لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث) [8] وەك سەرچاوە نووسیوە. بەڵام ئەلوەردی لەڕاستیدا

---

[8] علي الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٣ ل ٢٨٥ و ٢٨٦.

شتێکی تر دەڵێت. ئەلوەردی دەقی قسەکەی ئەفغانی دەهێنێتەوە کە رەخنەی ئەم، واتە ئەفغانیی تێدایە لە کۆمۆنیستەکانو سۆشیالیستەکان کە لەپێناوی نەهێشتنی ئیمتیازەکانو حەڵاڵکردنی هەموو شتێك بۆ هەمووانو بەشداریکردنی هەمووان لە هەموو شتێك خوێنی زۆریان رشتو وێرانیی زۆریان بەرپا کرد..تاد. ئەفغانی ددانی بەوەدا نەناوە کە ئەوانە ((بەرگری لە هەژارەکان دەکەن)) بەڵکو ئەوەی وەکو ئیدديعایەك باس کردووە.

بەهەرحاڵ ئەمە گرنگ نییەو لەوە گرنگتر ئەوەیە ئەفغانی لەو دەقەدا داوای نەکردووە کۆمیونی پاریس لەناوببرێت بەڵکو نووسیویەتی کە هەموو کۆمۆنیستەکان لەسەر ئەوە رێکن ئەو شتانەی مرۆڤ حەزیان لێدەکات بەخششێکی سروشتنو زیندەوەران وەکو یەك لێیان بەهرەمەند بن، ئەوەش بیدعەیە لە یاسای سروشت کە کەسێك بەتەنیا لێیان سوودمەند بێتو ئەمە خراپەیەکە پێویستە نەهێڵێریتو خەڵکی لێ رزگار بکرێت: ((وجميعهم على اتفاق في ان جميع المشتهيات الموجودة على سطح الارض منحة من الطبيعة و فيض من فيوضها والاحياء في التمتع بها سواء، واختصاص فرد من من الانسان بشئ منها دون سائر الافراد بدعة في شرع الطبيعة، سيئة يجب محوها والاراحة منها)).

بەم جۆرە ئەفغانی قسەی ئەوانە دەگێرێتەوە کە ئەو شتانە نابێت بمێنن بەڵام میسری واتێدەگات ئەفغانی داوای کردووە کۆمیونەکە نەمێنێت ئەمەش بەمەرجێك دەقی قسەکە روونو ئاشکرایە. میسری بەوەش ناوەستێتوپاش ئەوە بەحەماسەتەوە باسی ئەفغانیو یەکسانیو کۆمیونو دەوڵەتی فەرەنسی دەکات: ((با لەوە گەرێین کە ئەفغانی بەکردەوە لەگەڵ یەکسانی نییەو بەدەمی خۆی هاوار دەکا ئەوەی بیەوێ ئیمتیازی تایبەتی نەهێڵێ

دەبێ تەفروتونا بکرێ!! خۆیشی دەهاوێتە سەنگەری جەللادەکانی کۆمۆنەوە.. جارێکی تریش دەیسەلمێنێ کە هاوپەیمانی راستەقینەی فەڕەنسایە. ئەو فەڕەنسایە لەو کاتەدا یەکێك بووە لە دەوڵەتانی کۆلۆنیست..)) تادوای ئەو حەوت هەشت دێڕەی دوای ئەوە.

## بەشی دووەم

# ڕەچەڵەکەکانی بیری ((ئوسووڵی))

فەرموودە، فیقھ و ئوسووڵەکەی، سوننەت، چەند بابەتێکی تر..
تێنەگەیشتن لە بابەتەکانو سەقەتکردنیان..
تەنانەت کە وەك مارکسییەك قسە دەکات
مارکسیەت سەقەت دەکات

**میسری کتێبەکەی کردووە بە شەش بەش، دابەشکردنێکە شێوازێکی زانستیی لە خۆ نەگرتووە. بۆ نموونە بەشی دووەمی بۆ کۆمەڵەی ئیخوان داناوەو بەشەکەی کردووە بە دوو بەشی لاوەکی یەکەمیان بەناوی (ئیخوان ئەلموسلیمون: میراتگری بیری ئوسووڵیەتی ئیسلامی) لەکاتێکدا ئەوەی تریان بازێکە بۆ دەزگایەکی ناو ئیخوان (سیستەمی تایبەت–بەفاشیبوونی ئیخوان).**

**میسری ٩٢ لاپەڕە (ل٢٠١–٢٩٢ چاپی دووەم) بۆ ئەمە دادەنێت، دوای ئەوەش بەشی سێیەم دێت بەناوی (میسر لانکەی بیری ئوسووڵی) کە تەنها ٢٠ لاپەڕەیە (ل٢٩٣–٣١٢) کە گوایە باسی هەلومەرجی ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتیی پشت ژیانەوەی فیکری ئوسووڵییە لە میسر، ئینجا باز دەدات بۆ بابەتی تری پەیوەست بە تەکفیر، ئینجا لە بەشەکەی دوای ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ئیخوان، ئەمجارە سەبارەت بە ئیخوانو تیۆری دەسەڵاتو یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام.. تا دەگاتە دوایەمین بەش بە ناوونیشانی (چەمکی دەسەڵات لە تیۆری حاکمیەت–جاهلیەت). بەم شێوەیە جۆرێك لە**

ناڕێکیی ڕێکخستن‌و تێکەڵوپێکەڵی لە کتێبەکەدا هەیە هەروەها تەرکیز کردن لەسەر هەندێ بابەت، بەشی یەکەمیش کە ئاماژەم بۆ نەکرد دیسان ئەو تێکەڵییەی پێوە دیارە.

ئەوانەی خوارەوە هەڵبژاردەن لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی میسری، بەشی زۆریان پەیوەندییان هەیە بە مێژووی ئیسلام‌و فیقهو فەرموودە... بابەتی تریشیان تێدایە کە دەکرا لە بەشێکی تردا باس بکرانایە، بەڵام لەبەرئەوەی لەو بەشەی کتێبەکەی میسریدا هاتوون لێرەدا هێشتمنەوە.

## سەلەفییەت‌و مەزهەبییەت.. هەڵەی دووبارەکراو

بابەتی یەکەم لە بەشی یەکەمدا بریتییە لە ناوونیشانی (سەرهەڵدان‌و دروستبوونی بزوتنەوەی خەواریج).

پێویستە قسەکردن لەسەر ئەم بەشە، هەروەك قسە لەسەر هەموو کتێبەکە، بەکورتی بێت ئەگینا ئەم ڕەخنەیە دەبێتە کتێبێکی دوو ئەوەندەی کتێبەکەی میسری، لەبەرئەوە هێندە بتوانم شت لە کتێبەکەی میسری دەپەڕێنم هەرچەندە نەفسم پێم دەڵێت هیچیان مەپەڕێنە چونکە هەموویان بۆ وەڵام‌و ڕەخنە خۆش‌و بەتامن. لێرەشدا لەگەڵ کتێبەکەی میسریدا دەڕۆم ئەگەرچی باسەکان لە ڕێڕەوی بابەتەکەش دەربچن.

میسری لەو بەشەدا دەیەوێت بیسەلمێنێت کە ((ئوسووڵیەت))ی نوێ لەگەڵ ((سێ نموونەی مێژووی ئیسلام)) یەکدەگرێتەوە چونکە هەموویان بانگەشە بۆ ((گەڕانەوە بۆ ئەسڵ واتە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوکردن‌و جێبەجێکردنی دەقەکانی شەریعەت (قورئان‌و سوننەت) )) دەکەن(ل٢٥).

ڕەنگە خوێنەر کە دەزانێت باسی یەکەمی کتێبەکە خەوارجە وابزانێت نموونەی دووەم‌و سێیەم بزوتنەوەی هاوجۆری خەوارجن، بەڵام حاڵ وانییەو

نموونە نموونە نییە چونکە ((نموونە))ی دووەم بریتییە لە (تیۆریزەکردنی بیری ئوسووڵی) کە لەڕاستیدا چەند هەوڵێکە لەسەدە یەکەمەکانی کۆچی بۆ بەتیۆرکردنی (سیاسەتی شەرعی) ئەوەش زاراوەی ئەو سەردەمانەیە بۆ کاروباری سیاسیو ئیداریو بەڕێوەبردنی وڵات لە ئیسلامدا. ((نموونە))ی سێیەمی میسریش بریتییە لە (ژیاندنەوەی بیری ئوسووڵی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەمدا) کە دیسان نموونە نییە بەڵکو چەند هەوڵێکە، ئەمجارە تیۆریو عەمەلی، بۆ هەمان مەبەست.

وەنەبێت نموونەی یەکەمیش لەژێر ڕەخنە دەربچێت چونکە بزوتنەوەی خەوارج شتێك نەبوو لە دەرەوەی جەستەی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بێت، فیکرێکی سیاسیی تاکی ناو کۆمەڵگەیەکی بێ فیکریش نەبوو.

کەواتە میسری بە خەوارج دەست پیدەکات، لەو دەستپێکردنەش دوو هەڵەی تر دەکات: یەکەمیان کە خەواریجیشو باقی ڕەوتەکانی تر بە ڕەوتی مەزهەبی ناودەبات (ل٢٦ هەروەها ٢٥)، وشەی مەزهەبیش وشەیەکی هەڵەیە لەناو ئەدەبیاتی عەلمانیی کوردیدا بڵاوەو هەروەکو وشەی (سەلەفی) ویستراوە تەعبیر لە شتێك بکات کە وشەکە بۆی نەك تەنها هەڵەیە بەڵکو شایەنی پێکەنینیشە. مەزهەبیەت لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا بریتییە لە پابەندبوون بە مەزهەبێکی فیقهیی دیاریکراوەوە، هەندێك جاریش ئەو مەزهەبیەتە دەبێتە دەمارگیری. بەرامبەر بە مەزهەبیەتیش نامەزهەبیەت هەیە کە مەبەست لێی پابەندنەبوونە بە مەزهەبێکی فیقهییەوە بەڵکو پابەندبوون بە فەرموودە صەحیحەکانەوە (بێگومان پاش قورئان).

سەلەفیەتیش جۆری هەیە: سەلەفیەتی زانستی کە بایەخ بە فەرموودەو فیقهو عەقیدە دەداتو دوورەپەرێزە لە سیاسەت. بەشێك لەو سەلەفیانە

تەنانەت دژ بە حزبە ئیسلامییەکانیشن چونکە بە باوەڕی ئەوان حزبی ئیسلامی بیدعەیە واتە داهێنانێکە لە ئیسلامدا نییە. بەشێکیش لەو بەشە لەقەناعەتی خۆیانەوە حزبی ئیسلامی بە بیدعە دەزانن (هەرچەندە بەپێی ئەزموونی خۆم باوەڕم نییە ئەوە قەناعەت بێت بەڵکو وای بۆ دەچم کاردانەوەیە دژی حزبە ئیسلامییەکان)، لەکاتێکدا ئەوانی تر لەبەر خزمەتی دەسەڵات ئەو دژایەتییە دەکەن کە ئەمەش نەك تەنها لە کوردستان بەڵکو لەهەموو وڵاتاندا هەیەو لە (سعوودیە) دیارترە چونکە دەسەڵات لەوێدا حزبە ئیسلامییەکان بە هەڕەشە دەزانێت، بەتایبەتی پاش ئەوەی بەشێك لەو حزبانە دژایەتیی خۆیان بۆ نیزامی فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتە ئاشکرا کرد، بۆیە بەشێك لە زانا یان بانگخوازە سەلەفییەکان دژ بە حزبە ئیسلامییەکان قسە دەکەن، بێگومان بەشێکی تری زانایانیش لەوێدا کەم تا زۆر نەیاری دەسەڵاتن‌و ئەوانە باوەڕیان وایە کە کاری ڕێکخراوەیی لە ئیسلام واجبە یان بەلای کەمەوە شتێك لەخوار واجبەوەیە.

جۆرێکی تری سەلەفییەت بریتییە لە تێکەڵکردنی سەلەفیەت بەکاری سیاسی‌و جۆرێکی تریش سەلەفیەت‌و جیهاد تێکەڵی یەکتری دەکات‌و پێی دەوترێت (سەلەفیەتی جیهادی). هەردوو جۆری سەرەکیی سەلەفییەتیش لەسەر ئەوە ڕێکن کە دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئیسلامدا بەپێی تێگەیشتنی (سەلەفی صالح) بێت بەتایبەتیش لە بواری عەقیدەدا.

هەروەك چۆنیش وشەی (مەزهەبیەت) بۆ کەسانێك بەکاردێت کە نایانگرێتەوە وشەی (سەلەفیەت) بۆ کەسانێك بەکاردێت کە بەشێکیان سەلەفین‌و ئەوانی تر کەم تا زۆر لە سەلەفییەتەوە دوورن. بۆ نموونە ئیخوان وەکو کۆمەڵەو وەکو فیکر سەلەفی نییە چونکە لە بواری (عەقیدە)دا

هەموویان سەلەفی نین، لەبواری کاری تریشدا زۆربەیان سەلەفی نین، بۆیە دابڕانی وشەی سەلەفییەت بەسەر ئیخواندا بەشێك لە ئیخوان تووڕە دەکاتو هەموو سەلەفییەکان دەخاتە پێکەنین، هەندێکیش لەو سەلەفییانە (ئەگەر چی زۆر کەمیش بن) تەنانەت قسەی ناشیرین بە سەرانی کۆنی ئیخوانو بەتایبەت سەید قوتب دەڵێن.

## لەبارەی خەوارجەوە

هەڵەی دووەمی دێڕی یەکەمو دووەمی بەشی (خەوارج) قسەکەی میسرییە کە گوایە بەر لە خەوارج هیچ ڕەوتێکی ((مەزهەبی)) لە مێژووی ئیسلامیدا ئەوەندەی ئەو بزوتنەوەیە پابەندی حوکمی قورئان نەبووە(ل٢٦) کە ئەمە قسەیەکە لەهیچ کتێبێکی مێژوودا نایبینی. خەوارج زۆرترین کەس بوون قورئانیان دەخوێندەوە، عیبادەتیشیان لەخەڵکی تر زیاتر بوو بەڵام ئەمەیان شتێکەو پابەندبوون بە حوکمی قورئان شتێکی ترە. خەوارج بەپێی ئەو فەرموودەیەی پێشبینیی پەیدابوونیان دەکات زۆرترین قورئانخوێندنو عیبادەتیان هەیە بەڵام وەکو دەرچوونی تیر لە کەوان لە ئاین دەردەچن چونکە لە قورئان تێناگەنو لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات. ئەگەر بشڵێین خەوارج کەمتر کاریان بە سوننەت دەکرد ڕاست دەڵێین چونکە هیچ کام لە صەحابییەکان، دیاریشە صەحابییەکان هەڵگری سوننەت بوون، لە ناو خەوارجدا نەبوون بەڵام دیسان ئەوە ((پابەندبوونی زۆرتر)) بە قورئان ناگەیەنێت.

میسری کە قسەی سەرەوەی کردووە بۆ تەئکیدکردن لەسەر ئەو قسەیە دەنووسێت: ((تەنانەت مێژوونووسێکی ئیسلام سەرەتاکانی ئەم ڕەوتە دەباتەوە بۆ سەردەمێك پەیامبەر خۆی لە ژیاندا بووە)(ل٢٦)، بەڵام ئەمە

تەئکیده لەسەر ئەوەی میسری لەخۆیەوە شتی نووسیوە چونکە ((بەر لە خەوارج)) سەردەمی پێش شەڕی عەلیو موعاویە بەرەوژوور تا دەگاتە سەردەمی پێغەمبەر دەگرێتەوە ئیتر چۆن دەتوانین بۆ ئەو کاتە بڵێین ڕەوتی مەزهەبی لەو سەردەمەدا هەبوون؟ ئەی کامانەن ئەو ڕەوتانە؟ ئەو کاتە تەنانەت شیعەش پەیدا نەببوون چونکە کەس بە لایەنگرانی عەلیی نەدەوت ئەوانە شیعەن، شەڕی عەلیو موعاویەش شەڕ بووە لەسەر شەرعیەتی دەسەڵات نەك شەڕێکی مەزهەبی.

میسری بۆ قسەی دووەم، واتە هەبوونی خەوارج لە سەردەمی پێغەمبەردا، باسی (ذو الخويصرة) دەهێنێت کە بە پێغەمبەری وتبوو (لە خوا بترسە)..تاد. میسری قسەکە بۆ دوو سەرچاوە دەگەڕێنێتەوە کە یەکێکیان (الملل والنحل، ج ١ ل ١١٥)ی[1] (شەهرستانی)یە لەکاتێکدا ئەو چیرۆکە لای شەهرستانی نییەو تەنها ئەوەی تێدایە کە ناوبراو یەکەم کەسی خەوارج بوو.

میسری چیرۆکێکی تر دەگێڕێتەوە لەبارەی فەرمانی پێغەمبەر کە کابرا بکوژرێت بەڵام ئەبوبکر بۆی نەکوژرا چونکە بینی نوێژ دەکات، عومەریش هەروا، لەکاتێکدا عەلی کە چووبوو بۆ کوشتنی بینی لەو شوێنەدا نەماوە.. هەرچەندە چیرۆکێکی وا هەیە بەڵام دیسان لای شەهرستانی نییە.. ڕیوایەتی صەحیحیش هەن بە جۆرێکی دیکەن، یەکێك لەوانە تێیدا هاتووە خالد کوڕی ئەلولید داوا دەکات بیکوژێت بەڵام پێغەمبەر دەڵێت نەخێر نەوەکو کەسێکی نوێژکەر بێت (واتە سەرباری قسە نابەجێکەی نوێژکردن دەیپارێزێت)، خالدیش دەڵێت: چەند کەس هەن نوێژ دەکەنو ئەوەی بە

[1] لاپەڕە ١٧٣ ی چاپی لای خۆم.

زمان دەیڵێن بە دڵ نایڵێن، پێغەمبەریش پێی دەڵێت: فەرمانم پێنەدراوە دڵی خەڵك بگەڕێم یان سكیان هەڵبدڕم.[٢]

## ناكۆكییەكانی نێوان موسڵمانان

میسری چونكە شارەزایی لە مێژووی ئیسلام نییە قسەیەك دەكات گوایە خاڵە بەسەر مێژوونووسانی ئیسلام گرتوویەتی: ئەو باس لە ناكۆییەكانی ناو موسڵمانان دەكات كە مەسەلەی دەسەڵاتو ڕابەرایەتی یەكێك لە هۆیە سەرەكییەكانی ناكۆكی بوو و ((تەنانەت مێژوونووسانی ئیسلام نەیانتوانیوە خۆیانیان لەو دیاردەیە ببوێرن))(ل٢٧). مێژوونووسانی ئیسلام لەو قسەیەی میسری بێئاگان چونكە بەلایانەوە ئاسایی بووە باسی ئەو ڕووداوە بكەنو یەكێكی وەك تەبەری هەرچییەكی دەستكەوتووە تۆماریكردووە، خۆ ئەگەر بیانویستایە ئەو باسانە پشتگوی بخەن كێ دەستی دەگرتن؟ ڕاستە تەرەفگیری لە كاری هەندێك لەو مێژوونووسانەدا دیارە، بەڵام سەرجەمی مێژوونووسینی ئیسلامی دوورە لەو مەنهەجی مێژوونووسینەی لە میللەتانی تر دیارە، مەبەست ئەوانەی تێیاندا مێژوونووسین بریتی بووە لە كارنامەی پادشایان هەروەك لای ئاشورییەكانو بابلییەكانو فارسەكان. سەربەخۆیی مێژوونووسینی ئیسلامی هاوشێوەی لە مێژوونووسینی یۆنانو ڕۆمای كۆندا هەبووە.

میسری ئینجا باسی چەند نموونەیەكی ناكۆكیی نێوان موسڵمانان دەكات(ل٢٧ بەدواوە) ناشزانین چاوەڕێی چی دەكرێت؟ كۆمەڵگەی موسڵمان هیچ ناكۆكیەكی تێدا نەبێت؟ قورئان خۆی باسی ناكۆكیی مرۆڤەكانی

---

[2] صحيح تاريخ الطبري، ٢، ص٣١٠-٣١١، پەراوێزی موحەققیق، صحيح البخاري، ج٥، كتاب المغازي، صحيح مسلم، ج٣، كتاب الزكاة، باب ذكر الخوارج وصفاتهم.

کردووە کە ویستی خودای لەسەر بووە، پێغەمبەریش باسی دواڕۆژی بۆ موسڵمانانی سەردەمی خۆی کردووە کە ناکۆکیو تەنانەت خوێنڕشتنیش دەکەوێتە ناو موسڵمانان، ئاشکراشە ئەمە واقعیترە لەو وێنەیەی بۆ دواڕۆژێکی بێ ناکۆکی دەکێشرێت.

## ئاژاوەکەی کاتی عوسمان کوڕی عەففان

موبالەغە نیشانەیەکی ڕەخنەی نازانستییە. میسری ئەو موبالغانە دووبارە دەکاتەوە:

میسری دەنووسێت: لە سەردەمی عوسماندا خەلیفە بەپێش چاوی خەڵکەوە لەهەمووان زیاتر هەڵپەی سامانو دارایىو ماڵی دونیای دەکرد(ل٣٢).

ئەمەش زانیاری نییە بەڵکو وێنەیە چونکە ئەوانەی دژ بە عوسمان وەستابوونەوە ڕەخنەی تریان لێدەگرت وەك: عوسمان نوێژی کورت نەدەکردەوە (کورتکردنەوەی نوێژ بریتییە لە کردنی دوو ڕکعات لەجیاتی چوار بۆ موسافر) کاتی سەفەرکردنی بۆ مەککە، پێغەمبەر (ئەلحەکەم)ی نەفی کردبوو و عوسمان گەڕاندییەوە، عوسمان بەرپرسیارێتیی دەدایە گەنجەکان... عوسمان وەڵامی هەموو ئەوانەی دایەوە، ئەوەش کە پەیوەندیی بە لایەنی دارییەوە هەیەو گرنگە باس بکرێت ڕەخنەکەیان کە پارەی دەدایە خزمانی خۆی، ئەویش وەڵامی دایەوە کە ئەو بەخششەی لە ماڵی خۆی نەك لە بەیتولمال دەدا، هەروەها ڕەخنەکەیان کە پاوانی فراوان کرد، وەڵامی ئەویش ئەوە بوو کە ئەوە پێش خۆی کرابوو و بۆ لەوەڕی ئاژەڵەکانی زەکات بوو و کاتێك ئاژەڵەکانی زەکات زیادیان کرد ئەویش فراوانی کرد، وتیشی هەموو کەسێك دەزانێت کە کاتێك ئەو بووە خەلیفە

زۆرترین ژمارەی حوشترو مەڕی هەبوو بەڵام ئێستا (واتە پاش دوانزە ساڵ خیلافەت) تەنها دوو حوشتری ماوە کە بۆ سەفەری حەجکردنی خۆی دایناون.[٣]

ئیتر خوێنەر خۆی ئەو ڕەخنانەی دوژمنانی عوسمانو وەڵامی عوسمان بەراورد بکات لەگەڵ قسەکەی میسری ((عوسمان بە بەرچاوی خەڵکەوە لەهەمووان زیاتر هەڵپەی سامانو داراییو ماڵی دونیای دەکرد)) بۆ ئەوەی بزانێت کە وشەی وڕێنە وەسفی پڕبەپێستی ئەو جۆرە قسانەیە.

بێگومان هەڵوێستی دروست لە فەرمانڕەوایی عوسمان نابێت لە جۆری ڕەخنەکانی دوژمنانی بێت، ناشبێت وەك هەڵوێستی ئەوانە بێت بەدوای بەهانەی دوور لە واقعدا دەگەڕێن وەك باسکردنی (عەبدوڵڵا کوڕی سەبەء) کە جوولەکە بوو و موسڵمان ببوو کە گوایە سەرچاوەو هۆی سەرەکیی ئاژاوەکە بوو. لاوازیی ئەو تەفسیرە لەوەدایە وەڵامی ئەو پرسیارە مەنتقییە ناداتەوە: ئەگەر کۆمەڵگەی موسڵمان ئامادەی ئاژاوەکە نەبێت چۆن پیلانی تاکە کەسێك بەو شێوەیە کاری تێدەکات؟

لەبەرئەوەش کە باسکردنی هۆکانی ئاژاوەی کاتی عوسمانو دوای ئەو کاتە پێویستە بەڵام لەهەمان کاتدا دەرچوونە لە مەبەستی کتێبەکەمان ناچارین تەنها بەکورتی بەشێکیان بخەینە ڕوو:

١ –فراوانبوونی وڵات: فەزیڵەت لەناو شارێکی بچووکدا زیاتر لە وڵاتێکی گەورە دەپارێزرێت. فراوانیی وڵات بەو شێوەیەی دەوڵەتی خیلافەت کە لە نزیك چینەوە تا ئەندەلوس درێژ بووەوە سەدان کێشە لەگەڵ خۆیدا

[٣] بڕوانە صحيح تاريخ الطبري، ٣، ص٣٢٨ بەدواوەو بڕوانە لێدوانی موحەققیقی کتێبەکە، د. موحەممەد بەرزنجی، لەسەر ئەوە، ل٣٢٩ بەدواوە.

دەهێنێت.

٢ –ئاژاوەگێڕەکان سوودیان لە نەرمیی عوسمان وەرگرتبوو. ئەوانە نەیاندەتوانی بەو جۆرە لە سەردەمی عومەردا ڕەفتار بکەن ئەویش نەك لەبەر ئەوەی عومەر ڕەخنەی قبووڵ نەدەکرد (نموونەش هەن لەسەر ڕەخنەگرتن لێی) یان گوێی بۆ کەس نەدەگرت (زانراویشە چەند جارێك والییەکان بەتایبەتی هی کووفەی لەسەر داوای خەڵك دەگۆڕی) بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕێگەی بە ئاژاوە نەدەدا.

٣ – دەوڵەمەندبوونی کۆمەڵگە: دەوڵەمەندی هەروەك هەژاری لە بارودۆخێکی دیاریکراودا دەرگای گەندەڵی دەکاتەوە. نیشانەیەکی گەندەڵیی کۆمەڵگە بریتییە لە دنیاویستی. عومەر ڕێگەی بەوە نەدەداو نەرمیی نەدەنواند، خۆیشی کردبووە نموونە بۆ کەسانی خوار خۆی. ئەو تەنانەت نەیدەهێشت تیرەی قورەیش، هەرچەندە خۆشی قورەیشی بوو، ببنە کەڵەگا بەسەر موسڵمانانەوە، بەڵام عوسمان نەرمیی نواندو کەسانێکی زۆر هەبوون سوودیان لەو نەرمییە وەرگرتبوو.

٤ – تاقمی کاریگەر: چ لە کۆمەڵگەی موسڵمانانو چ لە حزبە ئیسلامیەکانیش چوار تاقمی سەرەکی هەن: مەبدەئییە میانڕەوەکان(بە واتا ئیسلامییەکەی میانڕەوی)، مەبدەئییە پەڕگیرەکان، دونیاویستەکان، پاشان ئەوانەی هەڵوێستی دیاریکراویان نییەو تەماشای سێ تاقمەکە دەکەن. لە حاڵەتی عوسماندا تاقمی دووەمو سێیەم کاریگەرتر بوون، دنیاویستەکان چالاك بوون، دنیاویستەکانیش دەوری عوسمانیان دابوو و دوای کوشتنی قەزییەکەیان هەڵگرت. مەبدەئییە پەڕگیرەکان هەموو لایەنێکیان ڕەفز دەکردو دەیانویست دیدی خۆیان بسەپێنن، بەڵام مەبدەئییە میانڕەوەکان

کە زۆربەی صەحابییەکان بوون لەو کێشەیەدا چالاك نەبوون ئەویش لەسەر داوای عوسمان کە قبوولّی نەدەکرد خوێنی کەس لەبەر پاراستنی ژیانی ئەو برِێژرێت. عوسمان نیوەی ڕێگەکەی هەلّبژارد، لەلایەك لەبەر هەیبەتی خیلافەت لەسەر کار لانەچوو، لەلاکەی تریش نەیویست کەس بە شەڕ دیفاعی لێبکاتو خوێنی موسلّمانان برِێژرێت. بەم شێوەیە مەبدەئییەکان کە لەئەسلّدا حەزیان بەو ئاژاوەیەی نێوان موسلّمانان نەدەکرد زیاترو زیاتر، بەهۆی فەرمانەکەی عوسمان، دەستیان گیرابوو، لەئەنجامیشدا تەنها دونیاویستەکانی دەوری عوسمانو مەبدەئییە پەرگیرەکان مانەوە، ئەو دوو تاقمەش بەسن بۆ ئاژاوەنانەوە.

## جیاوازیی چینایەتی

میسری پشت بە نەشارەزایی خۆیەوە دەبەستێتو دەلّێت: سەرکردەکان کە زۆربەیان لە یارانی پێغەمبەر بوون هەرچی خۆشیو لەزەتێکی دونیایی هەبوو بۆ خۆیان فەراهەمیان کرد(ل٣٢).

با بزانین ئەمە چۆن بوو.

ئەوە ڕاستە ئەگەر دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ ڕێگەی بە سەرکردەیەك دەدا لە سەربازەکان زیاتر وەربگرێت، بەلّام زانراوە کە بەشی گەورەی دەستکەوتەکانی شەڕ کە دەکاتە چوار لەسەر پێنج بەسەر جەنگاوەراندا دابەشدەکراو باقییەکەی دەگەڕایەوە بەیتولمال. جگەلەو نەزانییەش میسری نازانێت جیاوازیی نێوان دەستکەوتەکانی شەڕ کە بەسەر جەنگاوەراندا دابەش دەکرانو (عطاء) چییە بۆیە دێت شێوەی دابەشکردنی (عطاء) دەنووسێت کە تەنها لەکاتی عومەردا جیاوازیی تێدا بوو و وادەزانێت ئەمە دەستکەوتەکانی شەڕە. ئەو دەنووسێت کە دابەشکردنی غەنیمەکانی

شەڕ لە سەردەمی فتوحاتدا دەبوایە ڕەچاوی سێ بنەمای بکردایە: یەکەم پلەی خزمایەتی لە پێغەمبەر، دووەم سەردەمی موسڵمانبوونو ئاستی خزمەت بە ئیسلام، سێیەمیش ئەو کەسانەی ڕابوردوویەکی باشیان نەبووە بەڵام ئازابوونو لە جیهاددا دەوریان هەبووە(ل٣٢).

پێویستمان بە نەفەسێکی درێژە بۆ وەڵامی ئەم تێکەڵییەی کە میسری بە نەشارەزایی خۆی کردوویەتی:

یەکەم –ئەو سێ بنەمایەی باسی کردوون یەك ئاستیان نەبووە، واتە کۆمەڵەی یەکەم زۆرتریان وەرگرت، دووەم کەمتر، سێیەم کەمتر، بەم شێوەیەش دەبوایە خزمانی پێغەمبەر دەوڵەمەندترین کەس بوونایە بەڵام ئەمە ڕاست نییە لەبەرئەوەی ئەو پارەیەی بەو کەسانە دەدرا (عطاء) بوو واتە مووچەی ساڵانە کە هەموو موسڵمانێك گەورە بێت یان بچووك، پیاو بێت یان ئافرەت وەریدەگرتو جیاوازیی ئەو مووچە ساڵانەیە ئەو جیاوازییە گەورەیە نەبوو کە ببێتە هۆی ئەوەی سامان لە ((چنگی توێژێکی کۆمەڵایەتیدا کۆبکاتەوە)) وەك میسری دەڵێت.

عومەر زۆرتری دەدا بە نزیکترین کەسانی پێغەمبەر وەك ژنەکانی کە بەپێی هەندێك ڕیوایەت یەکی دە هەزار (یان دوانزە هەزار) درهەمی پێ دەدان، هەروەها خزمانی نزیکی پێغەمبەر وەکو عەبباسی مامی کە ٢٥ هەزاری دەدایەو لە ڕیوایەتی تر ١٢ هەزار بوو، تا خزمایەتییەکەش دوورتر دەکەوتەوە کەسەکان کەمتریان بەردەکەوت،[4] پاشان ئەو کەسانەی بەشدارییان لە شەڕی بەدر کردبوو کە یەکی پێنج هەزار درهەمیان پێدەدرا، دواتر ئەوانەی دوای شەڕی بەدر تا صوڵحی حودەیبیە (چوار هەزار

---

[4] خزمانی پێغەمبەر بۆیان نەبوو زەکات وەربگرن.

درهەم)... تا دەگەیشتە ئەوانەی دووسەد درهەمیان وەردەگرت. بڕی ئافرەتانیش جیاواز بوو: ژنانی شەڕی بەدر پێنجسەد درهەم (واتە بەپاڵ ئەوەی مێردەکانیان پێنج هەزاریان وەردەگرت ئەوانیش ئەو بڕەیان بەردەرکەوت ئەگەرچی بەشداریی شەڕەکەیان نەکردبوو)، پاشان بڕەکە بۆ ئەوانی تر دەبووە چوارسەد تا دەگەیشتە دوو سەد درهەم وەکو پیاوانی تر، منداڵانیش یەکی سەد درهەم بوو..[5]

ئەو جۆرە دابەشکردنە، وەك وتمان، تەنها لەسەردەمی عومەردا بووە، لەکاتێکدا سێ خەلیفە ڕاشیدەکەی تر ئەو جیاوازییەیان نەدەکرد. بەڵگەی عومەریش لەسەر ئەو ئیجتیهادەی ئەوە بوو ناکرێت ئەو پارەیەی بە کەسێکی دەدات کە کاتی خۆی شمشێرەکەی دژ بە پێغەمبەر هەڵدەگرت ئەوەندەی ئەو پارەیە بێت کە بە کەسێکی دەدات بە شمشێرەکەی بەرگریی لە پێغەمبەر دەکرد. بەڵام وەك وتمان هێشتا لە هەردوو حاڵەتەدا جیاوازییەکە ئەو گەورەیە نەبوو و بڕەکە ئەو زۆرە نەبوو سامان بخاتە دەست کەسانێکی دیاریکراو. سیاسەتی دارایی عومەریش نەهێشتنی خڕبوونەوەی سامان لەدەستی کەسانێکی کەمی کۆمەڵگە بوو، لەبەرئەوەش بوو قبووڵی نەکرد زەوییەکان سەوادی عیراق بەسەر جەنگاوەراندا دابەش بکات چونکە دەیوت ئەو کەسانەی بەشداریی فتووحاتیان کردووە هەموو زەوییەکە دەبەنو نەوەکانی دوای ئەوان کە دێن دەبینن زەوی لەدەستی کەسانێکی دیاریکراوی کەمدانو خۆیان خاوەنی هیچ نین. عومەر زەوییەکانی لەدەستی خاوەنەکانیان هێشتەوەو خەراجی خستە سەریان تا ئەو خەراجە

[5] بڕوانە صحیح تاریخ الطبري، ٣، ل ٢١٣ بەدواوە هەروەها تەعلیقی بەرزنجی.. ڕیوایەتەکان جیاوازیی بڕیان تێدایە.

بەسەر هەموو موسڵماناندا دابەش بکرێت، بەم شێوەیەش نەوەکانی دوای نەوەی جەنگاوەرانو منداڵەکانیان لەو داهاتە گشتییەی دەوڵەت سوودمەند دەبن.

دووەم–میسری بێئەوەی بەخۆی بزانێت شتێكو دژەکەی لەیەك لاپەڕەدا دەڵێت. ئەو باسی ئەو ئیمتیازانەی گوایە عوسمان دابووی بە (بەنو ئومەییە) بەتایبەتیو قورەیش بەگشتی ئینجا باس دەکات کە چۆنێتیی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ حەقیقەتی ئەو سیاسەتەی عوسمان دەردەخات(ل٣٢) ئینجا هەر میسری خۆی وەك لەسەرەوەدا باسم کرد باسی سێ بنەمای دابەشکردنەکە دەکات کە تەنها سێیەمیان خزمانی عوسمان دەگرێتەوە ئەویش بەشێوەیەکی زۆر کەم (ئازایەتیو دەوری گەورە لە جیهاددا)، دووەمیش دیسان کەمێك لە خزمانی عوسمان دەگرێتەوە چونکە تەنها بەشێکی بەنو ئومەییە لە موسڵمانە کۆنەکان بوون، دیارە بەشی یەکەمیش بەنو ئومەییە ناگرێتەوە چونکە تیرەی بەنوهاشم خزمانی ڕاستەوخۆی پێغەمبەر بوون (پێغەمبەریش بەنو عەبدولموتتەلیبیشی خستە ناو ئەو خزمی ڕاستەوخۆی خۆی).

میسری دەیەوێت بەزۆر بڵێت سیاسەتی عوسمان سامان لەدەستی بەشێکی کۆمەڵگەدا خڕکردەوە، خواستی لەم جۆرەش لەگەڵ نەزانی کە تێکەڵ بەیەك دەبن شتی عەجیبیان لێ دروست دەبێت.

هەرئەو خواستەو ئەو نەزانییەشە وای لێکرد لە لاپەڕەی دوای ئەوە بڵێت بانگەشەی خەواریج لەناو ئەوانەدا بڵاوببووەوە کە درەنگ چووبوونە ناو ئیسلامو لە شەڕو شۆڕی فتوحاتدا شتێکی ئەوتۆیان پێ نەبڕابوو(ل٣٣) هەر لەو لاپەڕەیەشدا دەڵێت (بەنو تەمیم)و (بەکر) لەڕیزی پێشەوەی ئەوانەدا

بوون کە بە خەوارجەوە پەیوەست بوون، ئینجا دەڵێت: ئەم خێڵانەش نە بە خزمایەتی دەگەیشتنەوە پێغەمبەرو نە لە پرۆسەی بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو(ل٣٣) بەم شێوەیەش بازنەی نەشارەزایی دادەخرێتو جگە لە سەرسوڕمان هیچمان بۆ نامێنێتەوە.

ئێمە دەپرسین: بەڵی ئەوانە بوون بە خەوارج، بەڵام یانی چی دەورێکی وایان لە فتووحاتدا نەبووە؟ ئایا کەی فتووحات لە دەرەوەی وڵاتی عەرەب دەستی پێکرد؟ فتووحاتی عیراقو شامو میسرو ئەوانەی دوورتر لەسەردەمی ئەبوبەکرەوە دەستیان پێکرد ئەویش پاش سەرکوتکردنی یاخیبوونی عەرەبی لە نیمچەدورگەی عەرەب، لەوەش بەدواوە هەموو عەرەب لە فتووحاتدا بەشدارییان کرد ئیتر کێ درەنگو کێ زووتر بەشداریی کرد؟ درەنگو زوویی ماوەیەکی زۆر کەم بوو. لەبەرئەوەش کە میسری ئەو ڕاستییەی نەزانیوە دەرکی بە واتای ئەو وشەیەی سەرکردەی خەوارج نەکردووە کە وەڵامی (سەعید کوڕی ئەلعاص)ی دابوو و پێی وتبوو تۆ دەتەوێت جێگا نووکی ڕمی ئێمەو ئەوەی خودا پێی بەخشیوین بکەیتە باخچەی خۆتو خێڵەکەت (میسری، هەمان لاپەڕە). واتە سەرکردەی خەوارج وتبووی کە ئەوان بوون کە عیراقیان گرتبوو.

## دوو (( نموونە ))یەکەی تر

ئەوانەی سەرەوە بەسنو لەکۆتایی باسی خەوارجدا تەنها ئەوە دەڵێم گوایە ڕەخنەکەی میسری (سۆسیۆلۆژییە) بەڵام تەنها لە باسی خەوارجدا خۆی لە کۆمەڵناسی دەدات ئەویش زۆر بەسووکیو بەسەرپێییو بێ قووڵبوونەوە، بەڵام کە دواتر دەچێتە سەر گرووپە ئیسلامییە نوێو هاوچەرخەکان بەلای کۆمەڵناسیدا ناڕواتو بابەتەکەی دەبێتە هێرشو

ڕەخنە چونکە ئەمانە هاوچەرخن و پێویستە ((پشتیان بشکێنرێت))، ئەو بەهانانەش کە بەدەستی خەوارجەوە هەبوون، کە ئەوانە دژی ستەم و دژی جیاوازیی چینایەتی..تاد بوون، لە بابەتی کۆمەڵە ئیسلامییە نوێ و هاوچەرخەکان دەبنە هەڵم و کۆمەڵە ئیسلامییەکان دەبنە توندڕەو و تیرۆریست و هیچ بەهانەیەکیان بۆ نامێنێت.

ئایا مەسەلە ڕقی پێشوەختی میسرییە لەو بزوتنەوانە یان مەسەلەکە ئەوەیە ئەو سەرچاوانەی کە میسری شتی لێ نەقڵ کردوون بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ هەردوو زەمەنی خەوارج و سەردەمی ئێستا کردووە و میسری بێئەوەی ئاگای لێ بێت هەمان مامەڵەی کردووە؟ وای بۆ دەچم ئەمەشیان و ئەوەشیان بێت.

پاش تەواوکردنی باسی خەوارج میسری دەچێتە سەر دووەم ((نموونەی بەرجەستە لە مێژووی ئیسلام)) بۆ ئەوەی دواتر ئەمەو دوو نموونەکەی تر لەگەڵ ((ڕەوتە مەزهەبییەکان))ی ئەم سەردەمەمان بەراورد بکات تا ((بیسەلمێنێت)) کە بنەما فیکرییەکانیان یەکدەگرنە، بەتایبەت کە ئەو ڕەوتانە بانگەشە بۆ گەڕانەوە بۆ ئەسڵ، گەڕانەوە بۆ جێبەجێکردنی دەقەکانی شەریعەت، دەکەن(بڕوانە ل٢٥).

بەرلەوەش ئەو ((نموونە دووەمە بەرجەستەیە)) بناسین پێویستە بپرسین نموونەی بەرجەستە لەسەر چی؟ میسری هیچ ناڵێت. ئەمانە تەنها نموونەن و بەس ئەگینا ناتوانین هەرسێکیان بخەینە ناو لیستی یەك شت چونکە خەوارج فیکر بوو هەروەها چەند گرووپێك بوو. ((نموونەی دووەم)) لای میسری بریتییە لەو فەقیهانەی باسی فەرمانڕەواییان کردووە: (غەزالی، ماوەردی، شافعی). ((سێیەم نموونە))ش بزوتنەوەیەکی فیکری بوو لە

سەدەی نۆزدەمدا خۆی لەچەند کەسایەتییەکدا دەبینییەوە: (ئەفغانی، عەبدە، ڕەزا)و لەهەندێ حاڵەتدا بزوتنەوەکە دەبووە ڕەوتێکی سیاسی. ئەگەر مەبەستیشی نموونەن لەسەر ((ئوسوولییەت))و ئەگەر ئەمانە لە مەسەلەی گەڕانەوە بۆ ئەسڵ، واتە جێبەجێکردنی دەقەکانی شەریعەت (قورئانو سوننەت) یەکدەگرن (وەك لە لاپەڕە ٢٥ باسی دەکات)، ئەو کاتە هەڵەیەکی گەورەتر دەبینین چونکە ئەگەر کۆمەڵە نوێکان بیانەوێت شەریعەت جێبەجێ بکەن، ڕەوتە کۆنەکانو فەقیهە کۆنەکان کەمتر بەوە ناسراون چونکە وجووبی جێبەجێکردنی دەقەکانی شەریعەت لە سەردەمە کۆنەکاندا جێگەی موناقەشە نەبوو، پاشانو سەبارەت بە خەوارج ئەوان بە گەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەت نەناسرابوون لەبەرئەوەی قورئانو تەفسیرەکەیو سوننەتو فەرموودەکان لای صەحابییەکان هەبوون نەك لای خەوارج. سەبارەت بە فەقیهانیش دیسان مەسەلەی جێبەجێکردنی شەریعەت تەرح نەکرابوو چونکە جێگەی موناقەشە نەبووە، تەنها ڕەوتە ئیسلامییە نوێکان دەگونجێت بە داواکاری جێبەجێکردنی شەریعەت ناوببرێن، لەکاتێکدا گەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەت داواکارییەکی فراوانترەو پێش ئەوانیش هەبووە بەڵام بۆ مەبەستی جیاواز؛ کۆنەکان داوایان دەکرد ئەو گەڕانەوەیە هەبێت بۆ نەهێشتنی بیدعە لەلایەكو بۆ کەمکردنەوەی زاڵبوونی مەزهەبی فیقهی بەسەر سوننەت، لەلایەکی سێیەمیشەوە بۆ پاککردنەوەی عەقیدە لە (علم الكلام)و پاککردنەوەی ئیسلام لە فەلسەفە..تاد.

## شێواندنی مارکسیەت

هەروەکو باسی خەوارجیش ناکرێت دێر بەدێری کتێبەکەی میسری ڕەخنە لەو دێرانە بخرێنە بەردەم خوێنەرو ناچارم تەنها چەند شتێك لەو

باسە هەڵبژێرم.

میسری دەیەوێت وەکو مارکسییەك قسە بکات، میسریش نەك تەنها وەکو مارکسییەك ناژی بەڵکو فیکری مارکسیش دەشێوێنێت. میسری دەنووسێت: ((دەوڵەتی خیلافەت کە بەحەق ئاوێنەی پەیوەندیی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی بوو، سیستەمێکی سیاسیی گونجاوی بۆ خۆی فەراهەم کرد))(ل٤٧).

بەپێی تیۆری مارکس بونیاتی کۆمەڵایەتی (کە زیاتر مەبەست لێی بونیاتی ئابوورییە) ژێرخانە کە سەرخانی خۆی بەرهەمدەهێنێت، ئەو سەرخانەش خۆی لە یاسا فیکرو فەلسەفەو هونەرو ئاین.. تادوادا دەبینێتەوە، لەناو ژێرخانیشدا هۆکانی بەرهەمهێنانی هەن کە گەشەسەندنی ئەمانە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دیاری دەکەن، بۆ نموونە لە سیستەمی کۆیلایەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان (ئامێرەکان، هەروەها مرۆڤەکان) لە ئاستێکی دیاریکراوی پێشکەوتندا بوونو بەپێی ئەو ئاستەش پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی ئەو سیستەمە بریتی بوون لە پەیوەندیی نێوان کۆیلەو خاوەن کۆیلەکان، واتە دوو چینی جیاواز کە پەیوەندیی نێوانیان بریتی بوو لەبەکارهێنانو چەوساندنەوە، ئەم ژێرخانەش بوو کە یاساو فەلسەفەو ئاینو هونەرێکی بەرهەمهێنا کە جیاواز بوو لە قۆناغەکەی پێشوو (مەشاعیەتی سەرەتایی)و قۆناغەکەی دوای (دەرەبەگایەتی).

میسری کە دەیەوێت مارکسییانە قسە بکات ئەوە بەسەریەکدا هەڵدەگێڕێتەوەو دەڵێت کە سیستەمی فەرمانڕەوایی خیلافەت بەرهەمی (واتە سەرخانی) پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی ئەو کاتە بوو (کە ئەمە مارکسییەتێکی دروستە) بەڵام ئەو سەرخانە (کە بۆ خۆی سیستەمێکی

سیاسییە) سیستەمێکی سیاسیی گونجاوی بۆ خۆی بەرهەمهێنا (کە ئەمە مارکسییەتێکی سەقەتکراوە).

میسری ئەم جارەی تریش مارکسیەت دەشێوێنێت؛ ئەو دەڵێت کە موجتەهیدان فەتوایان بۆ خزمەتی سیاسەتی ڕەسمیی دەسەڵاتداران دەدا، لەسایەی ئەو بارودۆخەشدا پەیوەندیی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاوازتر دەبوو. هێزی بەرهەمهێن بەپێی ڕەوتە مێژووییەکەی گەشەی نەدەکرد و پەرەی نەدەسەند، ئەنجامیش شێرازەی دەسەڵاتی سیاسی لەبەریەك هەڵوەشاو هەر دەسەڵاتدارێکی ناوچەیی لای خۆیەوە بووە دەرەبەگێکی گەورە(ل٤٧).

مەگەر تەنها چاوی ڕەخنە بزانێت چەند هەڵەو ناڕێکی لەو چەند دێڕەدا هەیە. جارێ لەوە گەڕی کە هەموو موجتەهیدانی ئەوسا پیاوی دەسەڵات نەبوون‌و تەنانەت دەوڵەتە دیکتاتۆرەکانی سەردەمە نوێکانیش نەیانتوانیوە هەموو فەقیهەکان بکەنە فەتوادەری خۆیان، لەوەش گەڕی میسری خزمەتی موجتەهیدان بەدەوڵەت بێ پاساو و بەڵگەیەکی تەواو دەکاتە هۆی لاوازبوونی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی. پاش وازهێنان لەوانەش هێشتا زۆر ماوە بوترێت.

وتمان بەپێی مارکسیەت پلەی گەشەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان شێوەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دیاری دەکات بەڵام گەشەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەگاتە ئاستێك لەگەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا ناکۆك دەبێت‌و ئەو ناکۆکییە بە گۆڕانی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان‌و هاتنی قۆناغێکی مێژوویی نوێ کۆتایی پێ دێت، بۆ نموونە لە قۆناغی یەکەمدا کە مەشاعەی یەکەم بوو زەوی‌و ئامێرەکان هی هەمووان

بوون، لەمەوە سیستەمی مەشاعیی یەکەم فەرمانڕەوا بوو، بەڵام دوایی بەهۆی جەنگەوە ژمارەیەك مرۆڤ بوونە دیلی جەنگ، سەرکەوتووانیش لەجیاتی کوشتنی دیلەکان کردیاننە کۆیلەو ئیشیان پێکردن، ئیتر هۆیەکانی بەرهەمهێنان گۆڕانو لەجیاتی هەرەوەزیی مەشاعەی یەکەم هێزی کاری کۆیلەکان بەربڵاو بوو و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان گۆڕانو دوو چین پەیدا بوون، چینی کۆیلەکانو چینی خاوەن کۆیلەکان.

بەپێی مارکسیەت ئەو ناکۆکییەی نێوان گەشەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانو پەیوەندییە کۆنەکان بەرهەمهێنان بۆ چوار قۆناغە مێژووییەکەی دوای مەشاعەی یەکەمیش هەر ڕاستەو بەم جۆرە: کۆیلایەتی کە چووە جێگەی مەشاعەی یەکەم بەڵام دوایی ئەو ناکۆکییەی تێکەوتو بوو بە قۆناغی دەرەبەگایەتی، ئینجا دەرەبەگایەتی پاشان بورجوازیەتی، دوای بورجوازییەتو سەرمایەداریش چاوەڕی دەکرێت هەمان شت ڕووبداتو سۆشیالیزم بێتە دی.[٦]

میسری جارێکی تر مارکسیەت دەشێوێنێت کاتێك ((لاوازبوون))ی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ناگەڕێنێتەوە بۆ گەشەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بەڵکو بۆ فەتوای موجتەهیدان کە لە خزمەتی دەسەڵاتدان، ئەمەش نوکتەیە نەك شیکردنەوە، پاشان نەمانبینی میسری بڵێت هۆیەکانی بەرهەمهێنان گەشەیان دەسەندو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بوونە کۆسپ لەبەردەم ئەو گەشەسەندنە، ئەو تەنها دەڵێت کە ئەو هۆیانە گەشەیان

---

[6] دەڵێین ((بەپێی مارکسیەت)) بەڵام مارکسیەت کێشەی هەیە لە چەسپاندنی ئەو بۆچوونە، بۆ نموونە هیچ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەسەر هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە کۆتایی قۆناغی کۆیلایەتی نەهات تا لەگەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا ناکۆك بێت.

نەسەند، سێیەمیش ئەو لە لاوازبوونی هۆیەکانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتیو گەشەنەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئەنجامێکمان دەداتێ کە بریتییە لە هەڵوەشانی دەسەڵاتی سیاسیی خیلافەتو دروستبوونی دەرەبەگەکانی دەسەڵاتە ناوچەییەکان، واتە سیستەمی دەرەبەگایەتی نەفەوتا.. هەموو ئەوەش بێئەوەی بزانین پەیوەندیی چییە لەنێوان گەشەنەسەندنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانو لاوازبوونی پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتیی بەرهەمهێنان (هەر مەگەر بڵێین میسری موجتەهیدێکی مارکسییە)و بێئەوەی هیچ پەیوەندییەکی مەنتیقی ببینین لەنێوان ئەو لاوازییەو ئەو گەشەنەسەندنە لەلایەکو هەڵوەشانی دەسەڵاتی سیاسی لەلاکەی تر، دەشڵێم ((پەیوەندیی مەنتیقی)) نادۆزینەوە چونکە ئەوە بڕاوەتە کە پەیوەندییەك نادۆزینەوە لەسەر بنەمای فیکری مارکس (لەڕاستیشدا پەیوەندییەکە بەپێی مارکسیەت پێچەوانەی قسەکەی میسرییە).

هۆی ئەو ئیجتیهادە سەقەتەو ئەو دیالێکتیکە مارکسییە هەزەلییەی کە بەسە بۆ ئەوەی مارکس، ئەگەر ئێستا زیندووبێتەوە، بخاتە گریان ئەوەیە میسری دژی دەوڵەتی خیلافەتەو دژی موجتەهیدانیشە، دژی شەریعەتیشە، بۆیە هەموویان لە لیستی ڕەشدانو پێویستە سیغەی تەرحەکەشی تاوانبارکردنی هەموویان بێت.. ئیتر چش لە مارکسو تیۆرەکەی.

## موجتەهیدو دەسەڵات

میسری حەز دەکات موجتەهیدان ناشیرین بن بۆیە سیفەتی خزمەتکردنی دەسەڵاتیان دەخاتە پاڵ بەڵام ئەگەر وەکو ڕێبوارێك مامەڵەی لەگەڵ مێژوودا نەکردایە دەیزانی کە زۆربەی زانا گەورەکان کێشەیان لەگەڵ دەسەڵاتدا

هەبوو، تەنانەت خاوەنەکانی هەر چوار مەزهەبە گەورەکە واتە ئەحمەدو شافعیو ئەبو حەنیفەو مالك بەشی خۆیان ئازاریان بەدەست دەسەڵاتەوە چەشتبوو. ڕێزی زانایانیش لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هێندە گەورە بوو پێویستیان بە پلەوپایەی دەسەڵات نەبووە، وەکو وتیشم تەنانەت لەم سەردەمەی خۆماندا دیکتاتۆرەکان نەیانتوانیوە هەموو زانایانو مەلایان بکڕن.

## دەسەڵاتی خەلیفە

خەیاڵەکانی میسری تەنانەت دەیخاتە هەڵەی وا کە قوتابییەکانی قۆناغی یەکەمی مێژوو نایکەن، ئەوەتا ناوی قۆناغی دووەمی عەبباسییەکان دەبات کە تێیدا بێتوانایی خەلیفە گەیشتە ئاستێك سەرکردەو سەرلەشکرەکانی سوپا بەئارەزووی خۆیان هەڵیاندەسووڕاند، سێ نموونەش دەهێنێتەوە کە یەکێکیان شیعرێکی خەلیفە (مەهدی)یە کە تێیدا لەخودا دەپارێتەوە لەو نازو ونیعمەتە نائومێدی نەکات..(ل٤٨). هەڵەکە لێرەدا ئەوەیە مەهدی باوکی (هارون ئەلڕەشید)ـە، خۆ ئەگەر میسری لەوەش تێناگات ناچارین پێی بڵێین لە سەردەمی مەهدیدا خەلیفە ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەبووە، سەیریش لەوەدایە هەموو باسەکەی میسری لەو شوێنەدا تایبەتە بە هەڵوەشانی دەسەڵاتی سیاسی خیلافەتو درووستبوونی دەسەڵاتە ناوچەییە نیمچەسەربەخۆکان کەچی شیعرەکەی (مەهدی) باسی نازونیعمەت دەکات.. وادیارە میسری وایزانیوە مەهدی لەوە ترساوە دەسەڵاتدارێك ئەو نازونیعمەتەی لێ بسەنێت بۆیە ئاوا لەخودا دەپاڕێتەوە. دەبوایە میسری لەجیاتی نەقڵی کوێرانە بیزانیایە سەردەمی مەهدی لەڕووی دەسەڵاتی خەلیفەوە چۆن بووە، هەروەها شیعرەکەی وردتر بخوێنایەتەوە تا بزانێت

شیعرەکە باسی خۆشیی گوزەران لەناو گۆرانیو ڕەزو کەنیزەك دەکات، هەروەها لەگەڵ (ئەبو حەفص) کە (نەدیم)ی مەهدی بووە واتە کەسی نزیکی مەجلیسی خۆشیو کاتبردنەسەری بوو.[٧]

## تەسەووف

میسری پاش ئەوە دەڵێت کە دامەزراوەی فیقهی کە زانایانی سوننە بەڕێوەیان دەبرد، کە موجتەهیدی ڕەسمیی دەوڵەت بوون، ڕووبەڕووی دوو ناکۆکی بوو: یەکەمیان ناکۆکیی نێوان خودی موجتەهیدان کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قووڵتر دەبووەوە، دووەمیشیان ناکۆکیی تێکڕای موجتەهیدەکانی سوننە بەرامبەر سۆفیەتدا چونکە نەدەبوو لەئاست بزووتنەوەیەکی فیکریو فەلسەفیدا بێدەنگ بن(ل٤٩).

ئەم خەیاڵەی میسری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وێنەیەی ویستبووی بۆ فەقیهەکانی بکێشێت، پرسیاریشی لە خۆی نەکرد ئەگەر موجتەهیدەکان پیاوی دەوڵەت بن چۆن لەناو خۆیاندا ناکۆك دەبن؟ ئەگەر واشبێت کامیان لەدەسەڵاتەوە نزیك بوو و کێ لەکۆتاییدا سەرکەوت. بەڵێ جیاوازی هەبوو لەنێوان موجتەهیدەکان، ئەمەش نیشانەی هەبوونی گیانێکی زیندووە لە جەستەی شارستانیی ئیسلامی. مەزهەبە فیقهییەکان دەیان، بەڵکو سەدان مەزهەب بوون (بەڵام میسری وادەزانێت تەنها چوار مەزهەبی سوننە هەیە) ئەوەش وێنەیەکی کاریکاتێرییە کە موجتەهیدەکان دەکاتە فەتوادەری دەسەڵاتو ئەم فەتوادەرانە دەزگایەکی فیقهیی ڕەسمییان پێکدەهێنا، بەڵام وێنە کاریکاتێرییەکە دەبێتە مەسخەرە کاتێك پێمان دەوترێت ئەو دەزگایە

[7] بڕوانە: السیوطي، تاریخ الخلفاء، ل ٢٤٣. بێگومان ئەگەر شیعرەکە ڕاست بێتو هەڵبەستنی حیکایەتخوانەکان نەبێت.

ڕووبەڕووی ناکۆکیی نێوان ئەندامەکانی بوو. دیارە خەلیفە لەو کاتەدا لەڕاو بووە یان لەسەر ئاو!

خەیاڵەکەی تریش ئەو وێنەیەی بۆ سۆفیەتی کێشاوە گوایە بزوتنەوەیەکی فیکریو فەلسەفی بووە، ڕێبازی سوننەش ئەوەندەی تر نابووت بوو بەتایبەت چونکە نەیدەتوانی لەبواری فیکریدا ڕووبەڕووی ببێتەوە.

قسەکانی میسری نیشانەن لەسەر ئەوەی جەوهەری سۆفیەتی نەزانیوە. سۆفیەت لەئەسڵدا کاردانەوەیەکی ئاینی بووە، کاردانەوەیەك دژ بە زاڵبوونی دونیاویستی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، سۆفیەت بەر لە هەموو شتێك تەرکی دونیا بووەو گەیشتە ڕادەی تەرکی ئەو شتانەش کە خودا حەڵاڵی کردوون، لەبەرئەوە فیکری سۆفیگەری فیکری گۆشەگیری لە کۆمەڵگەدا بوو، بۆیە دەسەڵات هیچ کاتێك بە هەڕەشەی نەدەزانی، بەپێی میسریش دامەزراوەی فیقهیی سەر بە دەوڵەت بوو ئەی بۆچی موجتەهیدان بەپێویستیان زانی لێی بێدەنگ نەبن؟ پێویستە میسری دەستبەرداری شتێك بێت، یان ئەوەیە واز لەو خەیاڵە بهێنێت کە تێکڕای موجتەهیدان فەتوادەری دەسەڵات بوون، ئەو کاتەش دەتوانین پاساو بۆ دژایەتیکردنی سۆفیەت بدۆزینەوە، یانیش موجتەهیدەکان لە مەوقعی خۆیاندا بهێڵێتەوە ئەو کاتەش ببنە پشتگیری سۆفیەت، بەڵام ئەو هیچیان ناکات بەڵکو هەموو شتێکی دەوێت، یان ڕاستر دەیەوێت هەمووان بە هەموو شتێك تاوانبار بکات ئیتر گرنگ نییە خۆی‌خۆی بەدرۆبخاتەوە، هەڵەیەکی تر ئەوەیە وایزانیوە سۆفییەکان بەشێك نین لە ئەهلی سوننە (بڕوانە دەنووسێت: ڕێبازی سوننە) هەرچەندە سۆفیەت لەناو شیعەدا هەیە بەڵام تەسەووف بەزۆری لەناو سوننەکاندا بوو کاتێکیش

کەسێك دەیوت فلاّنە کەسی موتەسەووف لە سوننە لایداوە مەبەستی بووە لە دوو سەرچاوەی ئیسلام، واتە قورئانو سوننەت، لایداوە، بەزۆریش مەبەستیان لەلادان لە سوننەت بووە، واتە کارەکان بەپێی سوننەتی پێغەمبەر نین، بۆ نموونە خواردنی خۆشیان لەسەر خۆیان حەرام کردبوو، بەشێکیشیان ژنهێنانیان قەدەغە کردبوو، زۆربەشیان کاریان نەدەکرد، کردنەبەری پۆشاکی پینەکراویش لایان شانازیو مەرجێکی سوفیەت بووە، نووسینەوەی فەرموودە یان فێربوونی فیقه لایان مایەی دڵتاریکبوون بوو چونکە علم لای ئەوان لە کاغەزەوە وەرناگیرێت بەڵکو بەدڵ وەردەگیرێت..تاد.[٨]

میسری لە کتێبەکەی تریدا، *کۆمەڵگا لە سایەی خەلافەتدا*، هەڵەی عەنتیکە سەبارەت بە سۆفیگەری دەکات کە ناکرێت لێرەدا هەموویان بخەینەڕوو، هەڵەکانیشی لەو هەڵە گەورەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو لەسەر بەرهەمی خەڵکی تر ژیابوو. یەکێك لە هەڵەکانی ئەوەیە باسی دوو جۆر زوهد دەکات، یەکەمیان: ئەوەی سەرەتای ئیسلام ڕێگای خۆخواردنەوەو گۆشەگیریان هەڵبژاردو زۆربەیان یارانی پێغەمبەر بوون(کۆمەڵگا، ل٣٥٧)، کە ئەمەیان تەواو پێچەوانەی واقیع بوو چونکە زوهد لە سەرەتای ئیسلامدا گۆشەگیریی تێدا نەبوو بەتایبەتی لەناو صەحابییەکاندا، میسری لە (موڕووە) ئەوەی وەرگرتووە، (موڕووە)ش باسی

[8] هەندێك لە سۆفییەکان زیاتر لایەنی فیکریو فەلسەفییان گرتبوو بەڵام فیکر لای تێکڕای سۆفییەکان بۆ سلووك، واتە بۆ گرتنەبەری ڕێگەی خۆپاککردنەوەو نزیکبوون لە خودا، بوو.

شێوازی ژیانی ساکار دەکات نەك گۆشەگیریو خۆخواردنەوە.[٩] میسری دەیسەلمێنێت کە شارەزاییەکەی لە تەسەووف لە نەقڵکردنی چەند شتێك بەدەر نییە، بۆیە دەڵێت زاراوەی (عارف) لەلایەن سۆفییە ئێرانییەکانەوە داهێنراوە، بۆ پشتگیریش بەیتێکی مەحوی دەهێنێتەوە کە شاعیرە کوردەکانیش بەو واتایە وشەکەیان بەکارهێناوە(ل٣٦١ پەراوێزی ٢٢) لەکاتێکدا زاراوەکە تایبەت نییە بە سۆفێتیی ئێرانی یان عەرەبیو وادیارە میسری چەند شیعرێکی فارسی خوێندۆتەوە کە زاراوەی عارفیان تێدایەو وایزانیوە داهێنانێکی ئێرانییە.

## پێغەمبەر کۆچەر بوو!

میسری کە تەنانەت نەشیزانیوە کێ کۆچەر بوو و کێ شارنشینو گوندنشین، چۆن بەتەما بین فیکرەیەکی دروستمان لەبارەی هەر مەسەلەیەکی ئیسلام بداتێ. ئەوەتا دەڵێت: ((گومان لەوەدا نییە کە ڕابەرانی ئیسلام بە پەیامبەریشەوە عەرەبی کۆچەر بوون...))(کۆمەڵگا، ل٣٧١). قسەیەکە بەسە بۆ ئەوەی مۆرێکی مەتر بەمەتری نەزانی بەناوچەوانی خاوەنەکەیەوە بدرێت چونکە عەرەبی کۆچەر (ئەعراب)یان پێ دەوتراو عەرەبە شارنشینو گوندنشینەکان ڕەخنە ناشارستانیو زبریو ڕەفتاری نەشیاویان لێدەگرتن، چەندین ئایەتیش لەبارەیانەوە هاتووەو لە چەندین فەرموودەدا دەیانبینین. پێغەمبەرانیش لە شار، کە لە قورئاندا بە وشەی (قرية) تەعبیری لێکراوە، هەڵدەبژێردران: ((وَما أرْسلْنا مِن قَبلِك إلاَّ رِجالاً نُوحي إِلَيهِم مِنْ أهلِ القُرى –یوسف١٠٩))، تەنانەت مەککە کە شاری پێغەمبەر بوو بە ((دایکی شارەکان– ام القرى)) ناوبراوە: ((وکذلك أُوحينا

---

[٩] حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج ٢ ل١٥٠.

إليكَ قرآنا عربيا لِتنْذر أمَّ القُرى ومَنْ حَولَها –الشورى٧))، ئاماژەیەکیش هەیە کە پێغەمبەرانی تریش لە گرنگترین شار هەڵدەبژێردران: ((وَما كانَ ربُّكَ مُهْلِكَ القُرى حتَّى يَبعَثَ في أُمِّها رسولًا –القصص٥٩)). نەك تەنها پێغەمبەریش بەڵکو ڕابەرانی تری ئیسلامیش هەروا شارنشین بوون.

## سەرچاوەکانی فیقھ

میسری دوایی بازێکی گەورە دەدات. سەرەتا دەگەڕێتەوە سەر کێشەی ڕابەرایەتیی موسڵمانان و نەبوونی دەقێك لەمبارەیەوە، دواییش هەوڵی موجتەهیدانی سوننە بۆ وەڵامی تیۆری (ئیمامەت)ی لای شیعە کە دەبوایە ئەوانیش بنەمایەکی یاسایی بۆ شێوەی پەیوەندیی نێوان خەلیفەو تێکڕای موسڵمانان دەستنیشان بکەن کە تێیدا هەم پایەی خەلیفە پارێزراو بێتو هەم ئەرکی تاکەکەسی موسڵمان دیاری کرابێت(بیری ئوسووڵی، ل٥٠–٥١).

ئەگەر میسری لێرەدا بوەستایەو بینوسیایە: ((لێرەشەوە فیقهی ئەحکام سوڵتانی یان سیاسەتی شەرعی دامەزرا)) قسەکەی جێگەی قبووڵ دەبوو، بەڵام ئەو کە نەشارەزایی لە فیقھ دەخاتە پاڵ نەشارەزایی لە مێژوو، هەروەها ئەو کە ڕقی لە هەموو شتێکە فیقھ لەو ڕقە بێبەش ناکاتو بازێکی گەورە دەداتو یەکسەر دەڵێت: ((سەرەنجام گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە دەبێ یاسای بەڕێوەچوونی کۆمەڵگە پشت بە چوار سەرچاوە ببەستێ))، ئینجا چوار سەرچاوەکە دیاریدەکات: قورئان (ل٥١)، سوننەت (٥١–٥٢)، هاودەنگی –الإجماع (٥٢–٥٣) پێوانە –القياس (٥٣–٥٤).

فیقھ ڕەوتێکی سەربەخۆی گەشەسەندنی هەبوو ئەویش بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی خەڵکەکە، پاش ماوەیەکی زۆریش لە سەرهەڵدانی ئەو فیقهە هەوڵدرا بۆ داڕشتنی بنەما بۆ گەیشتن بە حوکمە فیقهییەکان، لەوەشەوە ئەو

زانستە پەیدا بوو کە پێی دەوترێت (أصول الفقه). دیاریکردنی سەرچاوەکانی تەشریعیش دەچێتە خانەی (أصول الفقه)، دیسانەوەش دروستبوونی ئەو زانستە بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکان بوو بەڵام ئەمجارە پێویستییەکانی فەقیهەکان بۆ گەیشتن بە حوکمە فیقهییەکان، خۆشیش ئەوەیە یەکەم کەس ئەو زانستەی لە دووتوێی کتێبێکی سەربەخۆی تایبەتمەند دامەزراند شافعی بوو لە کتێبی (الرسالة). خۆشییەکە لەوەدایە کە شافعی لەگەڵ دەسەڵاتدا ناکۆك بووەو بەشی خۆی قامچیی دەسەڵاتی بەرکەوتبوو و تۆمەتی خۆشویستنی ئەهلولبەیتی درابووە پاڵو ئەمەش لای عەبباسییەکان (هەرچەندە خۆشیان ئەهلولبەیت بوون) جێگەی مەترسی بوو چونکە واتای لایەنگیریی بەنو تالیب بوو. ئەمە بوو دامەزرێنەری (أصول الفقه) کە باسی چوار سەرچاوەکە سەرەوەی کردووە (لەگەڵ سەرچاوەی تردا)، ئیتر با میسری هەر خوڕافات بڵێت سەبارەت بە پەیوەندیی چوار سەرچاوەکە بە کێشەی ئیمامەت.

## یەکدەنگی (ئیجماع)

میسری ئیجتیهاد تێکەڵ بە شتی تر دەکات کاتێك باسی یەکدەنگی (الاجماع) دەکات. میسری جگە لەوەی نەیتوانیوە پێناسەی ئیجماع بکات باسەکەشی شێواندووە. ئیجماع بریتییە لە یەکدەنگیی موجتەهیدەکان لە سەردەمێکی دیاریکراو لەسەر مەسەلەیەکی دیاریکراو و کەس لە موجتەهیدەکان لەو سەردەمەدا نەبێت ڕای پێچەوانەی هەبێت، بەڵام میسری (ل٥٢) یەکدەنگی لەگەڵ ئیجتیهاددا تێکەڵ دەکات چونکە سەرەتا باسی

بیروڕای صەحابییەکانو تابعییەکان[10] دەکات کە ((کرایە سەرچاوەی تری شەریعەت))، ئەمەش ڕاست نییە بۆ یەکدەنگی لەبەرئەوەی دەشێت صەحابییەکان یەکدەنگ نەبن، ئینجا باسی دوو بنەما دەکات بۆ ((دەرهێنانی یاسای نوێ)) کە یەکەمیان موجتەهید ئاستی زانستیی گونجاوی هەبێتو دووەم ئەوەیە دەق هیچی لەبارەی ڕووداوەکەوە نەوتبێت بەڵام حاڵەتێکی هاوشێوە هەبێت مەجتەهید لەگەڵیدا بەراوردی بکات.. هیچیش لەم دوو مەرجە پەیوەندییان بە یەکدەنگییەوە نییە چونکە یەکەمیان مەرجی فەتوادەرە، دووەمیش مەرجی پێوانە(قیاس)ـەو هەردووکیان پەیوەندییان بە ئیجتیهادەوە هەیە.

میسری سوور دەبێت لەسەر تێکەڵکردنی شتەکانو بەڵگەی موجتەهیان لەسەر یەکدەنگی دەهێنێتەوە ئەویش لەسەرەتای ئیسلامدا یەکدەنگیی صەحابییەکان بنەمایەکی باوەڕپێکراو بوو، بۆ نموونە لای مالك هاودەنگیی خەڵکی مەدینە بەس بووە بۆ بڕیاری کۆتایی لەسەر هەر مەسەلەیەك (ل٥٢) کە ئەمە نموونە نییەو ئەمە تێکەڵکردنی سەرچاوەی سێیەمی تەشریعە (یەکدەنگی) لەگەڵ سەرچاوەیەکی تر کە تایبەتە بە مالك ئەویش (کاری یاخود یەکدەنگیی خەڵکی مەدینە) کە تایبەت بوو بە خەڵکی مەدینە

---

[10] بێگومان چاوەڕێ ناکەین میسری بزانێت واتای تابعییەکان (التابعون) چییە. ئەو دەڵێت: (یاوەرانی پەیامبەرو ئەوانەی سەر بەوان بوون) (التابعين) (ل٥٢). یانی چی ئەوانەی سەر بە یاوەران؟ (صەحابی) ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری بینیوە، (تابعی)ش ئەو کەسەیە کە (صەحابی)ی بینیوە (تابعیی تابعی)ش هەیە کە (تابعی)ی بینیوەو بەم سێ نەوەیە وتراوە سێ (قەڕن) ی یەکەمی ئیسلام کە فەرموودە لەبارەی چاکێتییان هاتووە.

بەتەنها.[11]

میسری حەز دەکات وەکو شارەزا قسە بکات بۆیە دەیبیستین دەڵێت: مەفهوومی یەکدەنگی مەودایەکی فراوانی نەبوو، تەنها ئەو کەسانە بۆیان هەبوو ئیجتیهاد بکەن کە شارەزای شەریعەت بوون..(ل٥٣) دیسانەوەش دەڵێم: یەکدەنگیو ئیجتیهادی بەیەك شت زانیوە، ئینجا بەتەواوەتی دەیسەلمێنێت کە نازانێت یەکدەنگی چییە چونکە دەڵێت یەکدەنگی ئەستەم بوو پیادە بکرێت ((چونکە کۆکردنەوەی دەیان زانای ئاینی لەچەند وڵاتی ناو قەڵەمڕەوی ئیسلامدا قابیلی جێبەجێکردن نەبوو))(ل٥٣) نەشیزانیوە کە مەفهوومی یەکدەنگی کۆکردنەوەی زانایان لە شوێنێکدا نییە بەڵکو هەریەك لە شوێنی خۆیەوە ئیجتیهادی سەربەخۆی خۆی هەبووە، ئەو زانستەش بەناو وڵاتانی ئیسلامدا بڵاودەبووەوەو زاناکانی تر لێی ئاگادار دەبوون چونکە جووڵەی زانستی زۆر گەرموگوڕ بوو، ئیتر زاناکان کە دەڵێن فڵانە مەسەلە ئیجماعی لەسەرە مەبەستیان زانایانی ئیسلام یەکدەنگن

[11] میسری لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا کە بۆ ئەو کتێبەی تەرخان کرابوو (ناوەڕاستی ٢٠٠٩) وتبووی مالك بۆیە بۆچوونی ئەهلی مەدینەی کردە سەرچاوەیەکی تەشریع چونکە ئەوان پاکترو موسڵمانتر بوون..تاد کە ئەمە نەشارەزاییەکی ترە چونکە بەهانەی مالك ئەوە بوو مەدینە جێی پێغەمبەرو هاوەڵانی بوو و قورئانی تێدا دادەبەزیو تێیدا پێغەمبەر وەحیی ڕوونکردبووەوە (بڕوانە مناع القطان، تاریخ التشریع الاسلامی، ل٢٤٦-٢٤٧ کە ئەمە یەکێکە لەو کتێبانەی میسری وەکو سەرچاوە نووسیونیو گوایە بەکاریهێناوە). مالك تەنانەت عیلمو فەرموودەی لە کەسانێکی زۆر لەخوداترسو زاهد وەرنەدەگرت چونکە بە وتەی ئەو لەخوداترسانو زوهد بەتەنیا بەس نینو پێویستە ئەو کەسە شارەزاییو لێهاتوویيو تێگەیشتنیشی هەبێت (بڕوانە د. محمد بلتاجی، مناهج التشریع الاسلامی، ل٤١٩).

لەبارەیەوە.. هەریەك لە شوێنی خۆی. زۆریش ڕوودەدات قسەی زانایەك ڕەتبکرێتەوە کاتێك دەڵێت ئەم مەسەلەیە ئیجماعی لەسەرەو دەوترێت نەخێر فلاّنە موجتەهید موخالف بووە، زۆر جاریش ئیحتیاتیان دەکردو نەیاندەوت ئەم مەسەلەیە ئیجماعی لەسەرە نەوەکو موجتەهیدێك لە شوێنێکدا لەو مەسەلەیە ئیجتیهادێکی جیاوازی هەبێت بۆیە پاش باسکردنی ئەو ئیجتیهادە دەیانوت: (لانعلم من خالفه) واته نەمانبیستووە کەسێك شتێکی تری وتبێت، یاخود (لانعلم مخالفا).

میسری لەخۆیەوە قسە دەکات، یان با بڵێین تێنەگەیشتووە لەوەی سەرچاوەکان چی دەڵێن بۆیە دەنووسێت: ((لەلایەکی تریشەوە نەدەبوو هاودەنگی هیچ مەسەلەو بابەتێك چارەسەر بکا کە پەیوەندییان بە داهاتووەوە هەبێ. یانی دەبوو هاودەنگی لەسەر ڕابوردوو پراکتیزە بکرێ نەك لەسەر ئایندە))(ل٥٣). مەسەلەی سەردەم لە یەکدەنگیدا پەیوەندیی بە پرسیارێکەوە هەیە: ئەگەر یەکدەنگی لەسەر مەسەلەیەك پەیوەندیی بە سەردەمێکی دیاریکراوەوە هەیە ئەی تاکەی ئەو یەکدەنگییە بڕ دەکات؟ ئایا هەر ئەوەندە موجتەهیدەکان لەسەر مەسەلەیەك یەکدەنگ بوون ئیتر بنەمای یەکدەنگی جێبەجێ دەبێت یان پێویستە ئەو سەردەمە تێپەڕێت نەوەکو یەکێك لەو موجتەهیدانە پەشیمانبێتەوە؟ بۆ ئەمە دوو ڕای جیاواز هەیە.[12]

---

[12] بڕوانە: زیدان، الوجیز فی اصول الفقه، ل١٨١. زۆربەی زانایانیش بۆچوونی یەکەمیان هەیە، بڕوانە ابو زهرة، اصول الفقه، ل١٩٨. میسری لە پەراوێزی لاپەڕە ٥٣ دەڵێت بنەمای هەریەك لە چوار مەزهەبەکەی سوننە (دووبارەی دەکەمەوە میسری تەنها ئەو چوار مەزهەبەی بیستووە) پەیوەندیی هەیە بە زەمانو زەمینەی سەرهەڵدانیو ڕەوتی

## یەکدەنگی و ئیمامەت

میسری شتەکان هەڵدەگێڕێتەوە (یان لەوانەیە لەو سەرچاوەیەی زانیارییەکەی لێ وەرگرتووە وا سەقەتی کردووە)و گوایە موجتەهیدانی سوننە بۆیە شەرعییەتیان بە یەکدەنگی دا بۆ ئەوەی تیۆرێکی سیاسی بۆ شێوەی ڕابەرایەتی دابڕێژن(ل٥٤)و ئاماژە بۆ دانانی ئەبو بەکر دەکات. خۆ ئەگەر پێچەوانەکەی بوتایە ڕێی تێدەچوو واتە بەهۆی دانانی ئەبو بەکر بە خەلیفە موجتەهیدان بنەمای یەکدەنگییان لە شەرعدا داڕشت، بەڵام ئێمە خۆمان ماندوو دەکەین ئەگەر داوای لێبکەین ئاوا وئاوا بکات، ئەو تەنانەت ئاگای لە نووسینەکەی خۆشی نییە چونکە پێشتر جەختی لەسەر ئەوە کردبوو کە موجتەهیدەکانی سوننە بوونە دەزگای فیقهیی دەسەڵاتو فەتوایان بۆ بەرژەوەندیی ئەو دەدا، لێرەشدا دەڵێت شەرعیەتیان بە یەکدەنگی دا، بەڵام لە خۆی ناپرسێت چۆن دەکرێت ئەو یەکدەنگییە بگونجێت لەگەڵ بنەمای فەرمانڕەوایی لەسەردەمەکانی دوای ڕاشیدەکان کە لەسەر بناغەی میراتگەری بوو نەك شوورا؟ چۆن هەڵبژاردنی ئەبو بەکر بە خەلیفە لەگەڵ ڕەفتاری ئەمەوی‌و عەبباسییەکاندا دەگونجێت کە کوڕو برای خۆیان لەدوای خۆیان دادەنا؟ دەبوایە ئەو دەزگا فیقهییە یەکدەنگیی بخستایە ژێر خۆڵ.

میسری زیاتر دەیسەلمێنێت کە نازانێت چیی نووسیوەو دوای چەند

---

ڕووداوەکان. میسری تەفسیری ئەوە ناکات‌و ناشزانێت تەفسیری بکات چونکە زانیارییەکانی هەڵەن‌و باسی بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکان لە وڵاتانی ئیسلام دەکات کە جگە لە زانیاریی هەڵە باسەکە تێکەڵکردنی سەردەمی کۆن‌و نوێی تێدایە.

دێڕێك قسەیەکی پێشووی دووبارە دەکاتەوە کە هەوڵەکانی موجتەهیدەکانی سوننە هەروەها هەوڵێك بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی تیۆری ئیمامەت لای شیعەو ڕەتکردنەوەی بنەما فیکریو فەلسەفییەکانی سۆفییەت(ل٥٤)، بەڵام میراتگری بەشێکی سەرەکییە لە تیۆری ئیمامەت لای شیعە، عەبباسییەکانیش بەهەمان شێوە بە میراتگری کاریان دەکرد، هەروەها وەکو شیعە دەیانوت ئەوان ئەهلولبەیتنو وەکو ئەوان فەرموودەیان هەڵبەستبوو بۆ پێشبینیکردنی هاتنی بەنولعەبباس.

میسری ناوی سەرچاوەیەك دەبات (کتێبەکەی النبراوی و مهنا) کە ئاشکرایە نەیبینوەو زانیارییە هەڵەکەی لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەرگرتووە، یان زانیارییەکە دروستە بەڵام خۆی بە هەڵە تێگەیشتووە. کتێبەکەی النبراوی و مهنا باسی بەیعەت دەکاتو ئاماژە بۆ بەیعەتدان بە ئەبو بەکر دەکاتو دەڵێت بەیعەت لای موسڵمانان بووە ئەسڵێکی دروستی خیلافەتو ئەو بەیعەتە مەبەست لێی بەیعەتی گشتیی موسڵمانانە یاخود بەیعەتی گەورەو بریتییە لە یەکدەنگیی ئوممەتو ڕەزامەندیی جەماعەت لەسەر هەڵبژاردنی ئیمام[13]. ئالێرەدا میسری ئەو یەکدەنگییەی ئوممەت تێکەڵ بە یەکدەنگی وەکو سەرچاوەیەکی تەشریع لە فیقهی ئیسلامیدا دەکات.

دیسانەوەش دەڵێم چۆن داوا لە میسری دەکەین دەرك بەم شتانە بکات لەکاتێکدا دەرکی بە شتی لەوە ئاسانتر نەکردووە. ئەوەتا ئەو لەهەمان پاراگرافدا دەنووسێت: ((شەرعیەت دان بە پرۆسەی هاودەنگی لەلایەن موجتەهیدانی ئەهلی سوننەوە لەبنەڕەتدا بۆ ئەوە بوو تیۆرێکی سیاسی بۆ

---

[13] النبراوي ومهنا، تطور الفكر السياسي في الاسلام، ج١ ل٢٣٥.

شێوەی ڕێبەرایەتیو چۆنیەتی حوکمڕانیکردنی ئیسلام دابڕێژن چونکە لەباری پراکتیکییەوە بێجگە لە تەجرەبەی دانانی ئەبو بەکر بە خەلیفەی موسڵمانان هیچ نموونەو تەجرەبەیەکی تریان لەبەردەستدا نەبوو))(ل٥٤)، میسری ئەوە دەنووسێت کەچی هەر خۆی باسەکانی دانانی عومەرو هەڵبژاردنی عوسمانی لەسەرچاوەی ترەوە نەقڵ کردووە! خۆ ئەگەر مەبەستی لە نموونەیەك بۆ یەکدەنگی ئەوا حاڵەتی عوسمان یەکدەنگییە لەبەرئەوەی (عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف) پاش پرسکردن بەخەڵك لەنێوان عوسمانو عەلی یەکەمیانی هەڵبژاردو ئەو تەنانەت لە منداڵانو ئافرەتانیشی پرسی.

## شوورا

ئێستا زانیمان میسری (یان سەرچاوەکەی میسری کە شتی لێوەرگرتووە) دامەزراوەی فیقهیی بە ئامێری خزمەتی دەسەڵات دەزانێت، ئەو دامەزراوەیەش تیۆری سیاسیی دانا، بەڵام زانیشمان ئەو دوو بۆچوونە چەند دژ بەیەکن چونکە یەکدەنگی چەند لەگەڵ حوکمی میراتگری ناکۆکە، ئێستاش (لاپەڕە ٥٥) دەبینین میسری جارێکی تر شتێك دەڵێت بێئەوەی بیری لێبکاتەوە. ئەو لەباسی تیۆرە سیاسییەکەی موجتەهیدەکانی سوننە یەکەم بنەما دەکاتە (شوورا) بەڵام چۆن شوورا لەگەڵ حوکمی ئەمەویو عەبباسییەکان دەگونجێت لەکاتێکدا دانانی خەلیفە بە نیزامی میراتگری بوو نەك بە شوورا؟ ئەمەش زانیارییەکە بۆ میسری: کاتی خۆی کە باسی شوورا دەکرا یەکەم شت دەچووە مێشکی مرۆڤی موسڵمان دانانی خەلیفەیە، مرۆڤیش پێویستی بە خوێندنەوەی وردی ئەو مێژووە هەیە بۆ تێگەیشتن لە عەقڵیەتی ئەو سەردەمە، لەپاش ئەو واتایەی شوورا واتاکەی تر دێت کە

فەرمانڕەوا بە پرسوڕا حوکم بکات نە بە تاکڕەوی (کە بەمەیان دەوت ئیستیبداد).

تێبینییەکیش لێرەدا پێویستە: قسەکەی میسری کە موجتەهیدان تیۆری دەسەڵاتیان بۆ مەزهەبی سوننە داڕشت کە بنەماکانی پشت بە قورئانو سوننەت دەبەستنو دوو بنەمان: شووراو بەیعەت (ل٥٥)، ئەم قسانە هی کتێبەکەی (النبراوىو مهنا)ـن (ج١ ل٢٣٤-٢٣٥)و ئەو کردوونی بە قسەی خۆی، خوداش دەزانێت لەکێی ((بردوون))، بەڵام لەبەرئەوەی مەسەلەکە ((بردنە)) بینیمان لەسەرەوەدا چۆن خۆی تووشی ناڕێکی دەکات سەبارەت بەوەی کە هەردوو بنەماکە دژ بە دەسەڵاتی ئەمەویو عەبباسینو دژ بەوەن دەزگای فیقهی لەخزمەتی دەسەڵاتدا بوو.

## فیقه و ئوسووڵەکەی

نیشانەیەکی تری نەزانیی میسری سەبارەت بە زانستە ئیسلامییەکان قسەکەیەتی کە (علم أصول الفقه) بـە ((زانیـاریی شـەریعەت)) وەردەگێڕێت(ل٥٥) پێشتریش باسم کرد (أصول الفقه) چییە، بەڵام نەزانییەکە لەو ئاستەدا ناوەستێت چونکە هەر لەو پاراگرافەدا قسەیەکی (غەزالی) دەهێنێتەوە سەبارەت بە ئیجتهاد کە پێویستی بە ((تێگەیشتن لەماناو مەبەستی زانیاریی شەریعەتە))(ل٥٦)، کە ئەمە بابەتێکی ترە ئەویش زانینی مەبەستەکانی شەریعەتە (مقاصد الشريعة) کە بریتییە لەو ئامانجە گشتییانەی کە شەریعەت دەیەوێت بیانپێکێت، وەك بۆ نموونە پاراستنی پێنج شتە پێویستەکە بۆ مرۆڤ: ئاین، ژیان، عەقلّ.....تاد.

پێش ئەو ڕستەیەشو لەهەمان پاراگرافدا نەزانییەکی تر دەسەلمێنێت کاتێك دەڵێت ئیجتیهاد پرۆسەیەکە بۆ هەڵهێنجانی پرەنسیپی نویّ لە

پرەنسیپەکانی پێشوو(ل٥٥)، ئەمە ڕاستە چونکە کارێکی ئیجتیهاد دۆزینەوەی بنەمای نوێیە کە ئەمەیان کاری موجتەهیدە لە ئوسووڵی فیقھ، بەڵام میسری یەکسەر دوای ئەوە دەڵێت: ((ئەمەیش لەڕووی لۆژیکەوە ئەوە دەسەلمێنیٚ کە موجتەهید لەناو گشتیدا هەولّی دۆزینەوەی تایبەت دەدا))، کە ئەمە کارێکی پێچەوانەی ئەوەی سەرەوەیە چونکە بریتییە لە پشتبەستن بە گشتی (=بنەماکانی ئوسووڵی فیقھ) بۆ دۆزینەوەی حوکمی تایبەت، ئینجا نەزانییەکی تر دەخاتە سەر بارە کەڵەکەبووەکەی ئەو پاراگرافە کاتێك یەکسەر دوای ئەوە دەڵێت: ((ئەو زانستەیش هەڵس‌و کەوت لەگەڵ ئەم پرۆسەیە دەکا پێیدەگوتریٚ زانیاری شەریعەت(علم اصول الفقه).))، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردو کە لە دوو ڕووەوە هەڵەیە: یەکەم ئەوەیە ئوسووڵی فیقھ کار لەسەر بنەما گشتییەکان دەکات نەك دۆزینەوەی حوکمی تایبەت (کە ئەمەیان کاری فیقهە)[14]، دووەمیش (علم اصول الفقه) بەشێکە لە زانستی شەریعەت نەك خۆی (زانیاریی شەریعەت) بێـت وەك کۆڵەوارییەکەی میسری پێی وتبوو.

بەم شێوەیە میسری لەچەند دێڕێکدا ژمارەیەکی زۆری هەڵەی کردووە کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی زانیاریی سەرەتایی لەبارەی فیقهەوە نییە، بەدڵنیاییەشەوە کاتێك ئەوە ڕووبەڕووی دەکرێتەوە دەڵێت: خۆ من فەقیھ

[14] نموونەیەك لەسەر کاری ئوسووڵی فیقھ: ئەو بنەمایەی دەڵێت (فەرمان) حوکمەکە دەکات بە (وجووب) مەگەر بەڵگەیەك هەبێت ئەو فەرمانە لە وجووب دەربکات. فیقهیش بنەماکان دەچەسپێنێت. نموونە لەسەر کاری فیقھ: ئایەتی (وشاورهم فی الامر – ئەی پێغەمبەر پرسوڕا بە یاوەرانت بکە) بەشێوەی فەرمان هاتووە بۆیە واجبە بەڵام بەپێی ژمارەیەك زانا بەڵگەی تر هەن کە ئەو فەرمانە لە واجب دەردەکەن‌و دەیکەن بە موستەحەب واتە باشترە پێغەمبەر پرسوڕا بکات نەك واجبە.

نیم. پاساوی لەو جۆرەشمان لە کەسانی تر بیستووە، بەڵام ئەمە پاساوێکە لە گوناهەکە گەورەترە چونکە واتای ئەوەیە ئەو کەسە باس لە شتێك دەکات نایزانێتو لەسەر ئەو نەزانییە بینای خۆی دەکات، هەرچەندە کەسێکی وەکو میسری پاساوێکی تری هەیە کە ئەو هەموو شتەکان، زانیارییە فیقهییەکانو دەرئەنجامەکانی لە خەڵکی تر ((بردووە)) کە ئەمە گوناهێکی دوو چینە؛ یەکەمیان ((بردن))ی بەرهەمی خەڵکی تر، دووەمیش وەرگێڕانی هەڵەو هەوڵدەدان بۆ تێگەشتن لە شتە ((براوەکان)).

میسری دوای پاراگرافەکەی سەرەوە باسی زەرووورەتی ئیجتهاد لەدوای مردنی پێغەمبەر دەکاتو دەڵێت کە هەر لەسەرەتاوە ئیجتهاد بە دوو ئاڕاستەدا ڕۆیشت؛ موجتەهیدەکانی سوننە پشتیان بە سوننەت دەبەست لەکاتێکدا هەوادارانی (عەلی) ڕای ئیمامیان کردە بناغەی ئیجتهاد(ل٥٦). میسری دەڵێت ((هەر لەسەرەتاوە))، بەڵام ڕای ئیمام زۆر دوای ئەو سەرەتایە هاتە کایەوە، سەرباری ئەوەش شیعە سوننەتیان ڕەفز نەکردووە بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆریان گێڕابووەوە بەڵام ئەوان زیاتر ئەو سوننەتە پەسەند دەکەن کە لەڕێگەی ئەهلولبەیتەوە بووە، واتە لەڕێگەی جەعفەر ئەلصادق لە باوكو باپیرانییەوە.[15] دوای ئەوەش میسری ڕستەیەك دەڵێت کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێشتر باسمان کرد ئەویش نووسەر وادەزانێت تەنها چوار مەزهەبی سوننە هەبوونو هەن(ل٥٦).

ناکرێت یەك بە یەکی نەزانییەکانی میسری سەبارەت بە فیقهی ئیسلامی

---

[15] بڕوانە بۆ ئەوەو بۆ فیقهی جەعفەر ئەلصادق: د. محمد بلتاجی، مناهج التشریع الاسلامی، م١، ص١٦٨. لێرەدا کارمان بەوە نییە ئەو ڕیوایەتانە چەند مەرجەکانی ڕیوایەتی دروست جێبەجێ دەکەن.

بژمێرینو ناچارین لێرەدا چەند نموونەیەك وەربگرین:

میسری فەرموودەیەکی پێغەمبەری هێناوەتەوە لەبابەتی فێڵی شەرعیو سێ حاڵەتی بۆ ئەو فێڵە داناوە، بەکورتی دەڵێت لە سێ حاڵەتدا تەلاق ناکەوێت، ئەگەر ئەو کەسەی سوێندی خواردبوو بۆ ئەوەی دوو کەسە ناکۆکەکە ئاشت بکاتەوە، ئەگەر پیاو گفتی بە ژنەکەی دا هەندێ شتی بۆ بکڕێتو گفتەکەی نەبردە سەر، ئەگەر سوێندخۆر لەشەڕدا بوو(ل٥٨).

میسری گوایە ئەوەی لەکتێبی (ابن قیم الجوزیة) اعلام الموقعین (ج ٣ ل١٥٩) وەرگرتووە کە دڵنیام نەیبینیوەو ئەو تێکەڵوپێکەڵییە دەگمەنەی لەشوێنی تر وەرگرتووە چونکە ئەو فەرموودەیە پەیوەندیی بە فێڵی شەرعییەوە نییە بەڵکو پەیوەندیی بە درۆکردنەوە هەیە کە پێغەمبەر تێیدا تەنها لە سێ حاڵەتدا ڕێگەی بە درۆکردن داوە. سەیرو خۆشیش ئەوەیە میسری باسی (فێڵ) دەکات کەچی فەرموودەکەی بەجۆرێك نەقڵ کردووە کە گوایە باسی تەلاقدانو نەکەوتنی ئەو تەلاقەیە، دوای کەمێکیش باسی سوێندە، ئینجا سوێندەکەش بۆ ئاشتکردنەوەی دوو کەس، ئینجا دەبێتە بەڵێنی پیاوێك کە شت بۆ ژنەکەی بکڕێت بەڵام بەڵێنەکە بەجێناهێنێت (کوا فێڵی شەرعی؟ کوا تەلاق؟) ئینجا دەبێتەوە بە سوێند، ئەمجارەیان لەکاتی شەڕ، هیچیش لەو سێ حاڵەتە پەیوەندییان بە تەلاقەوە نییە! تێکەڵوپێکەڵییەك کە هەر شایەنی مەنهەجی ئیشی میسرییە کە بریتییە لە تالانکردنی بەرهەمی ئەوانی تر، سەرباری ئەوەش تێنەگەیشتن لەو شتانەی تالانکراون.

بگەڕێینەوە سەر ئەسڵی فەرموودەکە: ((تەنها لە سێ حاڵەتدا درۆکردن حەلاڵ کراوە: حاڵەتی جەنگ، ئاشتکردنەوەی خەڵك، درۆکردنی پیاو لەگەڵ

**ژنەکەی‌و درۆکردنی ژن لەگەڵ مێردەکەی))[١٦] .**

**نموونەیەکی تری نەزانیی میسری لەبارەی (الذريعة)و (سد الذريعة)یە. سەرەتا دەڵێت (مالك) بنەمای[١٧] (الذريعة)ی کردە بنەمایەکی تری مەزهەبەکەی‌و تەواوکەری بنەمای (بەرژەوەندی) (ل٥٩) کە ڕاستتر بوترێت بنەمای (سد الذرائع)ـە واتە داخستن یان ڕێگەگرتن لە (الذريعة)، جگەلەوەش کە ئەمەی نەزانیوە دەبینین (الذريعة)، واتە رێگە (الوسيلة)، بەم جۆرە پێناسە دەکات: نەهێڵرێت کارێکی ڕەوا بکرێتە هۆ بۆ کارێکی ناڕەوا (٥٩–٦٠)[١٨] کە ئەمە هیچ واتایەکی تێدا نییە. ئەو بنەمایە باس لەو کارانە دەکات کە بۆ خۆیان حەڵاڵن بەڵام دەبنە هۆو ڕێگە بۆ کارێکی حەرام، واتە ڕێگە لەو کارە ڕەوایە بگیرێت چونکە دەبێتە هۆ بۆ کارێکی ناڕەوا نەك ((نەهێڵرێت**

---

[16] صحيح مسلم، ج٨، كتاب البر والصلة والادب، باب تحريم الكذب وبيان مايباح منه. نەوەك بەهەڵە تەفسیر بکرێت: درۆکردنی ژن‌و پیاو لەژیانی هاوسەریداو بەپێی ئەو فەرموودەیە حاڵەتی هێشتنەوەی ئەو ژیانە دەگرێتەوە وەك ستایشی جوانی‌و ڕێکوپێکی، یان ژنێك شتێك بکڕێت‌و نرخێکی کەم بڵێت بە مێردەکەی ئەگەر زانی پیسکەیە.... تاد

[17] میسری دەنووسێت: دەستەواژە.

[18] میسری ئاماژە بۆ کتێبی (تأريخ التشريع الاسلامي)ی (مناع القطان) دەکات (ل٣٥٥) لەکاتێکدا هەموو کتێبەکە سێسەدو شتێك لاپەڕەیە. بڕوانە سەرچاوەی خوارەوە بۆ ئەو قسەیەی لەبارەی فەقیهی مالیکییەکانەوە دەوترێت کە تەنها ئەوان کاریان بەو بنەمایە دەکردو کە ئەمە ڕاست نییە بەڵکو ڕاستی ئەوەیە ئەوان لەخەڵکی تر زیاتر پەیڕەویان کردبوو. د.عبدالكريم زيدان، الوجيز في اصول الفقه، ل٢٥٠، بڕوانە هەروەها: د. محمد بلتاجي، مصادر التشريع الاسلامي، م٢، ص٦٠٣-٦٠٤.

کارێکی ڕەوا بکرێتە هۆ بۆ کارێکی ناڕەوا)).[١٩]

ئینجا میسری فەرموودەیەك دەهێنێتەوە لەبارەی ڕۆژووگرتنی شەشی ڕۆژی شەووال پاش گرتنی مانگی ڕەمەزان کە ئەو کەسەی ئەوە بکات ((وەك ئەوەیە سەدەیەك ڕۆژووی گرتبێ)) (ل٦٠)، فەرموودەکەش لەڕاستیدا وشەی (الدهر)ی تێدا هاتووە کە هەموو زەمەن دەگرێتەوە نەك (سەدە). میسری دوای ئەوە باسی شافعی دەکات کە سوننەتی ((خستۆتە ئاستی قورئان))و ئاماژە بۆ کتێبەکەی شافعی (الرسالة، ل٢٧١) دەکات کە تەنانەت بە چاویش نەیبینیوە چ جای ئەوەی خوێندبێتییەوە. ڕاستەکەشی ئەوەیە لەو لاپەڕەیەدا باسی شتی تر کراوە ئەویش شێوازەکانی خوێندنی (تەحییات)ی نوێژ.[٢٠]

میسری کە لە زانیاری داماوە ئەنجامەکانیشی داماوترن. ئەو بەراوردی لەنێوان ئەبو حەنیفە (کە بنەمای ئیستحسانی پەسەند کردبوو)و شافعی دەکات. ئەبو حەنیفە (( لەڕووی عەقڵەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ پێشهاتو دیاردەی ناو کۆمەڵگای ئیسلام دەکات)) بەڵام شافعی ((ئەوەی پێی بگوترێ

---

[19] (ذريعة) لە حاڵەتی حەلاڵکردنی حەرامێکیش هەیەو لەوکاتەدا پێی ناوترێت داخستنی (ذريعة) وەك بەردانی دیلە موسڵمانەکان بە پارە کە ئەم پارەیە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی دوژمن بەڵام بەناچاری دەکرێت. بڕوانە ابو زهرە، اصول الفقه، ل٢٨٠.

[20] میسری، کە وەکو نووسەری هاوشێوەی خۆی فێرە دەست بەسەر بەرهەمی خەڵکی تردا بگرێت، ئەوەی لەسەرچاوەی تر ((بردووە)). نەبوونی ئەو باسە لەو لاپەڕەیەدا تاکە بەڵگە نییە بەڵکو بەڵگەی تر ئەوەیە کە میسری لەو زاراوەو باسە فیقهییانە تێنەگەیشتووە کە بە زمانێکی زۆر سادەتر لەوەی (الرسالة) نووسراونەتەوە ئیتر چۆن دەتوانێت سوود لە (الرسالة) وەربگرێت؟ زانراوە زمانی کتێبە عەرەبییە کۆنەکان قورستر لە زمانی ئێستا، کتێبەکانی ئوسووڵی فیقهیش زۆر قورسترن.

نرخو بەها بۆ وزەی عەقڵو لێکدانەوەی ئادەمیزاد نایهێڵێتەوە))(ل٦١) ئەمەش بەڵگەیە کە میسری لەو شتانە تێناگات کە دەیاننوسێت. ئەو زۆر باسی پێوانە (القیاس)ی کردووە، ئەویش کە شافعی بەکاری دەهێنا بەڵام نازانێت پێوانە کارێکی عەقڵییەو دەچێتەوە سەر قیاسەکەی مەنتقی ئەرستۆ.

## فەرموودە

میسری لە فەرموودەش نازانێت چونکە فەرموودەی (متواتر) بە (بەناوبانگ) وەردەگێڕێت. هەرچەندە فەرموودەی بەناوبانگ زاراوەیەکە لە زانستی فەرموودە یاخود فەرموودەناسی(علم الحدیث)دا هەیە بەڵام واتاکەی جیاوازە لە (موتەواتر)، نەزانینی جیاوازی لەنێوان (متواتر)و (مشهور) زیاتر ئاشکرا دەبێت کاتێك قسەکەی دەخوێنینەوە گوایە فەرموودەی (موتەواتر) لای ئەحمەد کوڕی حەنبەل لە پێوانە باشترە(ل٦٣).

فەرموودەی متواتر لای هەموو زانایەك لە پێوانە باشترو لەپێشترە، بەڵکو تەنانەت ئەم قسەیەشمان هەڵەیە چونکە تا فەرموودەی (موتەواتر) لەگۆڕێدا بێت، پێوانە کاری پێ ناکرێت، زۆربەی زانایان فەرموودەی (ئاحاد)یش پێش پێوانە دەخەن، هەیشە وەکو ئیمام ئەحمەد فەرموودەی (لاواز) لای لە پێوانە باشترە.[21] بەڵکو تەنانەت قوتابییەکانی ئەبو حەنیفە (کە لەهەموو کەس زیاتر ناسراون بەوەی کار بە ڕەئی دەکەن) یەکدەنگن کە ئەمە هەمان مەزهەبی ئەبو حەنیفەیە، ئەوەش بەڕەچاوکردنی ئەوەی

[21] ئەوە ڕیوایەتێکی ناوبانگە کە لە ئەحمەدەوە گێڕاویانەتەوە، بڕوانە مناع القطان، تاریخ التشریع الاسلامی، ل٢٧٧. مەبەستیش لەو (لاواز)ـەی ئەحمەد ئەوە نییە کە (زۆر لاواز) بێت، بڕوانە التهانوی، قواعد فی علم الحدیث، ل٩٧-٩٩.

زاراوەی (لاوان) کاتی خۆی فەرموودەی (حەسەن)یشی دەگرتەوەو ئەوانە مەبەستیان لەو حەسەنەیە.[22] ئیتر ئەوە قسەیەکی بێمانایە بوترێت فەرموودەی موتەواتر لای ئەحمەد لەپێوانە باشترە.

ناوی فەرموودەی (ئاحاد)مان برد.. میسری چۆن پێناسەی دەکات؟ ئەو فەرموودەیەیە کە یەك کەس گێڕاویەتییەوە (ل٥٨) هەر ئەوەندەش لە میسری بەتەماین کە زانیارییەکانی لەبارەی زانستە ئیسلامییەکانەوە لەو ئاستەدایە.

بەر لە باسی فەرموودەی (ئاحاد) پێویستە باسی (سەنەد) بکرێت کە زنجیرەی ئەو کەسانەیە فەرموودەکەیان لە پێغەمبەر گێڕاوەتەوە، واتە فەرموودەی (س) فلانە صەحابی لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، ئینجا فلانە (تابعی) لەو صەحابییەی گێڕاوەتەوە پاشان فلانی تر لەو تابعییە ... تاد. فەرموودەی ئاحاد ئەوەیە لە چینەکانی سەنەدەکە کەسانێك گێڕابێتیانەوە ژمارەیان ناگاتە ژمارەی (تەواتور).[23] بینیمان میسری بەڕەهایی باسی ((یەك کەس)) دەکات کە ئەو فەرموودەیەی ئاحادی گێڕاوەتەوە ئیتر شوێنی ئەو کەسە لە سەنەدەکەدا لەکوێیە؟ ئەوە شتێکە نەدەیزانێتو نەبیستوویەتی، ئەوەش جگەلەوەی مەرج نییە یەك کەس بێت چونکە بە دوو کەسو زیاتریش ئەو فەرموودەیە هەر بە ئاحاد دەزانرێت.

---

[22] بڕوانە التهانوی، قواعد فی علم الحدیث، ل١٠٠.

[23] فەرموودەی ئاحاد دەبێتە سێ بەش: (مەشهوور) کە لە هەر چینێکی سەنەدەکە سێ کەس بەرەو ژوور (بەڵام ژمارەکە ناگاتە ژمارەی تەواتور) گێڕابێتیانەوە، (عەزیز) کە لە هەر چێنێك لە دوو کەس کەمتر نەبن، ئینجا (غەریب) کە لە چینێك یان زیاتر تەنها کەسێك هەیە، بڕوانە د. محمود الطحان، تیسیر مصطلح الحدیث، ل ٢٢ بەدواوە، هەروەها التهانوی، قواعد فی علم الحدیث، ل٣٢-٣٣.

میسری دەمانخاتە پێکەنین کاتێك باسی شتێکی تری فەرموودە دەکات. ئەو باسی سوننەت دەکات کە گوایە شافعی خستویەتییە ئاستی قورئانو بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر لەخۆوە هیچی نەوتووە (....) (( هەر لەسەر ئەم بنەمایەش دەیان حەدیث جیاکرانەوەو ناونراون حەدیثە قودسییەکان))(ل٦٠).

حەزم دەکرد بزانم ئەو زانیارییە سەقەتەی لەکوێ ((بردووە)). یەکەم شتیش بوترێت ئەوەیە فەرموودەی قودسی پەیوەندیی بە مەسەلەی سوننەتو پایەکەیەوە نییە. فەرموودەی قودسی هەر فەرموودەی ئاساییە ئەوەندە هەیە گێڕانەوەکەی گەڕێنراوەتەوە بۆ خودا واتە وەکو فەرموودەی تر نییە وەك: ((من حسن اسلام المرء ترکه ما لایعنیه –نیشانەی موسڵمانێتیی باشی مرۆڤ ئەوەیە هەقی بەو شتەوە نەبێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە)) بەڵکو بەم شێوەیەیە ((یاعبادي اني حرمت الظلم علي نفسي وجعلته بینکم محرما فلا تظالموا.. الحدیث[24] –خودا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم من زوڵمم لەسەر خۆم حەرام کردو لەسەر ئێوە حەرامم کردووە لەبەرئەوە زوڵم لەیەکتر مەکەن.. تا کۆتایی فەرموودەکە –موسلم ڕیوایەتی کردووە)) ئەو فەرموودانەش بەزۆری ئامۆژگاریو مژدەو هەڕەشە .. تاد دەگرنەوە نەك مەسەلەی فیقهین.

## شافعی، پێوانە، زمانی عەرەبی، تێکەڵییەك بەحەزی خۆت

میسری خۆی نەیزانیوە چیی وتووە، هۆکەشی ئەوەیە کە قسەی ئەمو ئەوی کۆکردۆتەوەو خودا چەندی تێگەیشتن پێداوە ئەوەندەی خستۆتە کار، ئەنجامیش تێکەڵوپێکەڵییەکی سەیروسەمەرە. تەماشای ئەم نموونەیە

[24] صحیح مسلم، ج٨، کتاب البر والصلة والادب، باب تحریم الظلم.

بکەن و ببینن چۆن بەناو مەسەلەکاندا دەڕوات و نازانێت بەرەو کوێ دەچێت:

ئەو سەرەتا دەیەوێت زەمی کاری شافعی بکات لە بایەخدان بە پێوانە (کە ئاشکرایە ئەمە قسەی خۆی نییە) گوایە لەدوای داخستنی دەرگای ئیجتهاد پێوانە بووە کۆسپ لەبەردەم حوکمەکانی شەریعەتدا، ئینجا باسی پێوانە دەکات کە بەراوردکردنی ڕووداوێکی پێشووە لەگەڵ ڕووداوێکی نوێ کە یەك هۆ (سبب)یان هەیە، بەڵام هۆ یەك جۆر نییەو هۆی جۆراوجۆر هەن و بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێن (کە دیسان قسەی خۆی نییە)، ئەمەش دەبێتە گرفت لە بەردەم بەراوردکردن، هۆکاری سەرەکی ئەو گرفتەش ئەوەیە عەقڵی سەلەف ئەوەندەی بایەخی بە بونیادی زمانەوانیی دەق داوە ئەوەندە بواری بۆ تێگەیشتنی نەڕەخساندووە (دیسانەوە قسەی خۆی نییە) (ل٦٤–٦٥).

تا ئێرە چاوپۆشیی لە ناونەبردنی سەرچاوەکەی خۆی دەکەین (کە دەزانین ئەوە قسەی چەند نووسەرێکی عەرەبە)، بەڵام با بزانن میسرییەکەی خۆمان چۆن دەیەوێت ئەسپی خۆی تاو بدات (ئەگەر ئەسڵەن ئەو ئەسپە هی خۆی بێت)و تەفسیری ئەو بایەخدانە بە زمان بدات. ئەو یەکسەر باز بۆ بۆچوونی شافعی سەبارەت بە زمانی عەرەبی دەدات و گوایە لە (الرسالة)ی شافعی قسەکەی وەرگرتووە کە زمانی قورئان زمانێکی پوختی عەرەبییەو هیچ وشەیەکی غەیری عەرەبیی تێدا نییەو ئەو کەسەی دەڵێت وشە غەیری عەرەبی لەقورئاندا هەیە نەزانە، دوای ئەوەش میسری دەڵێت شافعی دەیەوێت قودسیەت بداتە زمانی عەرەبی و لەسەرووی زمانی نەتەوە بەئیسلامکراوەکانەوە دایبنێت بەڵام مەبەستێکی تریشی هەیە ئەویش شەرعیەت دانە بە سوننەت(ل٦٥).

ئێستا دەمەوێت خوێنەرێکی زیرەك پێم بلێت چ ڕەبتێکی مەنتیقی هەیە لەنێوان بەشی یەکەمی ئەو قسانە (پێوانەو هۆو گۆڕانی هۆ) لەگەڵ بەشی ناوەڕاست (هۆی هەبوونی کۆسپ لەبەردەم بەراوردکردن ئەوەیە عەقڵی سەلەف بایەخ بە بونیادی زمانەوانیی دەق داوە) لەگەڵ بەشی کۆتایی(شافعی دەڵێت قورئان هیچ وشەیەکی غەیری عەرەبیی تێدا نییەو دەیەوێت قودسیەت بەزمانی عەرەبی بداتو سوننەتیش بکاتە شەریعەتو سوننەت ببێتە دەروازەیەك بۆ شیتەڵکردنی مانای قورئان).

بەڵام زیرەکی لەبەردەم ئەم تێکەڵوپێکەڵییە ئەژنۆی دەشکێتو دەستی خۆبەدەستەوەدان بەرزدەکاتەوە.

خراپیش نییە ئەگەر ئەو ئیزافەیە بکەم: ئەو قسەیەی شافعی کە گوایە میسری لە (الرسالة)دا بینویەتی جیاوازیی هەیە، بۆ نموونە شافعی ناڵێت ئەو کەسانەی دەڵێن قورئان وشەی غەیری عەرەبیی تێدایە خەڵکێکی نەزانن.

میسری پاش ئەنجامەکانی سەرەوە ئەنجامی تری هەیە. ئەو دەڵێت کە شافعی جگەلەوەی هەوڵدەدات بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت زمانی عەرەبی هاوتای نییە بەرگری لە شێوازی زمانی قوڕەیش دەکات، ئەوەش پەیوەندیی بە کۆبوونەوەکەی (السقیفة)و فەزڵی خێڵی قوڕەیشەوە هەیە، ئینجا ئەو بەپێچەوانەی (مالك)و (ئەبو حەنیفە) کە دژی دەسەڵاتی ئومەوییەکان بوون شەرعییەتی ئاینیی داوەتە ئەو دەسەڵاتەو پشتگیریی لێکردووە(ل٦٦) بەڵام هەر میسری خۆی پێناسەی شافعیی کردووەو ژیانەکەی نووسیوە کە ساڵی ١٥٠ بۆ ٢٠٤ی کۆچی ژیابوو(ل٥٦)، دەشزانین کە دەوڵەتی ئومەوی ساڵی ١٣٢ی کۆچی کۆتایی پێهات واتە (١٨) ساڵ بەر لەهاتنی شافعی بۆ دنیا ئیتر چۆن دەتوانین بڵێین شافعی شەرعییەتی بەو دەوڵەتە داوەو پشتگیریی

لێکردووە ؟

نموونەیەکی تری تێکەڵوپێکەڵیی باسەکانی میسری کە نەیزانیوە باسی چی دەکات لە لاپەڕە(٦٧) بەدواوە دەردەکەوێت. میسری دەڵێت: دەگەڕێمەوە بۆ باسی پێوانە لای شافعیو دەڵێم کە شافعی ئەوەندە بایەخی بە پێوانە دابوو بەتەواوی مەبەستەکەی پشتگوێ خستبوو (ل٦٧) .. کەواتە چی؟ کەواتە میسری ڕەخنە لە بەکارهێنانی پێوانە دەگرێت، بەڵام دوایی باسی نموونەیەك دەکاتو دەڕواتو دەڕوات، ئینجا بێئەوەی بەخۆی بزانێت ڕەخنە لەخۆبەستنەوە بە دەق دەگرێت کە پێچەوانەوی بایەخدانە بە پێوانە. سەرەتا باسی فەرموودەیەك دەکات کە لە (الرسالة)ی شافعیدا هاتووە دەربارەی کەسێك کۆیلەی خۆی بفرۆشێتو ئەو کۆیلەیە خاوەن پارە بێت(ل٦٧) ئێستا چاوەڕێین میسری ڕەخنە لەو بایەخدانە بە پێوانە بگرێت کەچی دەبینین باسی لێکدانەوەی شافعی بۆ فەرموودەکە دەکاتو دەڵێت: فەرموودەکە گومانی تێدا نییە کەواتە دەچێتە خانەی سوننەتەوە، پێغەمبەریش نێردراوی خوایەو موسڵمانان لەسەریانە کار بەرەفتارو گوفتاری بکەن(ل٦٧–٦٨) بەڵام ئەمە باسی دەقە نەك پێوانە. جاری چاوەڕێ بکەن!

ئینجا ڕەخنە لە شافعی دەگرێت کە دەقێکی فەرموودە دەکاتە هاوتای قورئان (پێوانە کوای؟!)و ئامادە نییە حەقیقەتی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرچاو بگرێت، ئینجا میسری باسی کۆیلایەتی دەکات کە وەکو سیستەمێکی ئابووری–کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگەی ئیسلامدا ڕەوا بووە، هەڵوێستەکەی شافعیش لەو فەرموودەیە دوو کۆسپی تیۆریو پراکتیکیی دێتە بەردەم؛ تیۆری: لە قورئاندا باسی پێغەمبەر وەکو مرۆڤ کراوە ئیتر

چۆن قسەی مرۆڤ دەبێتە هاوتای وەحی کە دەقی قورئانە؟(ل٦٨).

ئەمە لەڕووی تیۆرییەوە، لەڕووی پراکتیکیشەوە شافعی لەسەر بناغەی سوننەت حوکمی قورئان ئیلغا دەکات، بۆ نموونە قورئان حوکمی جەلدەی داوە بەسەر ژنو پیاوێك زینا بکەن بەڵام شافعی (ل١١١–١١٢ی الرسالة) لەڕیزی پێشەوەی ئەوانەیە کە حوکمەکەیان گۆڕی بۆ ڕەجم(ل٦٩)..(بۆ وەڵامی ئەمە بڕوانە خوارتر) .

ئەمجارەش کوا پێوانە؟ ئەمە چ پەیوەندییەکی بە فەرموودەی کۆیلەکەوە هەیە؟ یەکەم کۆسپ کۆسپە تیۆرییەکە بوو، بەڵام باسی کۆسپی دووەم، کە پراکتیکییە، ناکات بەڵکو باسی شتێکی تر دەکات، ئینجا لەپڕ ((دووەم))ێکی تر دەبینین، میسری دەنووسێت: دووەم: لەهەموو قورئاندا تاکە ئایەتێك نییە سیستەمی کۆیلایەتیی حەرام کردبیّ(ل٦٩).. ئەم تێکەڵییە چییە؟ یەکەمو دووەمو تیۆریو پراکتیکی.. میسری تەنانەت نەشیزانیوە چۆن خاڵەکانی ڕیزبەندی بکات.

ئینجا دەڵێت ئەوەی سەرەوە نموونەیەکە لەسەر ئەوەی... لەسەر ئەوەی... لەسەرئەوەی چی؟ بلیمەتێکم دەوێت بزانێت ئەوەی سەرەوە نموونەیە لەسەر چی.. لەسەر خۆبەستن بەپێوانە؟ بە دەق؟ زینا؟ کۆیلایەتی.... بەڵام میسری خۆشی نازانێت نموونەیە لەسەر چی؟ ئەوەتا شتێکی تر دەڵێت: ئەم نموونەیەو چەندین نموونەی داهاتووی تر: ((دەیسەلمێنن کە عەقڵی سەلەفی لەبنەڕەتدا بۆ ئەوە کاریکردووە سەر لەنویّ مەبەستە گشتییەکانی شەریعەت لەسەر بناغەیەکی تازە دابڕێژرێتەوە)) (ل٦٩).

ئەمە چ پەیوەندییەکی بەوانەی پێشەوە هەیە؟ ئەوە تەنانەت پەیوەنیی

بەپێوانەشەوە نییە چونکە پێوانە بۆ حوکمی (جوزئی)ی نوێیە نەك بۆ بنەمای نوێ، دڵنیاشم میسری نەیزانیوە ((مەبەستە گشتییەکانی شەریعەت)) چییەو وایزانیوە هەر قسەیەکەو وتراوەو نازانێت بنەمایەکی ڕەچاوکراوی ئیجتیهادە (بڕوانە سەرەوە).

## بەرژەوەندی

میسری سوورە لەسەر ئەوەی بیسەلمێنێت کە نەیزانیوە چیی وتووە چونکە دوای ئەو ئامانجەی سەرەوە ئامانجێکی تر دەڵێت ئەویش هەوڵی عەقڵی سەلەف بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی یاسایی لەنێوان حوکمی دەق و حوکمی واقع کە تا دەهات فراوانتر دەبوو(ل٦٩) کەواتە گەڕایەوە بۆ سەر پێوانەو ئیجتیهاد بەشێوەیەکی گشتی بەڵام هەمووی یەك ساتی وریابوونەوەیەیە، چونکە یەکسەر دوای ئەوە دەڵێت کە تێگەیشتن لەو هەولانە پێویستی بەوەیە لە پەیوەندیی نێوان دەق و بەرژەوەندی (المصلحه) تێبگەین(ل٦٩) دوای ئەوەش بە دوورودرێژی باسی بەرژەوەندی دەکات کە دوای بگرەو بەردەیەکی زۆر (باب)ی بەرژەوەندی کە (باب)ێکی فراوانە لە فیقه بۆ شتێکی بچووك بچووکی دەکاتەوە: (( هەموو ئەو بەڵگانە یەك حەقیقەت دەسەلمێنن کە شەریعەت بایەخێکی زۆری بە بەرژەوەندیی ئابووریی خاوەن سامان داوە بێئەوەی سنوورێك بۆ چەندیەتیو چۆنیەتیی سامان بکێشێ)) (ل٧٢).

بەرلەوەش لەو باسەی بەرژەوەندی وردبینەوە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕەکانی پێشوو:

١– ئەو فەرموودەیەی لە (الرسالة)دا هەیەو باسی فرۆشتنی کۆیلەیە هەڵەی وەرگێڕانی تێدایە: لەفەرموودەکەدا وشەی (البائع) هاتووە واتە

فرۆشیار کەچی میسری بە کڕیاری زانیوە.

٢ – وەك وتم میسری بە باسی بایەخدانی شافعی بە پێوانە دەستی پێکردووەو ئەو فەرموودەیەی وەکو نموونە هێناوەتەوە کەچی باسەکانی بەلای پێوانەدا ناچن بەڵکو ئاماژە بۆ دەق دەکەن. میسری سەرچاوەی (الرسالة) بە حەڵاڵی خۆی دەزانێتو ئەو عەبقەرییەتەی لە موناقەشە تێکەڵەکەدا بینیمان دەکات بە هی خۆی.

٣ – میسری باسی سوننەتو پایەکەی دەکات کە بابەتێکە پێویستی بەشارەزایی هەیە کەچی حەقیقەتی ئەو میسرییە نەزانییە لە شەریعەت، ئەوەتا قسەی شافعی نەقڵ دەکات کە حوکمی سوننەت وەکو قورئان تایبەت دەکاتە گشتو حوکمێکی گشتیش دەکاتە بناغەی حوکمێکی تایبەت – تخصیص العام وتعمیم الخاص (ل٦٨). جگەلە ئاڵوگۆڕیی زاراوە عەرەبییەکانو وەرگێڕانە کوردییەکە (دەبوایە بینووسیایە: تعمیم الخاص وتخصیص العام) زاراوەی (تخصیص العام) واتای (حوکمی گشتی دەکاتە بناغەی حوکمی تایبەت) نادات. (تخصیص العام) بریتییە لەوەی حوکمێکی گشتیمان هەیە، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی گۆشتی مردارەوەبوو حەرام دەکات، کە ئەمە حوکمێکی گشتییە بەڵام فەرموودەیەك هەیە گۆشتی ماسی حەڵاڵ دەکات هەرچەندە مردارەوەبووە، واتە ئەمەیان حوکمە گشتییەکە تایبەت دەکات. ئیتر میسرییەك کە ئەو شتانەی ئوسووڵی فیقە نەزانێت چۆن دەتوانێت باس لە ڕەوایەتیی سوننەت بکات (خۆ ئەو تەنانەت واتای ئوسووڵی فیقهیشی نەزانیوە).

هەموو هونەرەکەی میسری لە کۆکردنەوەی زانیاریو ((بردن))ی ناوی سەرچاوەیە، چۆنیش تێگەیشت (لە زۆربەشیان تێناگات) زانیارییەکان

دەخاتە پاڵ یەك، دواییش تەعلیقێکی خۆی دەنووسێت. میسری بۆ زانیارییە سەقەتکراوەکەی سەرەوە پەراوێزێکی سەقەتتر دەنووسێت ئەویش گوایە ((حوکمی تایبەت بکرێتە گشتو گشتیش بەسەر تایبەتدا بسەپێنرێ بۆ ئەوەی بڵێ دەق توانای چارەسەرکردنی هەموو کێشەیەکی هەیە)) (ل٦٨ پەراوێز).

ئینجا دەڵێت کە مەترسیی ئەو فیکرەیە لەوەدایە دەیەوێت ڕۆڵی عەقڵ ئیلغا بکات (هەمان پەراوێز) بەڵام چۆن؟ نازانین! میسری شتێکی لەشوێنێك خوێندۆتەوەو حەز دەکات دووبارەی بکاتەوە ئەگەر چی شوێنەکەشی گونجاو نەبێت. میسری لەوەوە دەگاتە ئەنجامێکی سەیری تر سەبارەت بە شافعی ئەویش: (( ئینجا بیسەلمێنێت کە خەڵکی غەیری عەرەب ناتوانن لەزمانی قورئان تێبگەن)). چۆن؟ چ پەیوەندییەك هەیە لەنێوان ئەمە لەلایەكو حوکمی تایبەتو گشتیو چارەسەری هەموو کێشەیەكو ئیلغاکردنی عەقڵ لەلایەکی تر؟ هەر قسەیەو وەکو دروشمەکان فڕێدراوە. لەهەموو ئەوانەش سەیرتر ئەوەیە دوای قسەکەی سەرەوە یەکسەر ناوی کتێبەکەی شافعی دەباتو دەنووسێت: بڕوانە الرسالەو ئاماژە بۆ لاپەڕە (٥)ی ئەو کتێبە دەکات، واتە ئەو قسانە، بەتایبەتی قسەکەی ((غەیری عەرەب لەقورئان تێناگەن)) قسەی شافعین، بەڵام مەخابن! ئێمە دوو لاپەڕە (٥)ی هەمان چاپمان هەیە؛ یەکەمیان یەکەم لاپەڕەی پێشەکەییەکەی (ئەحمەد شاکر)ـەو بە باسی شافعی دەستپێدەکات، لە دووەمیشیان هێشتا قسەکانی شافعی دەستیان پێنەکردووەو لەو لاپەڕەیەدا وێنەیەکی بەشی یەکەمی کتێبەکەیە بە دەستوخەتی ئەلڕەبیع کوڕی سولەیمانی قوتابیی شافعییە!

٤ – هەر لەبارەی شافعییەوە میسری دەڵێت ئەگەر قورئانو فەرموودە

هاوتای یەك بن وەك شافعی دەڵێت كەواتە سوننەت دەتوانێت حوكمی قورئان بەتاڵبكاتەوە، ئینجا میسری ڕەخنە دەگرێتو ئایەتێك دەهێنێتەوە كە پێغەمبەر بۆی نییە حوكمی قورئان ئیلغا بكات(ل٦٩) ئەوەش نیشانەیەكی ترە كە میسری ناوی كتێبەكەی شافعی (الرسالة)ی لەسەرچاوەیەكی تر ((بردووە)) چونكە شافعی خۆی ئەو ئایەتەی هێناوەتەوەو دەڵێت ئەوە ڕوونكردنەوەی ئەو شتەیە كە وتم كە تەنها كتێبی خودا كتێبی خودا نەسخ دەكات (الرسالة، ل١٠٧)

٤- گوایە شافعی حوكمی جەلدەی زیناكەری كردووە بە ڕەجم كە پێشتر ئاماژەمان بۆ كرد: پێویست ناكات بۆ هیچ سەرچاوەیەكی شافعی بگەڕێینەوە تا بزانین ئەوە ڕاست نییە چونكە بە دەقی قورئان حەددی زینا بۆ پیاوێك ژنی نییە یان ئافرەتێك مێردی نییە هەشتا جەلدەیە. میسری ئەو ئایەتەی نووسیوە بەڵام نەیزانیوە ئەمە لەو حاڵەتەیە كە باسی دەكەین لەكاتێكدا ڕەجمكردن بۆ حاڵەتی ئەو پیاوەیە كە ژنی هەیە یان ئەو ژنەیە كە مێردی هەیە، كەسیش حوكمی یەكەمی نەگۆڕیوە، ئەوەندە هەیە باسی ئەوە كراوە كە ئایەتێك بۆ حاڵەتی دووەم (ڕەجم) هەبووە بەڵام لە قورئاندا نەنووسراوە هەرچەندە حوكمەكەی ماوە،[25] هەروەها بە سوننەتی فیعلی ڕەجمكراوە، واتە وەك وتم میسری كە باسی عەقڵی سەلەفو شەریعەت دەكاتو ڕەخنە دەگرێتو تیۆریزە دەكات...تاد ئەو زانیارییە سادەیەی نەزانیوە. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ (الرسالة، ل١١١-١١٢) دەبینین شافعی باسی مەسەلەی نەسخكردنی سوننەت بە قورئان دەكاتو لەمیانەی ئەوەدا

[25] بۆ ئەمە بڕوانە تەفسیری ئیبنو كەثیر، سەرەتای تەفسیری سوورەتی ئەلنوور، بەرگی ٣، ل٢٦٠-٢٦١.

چەند نموونەیەك دەهێنێتەوە وەك شتانێك زانایان دەزانن کە ڕاست نین وەك ئەوەی ڕەنگە ڕەجمکردن نەسخ کرابێت ئەویش بە ئایەتی جەلدە لێدان.

هێندە بەسەو بگەڕێمەوە سەر مەسەلەی (بەرژەوەندی) کە وەك وتم میسری دەیهێنێتو دەیباتو دوایی لەشوێنێکی ترەوە دەریدەکاتەوە.

میسری هەڵەیەکی گەورە دەکاتو دەڵێت هەرچی حوکمی دەقە لەچەند ئایەتێك تێپەڕ ناکات(ل٧٠) چەند ئایەت؟ وشەی چەند وامان لێدەکات بیر لە دە ئایەت بەرەو خوار بکەین، بەڵام بەداخەوە ئایەتەکانی ئەحکام زۆر لەوە زۆرترن، ڕاستە لەچاو هەموو قورئان کەمن بەڵام ((چەند)) ئایەت نین بەڵکو دەیان ئایەتن[26]، ئایەتە کەمەکان ئەوانەن کە وردکارییەکانی ئەحکام دەستنیشان دەکەن.[27]

میسری دوای ئەوە باسەکە دەباتە شوێنێکی تر، ئەو لەسەر بەرژەوەندی بەردەوام دەبێتو دەڵێت بەپێی ئیسلام شەریعەت خێرو شەڕ بۆ مرۆڤ ڕووندەکاتەوە، بەپێی ئەمەش ئەرکی شەریعەت پاراستنی بەرژەوەندیی گشتییە، بەڵام ئاخۆ بەرژەوەندیی تاکەکەس لەکوێی ئەو سیستەمەدایە؟ کێ مافی موڵکایەتیی هەیە: مرۆڤ یان کۆمەڵ؟ لای میسری چەندێتیو چۆنێتیی موڵکایەتی دیار نییە، دوای ئەوە چەند ئایەتێك دەهێنێتەوە بۆ ((سەلماندنی)) ئەوەی کە شەریعەت بایەخی بە بەرژەوەندیی دەوڵەمەندەکان داوە(ل٧٠ –٧٢).

جگە لەوەی میسری بەرژەوەندیی گشتیی لە سنووری موڵکایەتی

---

[26] بڕوانە د. زەیدان، الوجیز فی اصول الفقه، ل١٥٦ -١٥٧ کە نووسەرەکە، بە پشتبەستن بە سەرچاوەی تر ژمارەی ئایەتەکانی هەربابەتێك دەژمێرێتو کۆکەیان ٢٢٨ ئایەتە.

[27] بڕوانە الوجیز فی اصول الفقه، ل ١٥٨.

تەسککردۆتەوە لە گریمانەی ((نادیاربوونی سنووری موڵکایەتی)) دەگاتە ئەو ((ئەنجامەی)) کە شەریعەت بەرژەوەندیی دەوڵەمەندەکانی لەلا مەبەست بوو کە لەڕاستیدا هیچ پەیوەستێك لەنێوان ئەو دوانەدا نییە. بێگومان ئەگەر ئیسلام سنووری موڵکایەتیی دیاری بکردایە دەوترا شەریعەت مرۆونەتی نییەو تەنها بۆ ئەو سەردەمە دەشیا، بەڵام کە دەبینن ئەو سنوورانە بە وردی دیارینەکراون دیسان ئەوە دەکەنە ڕەخنە.

نەشارەزایی نووسەر لە ئیسلام لە شتێکی تردا دەردەکەوێت ئەویش بێئاگاییەکەی لەو فەرمانانە کە موڵکایەتیی گشتی دەپارێزن‌و کە یەکێکیان دەڵێت: (( خەڵکی لە سێ شت بەشدارن: لەوەڕو ئاو و ئاگر—ئەحمەدو ئەبو داوود ڕوایەتیان کردووە))، بە زاراوەکانی ئەمڕۆش سامانی ئاوو سامانی نەوت‌و هاوشێوەکانی، هەروەها لەوەڕگەکان.. موڵکی گشتین‌و کەس بۆی نییە پاوانیان بکات.

نووسەر (ل٧٢) دوایی دەچێتە سەر پەیوەندیی دادپەروەری‌و شەریعەت‌و قسەکەی شافعیش دەهێنێتەوە کە عەدالەت گوێڕایەڵیی خودایە. میسری دەنووسێت: شافعی بەڕاشکاوی ئەم مەسەلەیە یەکلایی دەکاتەوەو دەڵێت: (عەدالەت بێجگە لە ئیتاعەتی خواوەند هیچی تر نییە) ئاماژەش بۆ لاپەڕە (٢٥)ی کتێبەکەی شافعی دەکات. قسەکەی شافعی لەو لاپەڕەیەدا ئەمەیە (عەدل ئەوەیە کار بە گوێڕایەڵی خودا بکرێت)، ئەویش لەمیانەی ڕوونکردنەوەی ئەو دوو کەسەی (ذوا عدل)ـن‌و دەکرێنە شایەت لە مەسەلەی تەڵاق‌و لەو ئایەتانەدا باس لە خواترسان‌و زوڵم نەکردن لە ئافرەتی تەڵاقدراو کراوە (ئایەتی تریش هەن باسی ئەو دوو خاوەن عەدلە دەکەن)، قسەکەی شافعیش لەمیانەی باسێکی تردا هاتووە ئەویش چۆنێتیی ڕوونکردنەوەی

فەرمانەکان لەلایەن خوداوە. ئینجا میسری دەنووسێت: شافعی دوابەدوای ئەم تاریفە مەبەستەکەی ڕوونتر دەکاتەوەو دەڵێت (ئیتاعەتی خواوەند واتە ئیتاعەتی شەریعەت)و ئاماژە بۆ هەمان لاپەڕەی الرسالة دەکات، کە شتی وا لە لاپەڕەیەدا، بەڵکو لە بەشەشدا، نییەو ئەوە نیشانەیەکی ترە کە میسری ئەو زانیارییانەی بە سەقەتی لە سەرچاوەیەکی تر ((بردووە)).

قەڵەمی میسری دوای ئەوە دەڕواتو دەڕوات، قەڵەمەکەی ئەمەی خوارەوە دەنووسێت (یان نەقڵ دەکات): گوێڕایەڵیی خوداش واتە گوێڕایەڵیی شەریعەت، شەریعەتیش یانی یاسا، یاساش چەند بنەمایەکە دەسەڵات وەك ئامڕازی حوکمڕانی بەکاریدەهێنێت، ملکەچکردنی تاکەکەسیش بۆ یاسا لە جەوهەردا شەرعیەتدانە بە دەسەڵات با ئەو دەسەڵاتە عەدالەتیش پەیڕەو نەکا(ل٧٢ –٧٣).

هەرچەندە نووسەرەکەمان بەشایەنی ئەوە نازانین موناقەشەی مەسەلەکانی شەریعەتو عەدالەتی لەگەڵدا بکەین بەڵام بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە تێنەپەڕێت بەکورتی بە خوێنەر دەڵێین: ئەوەی میسری ڕیزی کردووە جگە لە نەزانی دوورکەوتنەوەیە لە جەوهەری باسی عەدالەتو شەریعەت چونکە زانایانو بانگخوازان دەڵێن دادپەروەری لە چەسپاندنی شەریعەتدایە، چەندیش فەرمانڕەوا لە شەریعەتەوە نزیك بێت دادپەروەری دەچەسپێنێت (بۆ نموونە خەلیفە ڕاشیدەکان) بەپێچەوانەشەوە (ئومەوییەکانو عەباسییەکانو سەردەمەکانی دواتر تا ئەمڕۆ)، ئیتر ئەوە نەشارەزاییە یان ستەمکردنە عەدالەتو شەریعەت بە دوو شتی جیاواز بزانرێن.

میسریش کە بینیمان لە مەسەلەکانی فیقه و شەریعەتو فەرموودە

زانیاریی تەواوی نییە یان زانیاریی ئاوەژووی هەیە پێمان دەڵێت موجتەهیدەکان نەیانتوانیوەو ناتوانن وەڵامی پرسیاری: ((شەریعەت بەرژەوەندییە یان بەرژەوەندی شەریعەتە)) بدەنەوە، ئەم قسەیەی میسریش بازێکە لە دادپەروەرییەوە بۆ بەرژەوەندی، ئاشکراشە بەرژەوەندی هەموو کات دروست نییە، بەڵام بەو بازە ڕازین ئەگەر موعالەجەی بابەتەکە دروستو مەنتقی بێت.

میسری دوو ئیحتمال دادەنێت: ئەگەر شەریعەت لەگەڵ بەرژەوەندیی مرۆڤدا ناگونجێت کەواتە شەریعەت دوورە لەکاروباری دونیاییەوە، ئەگەریش بەرژەوەندی شەریعەتە کەواتە لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخی ژیان شەریعەتیش دەگۆڕێت(ل٧٣).

## دەقو زمان

میسری لەبەرئەوەی نازانێت موناقەشەی چ شتێك دەكات دەبینین یەكسەر پاش باسی شەریعەتو بەرژەوەندیو بێئەوەی بواری هەناسەیەك بە خۆی بدات كێشەكە دەكاتە كێشەی ((دەق))و بەرژەوەندیو بە وتەی خۆی ئەو كێشەیە یەكلانەبۆتەوەو مەحاڵە یەكلابێتەوە چونكە ئەسڵی كێشەكە لەوەدایە دەقێكی نەگۆڕ دەیەوێت بەڕەهایی حوكمی واقعێك بكات بەردەوام لەگۆڕاندایە(ل٧٣)، بەڵام كێ باسی ئەو كێشەیەی كردووە؟ هەر لەكۆنەوە دەرك بەوە كراوە كە ڕووداو (=واقعات)ی نوێ دێنە پێشەوە كە دەق ڕاستەوخۆ شتی لەبارەوە نەوتوون بۆیەش ئیجتهاد بەتایبەتی پێوانە هاتەپێش. پاشان قسەیەكی خۆش دەكات كە گوایە لە قورئاندا لایەنی ڕەوانبێژی بەسەر زمانی یاسادا زاڵە ئەمەش وایكردووە لەدوای مردنی پێغەمبەرەوە هەر دەقێك بە چەند جۆرێك لێكبدرێتەوە(ل٧٣) یانی چی

لایەنی ڕەوانبێژی بەسەر زمانی یاسادا زاڵە؟ میسری هەر خۆی پێشتر چەند ئایەتێك دەهێنێتەوە، با یەکێکیان هەڵبژێرین (وأحل الله البيع وحرم الربا)، ئایا لەم ئایەتەدا کە تێیدا خودا کڕینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو (سوو)ی حرام کردووە زمانی یاسا کزەو زمانی ڕەوانبێژی زاڵە؟ پاشان ئەمە چ موبالەغەیەکە هەر دەقێك بەچەند جۆرێك لێکدراوەتەوە؟ هەر دەقێك؟ ئەوە قسەی کەسێکە نازانێت قورئان باسی چی دەکات. ئەوەی جێگەی موناقەشە نییە بەشێکی ئایەتەکان نەك هەموویان بە دوو واتا یان زیاتر لێك دەدرێنەوە، خودی قورئانیش ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە قورئان دوو بەشە: ئایەتە (موحکەم)ـەکانو ئایەتە (موتەشابە)ـەکان کە ئەمانەی دوایی چەند واتایەك هەڵدەگرن.

## جارێکی تر موجتەهیدو دەسەڵات

پاشان میسری ئەو باسە دووبارە دەکاتەوە کە دەسەڵات ویستی دەزگایەکی فیقهی هەبێتو ئیجتهاد هەوڵێك بوو بۆ شەرعیەتدان بە دەوڵەت دژی نەیارەکانی(ل٧٤)[٢٨]، ئەمەش تەنها قسەیە چونکە فیقە تەنها سیاسەتو حوکمڕانی نییە، پێشتریش وتبووم میسری نازانێت کە تەنها بەشێکی زانایان لەگەڵ دەسەڵاتدا بوون لەکاتێکدا ئەوانی تر، بەتایبەتی

[28] میسری داواکەی مەنسووری خەلیفەی عەبباسی لە مالك کە (الموطأ) بنووسێتەوە دەکاتە بەڵگە(ل٧٤) کتێبەکەی (القطان)یش دەکاتە سەرچاوە (بەڵام دەنووسێت لاپەڕە ٣٥٠) بەڵام لەهەمان کتێبو هەمان لاپەڕە ئەوەش هاتووە کە هاڕون ئەلڕەشید ویستی مەزهەبەکەی مالك بەسەر هەموو وڵاتاندا بسەپێنێتو مالك ڕازی نەبوو (القطان، تاريخ التشريع، ص٢٤٤) ئینجا ئەگەر دامەزراوەی فیقهی ڕەسمی هەبوایە بۆچی خەلیفەی داوای ئەوەی دەکرد، کە داواشی کرد چۆن لە مالکی قبووڵ کرد قسەکەی بشکێنێت؟

خاوەنەکانی چوار مەزهەبە بڵاوەکەی ئەمڕۆ، خۆیان لەدەسەڵات دووردەخستەوە. میسری پاش ئەوە دژ بەخۆی قسە دەکات چونکە باسی ناکۆکی نێوان موجتەهیدەکان دەکات کە گوایە ئەو ناکۆکییانە بۆ خواستی خودا گەڕاندۆتەوە(ل٧٤) پرسیارەکەش ئەوەیە: دەوڵەت چۆن ڕێگە بەو ناکۆکییە دەدات ئەگەر خۆی ویستوویەتی دامەزراوەی فیقهی هەبێتو لەخزمەتی بەشەرعکردنی ئەودا بێت؟ دیارە میسری کە زانیاری لێرەو لەوێ کۆدەکاتەوە ئاگای لەو ناڕێکییانە نییە.

## سوننەتو تەشریع

لە بەشی داهاتوودا زیاتر لەسەر سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع دەدوێین، جیاکردنەوەی ئەو بەشەش لەبەر ئەوەیە میسری زانیارییەکانی لە کتێبێکی دیاریکراو ((بردووە)). ئەو کورتەیەی خوارەوەش لێرەدا بەسە:

میسری بەو داماوییەی خۆی لە قورئانو زانستی فەرموودەو فیقهـ ویستوویەتی موناقەشەی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع بکاتو بەحسابی خۆی ڕەخنەی لێبگرێت. میسری خاڵی یەکەمی ڕەتکردنەوەی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع دەڵێت ئەویش کە زۆربەی ئەو ئایەتانەی موجتەهیدان دەیانکەنە بەڵگە پەیوەندییان بە حاڵەتی تایبەتییەوە هەیە نەك تێکڕای موسڵمانان. سەرەتا ئایەتی ((وما اتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا –الحشر:٧)) دەبەستێتەوە بە حاڵەتی تایبەت ئەویش دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕو ئەو ئایەتە حوکمێکی گشتی نییە بۆ هەموو موسڵمانان کە بۆ هەموو شتەکان فەرمانی پێغەمبەر جێبەجێ بکەن(ل٧٧) پاشان ئایەتی ((ياايها الذين امنوا اطيعوا الله واطيعوا

الرسول– النساء: ٥٩)) کە بەڵگەیەکی تری موجتەهیدانە لای ئەو بۆ مەسەلەیەکی دیاریکراو هاتووە ئەویش ڕووداوەکەی عەبدوڵڵا کوڕی حوذافە(ل٧٧) ئینجا ئایەتی ((فليحذر الذين يخالفون عن امره ان تصيبهم فتنة .... تا عذاب اليم – النور ٦٣)) باسی حاڵەتێکی تایبەت دەکات ئەویش چۆنێتیی ڕەفتارکردن لە مەجلیسی پێغەمبەر(٧٧–٧٨) ئایەتی ((وما كان لمؤمن ولا مؤمنة اذا قضى الله ورسوله امرا ان يكون لهم الخيرة من امرهم – الاحزاب ٣٦)) ئەمە فەرمانێکی گشتی نییە سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەر فەرمانێکی دا ئیتر نابێت کەس سەرپێچی لێ بکات بەڵکو ئەو ئایەتە باسی حاڵەتێکی تایبەت دەکات کە پەیوەندیی بە ڕازینەبوونی (زەینەب کچی جەحش)–ە کە شوو بە (زەید کوڕی حاریثة) بکات(ل٧٨) .

ئایەتی ((فلا وربك لايؤمنون حتي يحكموك فيما شجر بينهم ثم لايجدوا في انفسهم حرجا مما قضيت ويسلّموا تسليما –النساء)) پەیوەندیی بە کێشەی (زوبەیر کوڕی ئەلعوام)و موسڵمانێکی مەدینە هەبوو لەسەر نۆرەی ئاو(٧٨).

ئەو وەڵامەی میسری (کە بێگومان لە نووسەری تر وەریگرتووە بەڵام لێرەدا ناوی نەبردووە) بێماناترین وەڵامە چونکە ئەگەر وا بێت پێویستە چەندین ئایەتی قورئان بۆ چارەسەری کێشەی تایبەتی هاتبێ‌و هیچ شتێکیان پەیوەندیی بە هیچ کەسێکی تری موسڵمانەوە نەبێت، ئەگەر واشبێت بۆچی ئایەت بەتایبەتی بۆ ئەو کێشە تایبەتانە دێنە خوار؟ بۆچی بە فەرمانێکی پێغەمبەر چارەسەر نەکران؟وەنەبێت زانایان ئاگایان لەوە نەبووبێت کە ئەو ئایەتانە لە ڕووداوێکی دیاریکراودا هاتبوونە خوارەوە بەڵام ئەو حاڵەتە تایبەتانە بوون بە تەشریع بۆ هەموو موسڵمانان ئیتر قورئان کە ئاماژەی بۆ ڕووداوێك کردووە پاشان فەرموویەتی (ئەی ئیمانداران گوێڕایەڵی

پێغەمبەر بن) ئەو فەرمانە بۆتە حوکمێکی گشتی، لەفزی ئایەتەکەش تایبەتکردنی بە کەسێکی دیاریکراوەوە هەڵناگرێت، خۆ ئەگەر وا بوایە قورئان دەیوت(ئەی عەبدوڵڵا کوڕی حوذافە گوێڕایەڵیی خوداو پێغەمبەر بە)، یان دەیوت : فلانو فلان بەم شێوەیە لە مەجلیسی پێغەمبەر هەڵسوکەوت بکەن، یان دەیوت ئەی زەینەب پێویستە شوو بە زەید بکەی، یان ئەی کابرای ئەنصاری ئیمان ناهێنی تا بەحوکمی پێغەمبەر ڕازی نەبی، ئینجا جگە لەو کەسانە موسڵمانی تر بۆیان هەیە گوێڕایەڵیی پێغەمبەر نەبنو بە حوکمەکەی ڕازی نەبن، ئەمەش جگە لە سەخافەتی عەقڵ هیچی تر ناگەیەنێـت.

زانایان لەبەر ئەو شتانە ئەو بنەمایەیان دامەزراندبوو: ((العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب)) واتە تەماشای لەفزی گشتیی وشەکانوڕستەکان دەکرێت نەك هۆی هاتنی دەقەکە.[29]

خۆ ئەگەر حەزمان لە عینادیو لە سەخافەتی عەقڵ کردو وتمان نەخێر ئەو ئایەتانە تایبەتن بەو ڕووداوانەو فەرمانی گوێڕایەڵیی پێغەمبەر تەنها ئەو کەسانەو ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە دیسانەوە ئەو ڕووداوانە دەبنە تەشریع بۆ حاڵەتە هاوجۆرەکان، ئەمەش هاوشێوەی بنەمایەکی یاساییە کە پێی دەوترێت (الحكم بالسابقة القضائية) واتە کە ڕووداوێك دەچێتە بەردەم قازی تەماشا دەکات ئەگەر پێشتر حاڵەتێکی هاوجۆر هەبێت ئەو کاتە حوکم لەو حاڵەتە نوێیە بەپێی حوکمی حاڵەتە کۆنەکە دەکات، ئەوەش لەزۆر وڵاتدا هەیەو قەزای بەریتانیا زۆر بەوە ناسراوە.

خاڵی دووەمی ڕەتکردنەوەی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع

[29] بڕوانە: د. زیدان، الوجیز فی اصول الفقه، ل٣٢٤.

(کە دیسان دڵنیام قسەی نووسەری ترە) ئەوەیە قورئان تەئکیدی کردووە کە هەموو شتێکی تێدا ڕوون کراوەتەوەو تاکە سەرچاوەی شەریعەتە (ئەمەیان لە قسەی خۆی دەچێت چونکە کەس ئەو قسە بێبنەمایە ناڵێت گوایە ئایەتی قورئان هەیە بڵێت قورئان تاکە سەرچاوەی شەریعەتە) ئیترچ پێویست بە سەرچاوەیەکی تری شەریعەتە؟(ل٧٨).

میسری ئاگای لە زانایان نییە کە باسی قورئانو سوننەتیان بەم جۆرە کردووە: قورئان شتەکانی بەگشتی ڕوونکردۆتەوە، وردەکارییەکانیش لە سوننەتدا دەدۆزینەوە، بۆ نموونە قورئان ڕیبا (سوو)ی حەرام کردووە سوننەتیش چەند جۆرێکی ڕیبای دیاریکردووە. سەیریش ئەوەیە هەر ئەو کەسانەی گومان لە سوننەت وەکو سەرچاوەیەکی تەشریع دەکەن گوایە قورئان وتوویەتی هەموو شتێکی تێدا ڕوونکراوەتەوە، هەرئەوانە لە موناسەبەیەکی تردا ڕەخنە لە قورئان دەگرن کە ڕاست نییە هەموو شتێکی تێدا ڕوونکراوەتەوە.

خاڵی سێیەمی ڕەتکردنەوەی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع ئەوەیە سەدەیەك پاش مردنی پێغەمبەر دەستکراوە بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی(میسری، ل٧٩). دوای ئەو قسەیەش نووسەرەکەمان (ل٨٠) دەڵێت: پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکان کۆکردنەوەو نووسینەوەی فەرموودەیان لا پەسەند نەبووەو یەکەم کەس بیری لەمە کردبێتەوە خەلیفەی ئومەوی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز (٩٩–١٠١ کۆچی) بوو لەبەرئەوە... لەبەرئەوە... لەبەرئەوە چی ڕووی دا؟ دەگەڕێینو نازانین چ ئەنجامێکمان لەمەوە دەستدەکەوێت، واتە دەبوایە ئەنجامی ئەو ڕاستییەی کە سەدەیەك دوای مردنی پێغەمبەر دەست بەکۆکردنەوەی فەرموودەکان

کرا ئەوە بێت کە ناتوانین سوننەت بە سەرچاوەی دووەمی تەشریع بزانین، بەڵام نە میسری ئەو ئەنجامەی وتووە، نە ڕاستییەکەش دەتوانێت بمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامە. فەرموودە بنووسرێتەوە یان نەنووسرێتەوە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە پیاوانی ئەو سەردەمە لەبەریان بووەو کاریان پێدەکرد.

واتە تەنها نووسینەوەی سوننەت شەرعیەتی پێنادات ببێتە سەرچاوەیەکی تەشریع چونکە ئەو شتەی شەرعیەتی پێدەدات مەسەلەیەکە لەدەرەوەی مەسەلەی نووسینەوەو کۆکردنەوەیە کە بریتییە لەوەی سوننەت وتارو کرداری پێغەمبەرە، شتێکیش کە نووسینەوە ئەنجامی دا پاراستنی سوننەت بوو لە فەوتان،[٣٠] بشفەوتایە نەدەبووە سەرچاوەیەکی تەشریع بەڵام فەوتانی سەرچاوەیەکو شەرعیەتی ئەو سەرچاوەیە دوو شتی جیاوازن. بەم شێوەیە ئەو بەناو بەڵگەیە (واتە فەرموودە دوایی نووسرایەوەو کۆکرایەوە ئەمەش بەڵگەیە کە سەرچاوەی تەشریع نەبووەو فەقیهەکان کردوویانە بە سەرچاوە) لەسەر بناغەیەکی پتەودا ڕاناوەستێت بەڵکو لەسەر هیچ بناغەیەکیش ناوەستێت، خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ میسرییەکەی خۆمان دەبینین، ئەمەشم پێش کەمێك وتبوو، ئەو نیوەی ((بەڵگە))کەی باس کردووەو نەیزانیوە چی لەو نیوەیە بکات، هۆکەشی

[30] ئەمەش زۆر دوورە چونکە تەنانەت ئەگەر هەوڵەکانی عومەریش نەبوایە کەسانێك هەبوون ئەو کاتە فەرموودەیان دەنووسییەوەو دواتریش کەسانی وا پەیدا دەبوون چونکە زەرووړەتێکەو خۆی دەسەپێنێت. میسری لێرەدا کە کارێکی مێژوویی دەداتە پاڵ مرۆڤێك زۆر لە مارکسیەت دوور دەکەوێتەوەو لەو فەلسەفەیە نزیك دەکەوێتەوە کە دەورێکی گەورە بە تاکەکەس لە مێژوودا دەدات.

بریتییە لە هۆیە سەرەکییەکەی هەموو هەڵەکانی تری ئەویش بەرهەمەکەی بەشێوەیەکی ناشەرعی ڕووناکیی بینیوەو خاوەنەکەی بەنەشارەزایی لەسەر بەرهەمی خەڵکی تر دەژی.

میسری دوای ئەوە خاڵی چوارەم باس دەکات کە بریتییە لە ڕەتکردنەوەی عیسمەتی پێغەمبەر، ئەو عیسمەتەی بووەتە بەڵگەیەکی زانایان لەسەر ئەوەی سوننەتەکەی سەرچاوەیەکی تەشریعە.

میسری دوای زیاتر لە چوار لاپەڕە لە باسی عیسمەت دەپرسێت: ئەگەر مەسەلەکە وا نەبێتو ئەگەر خەلیفە ڕاشیدەکان نەیانهێشتبێت کەس بەکۆکردنەوەو نووسینەوەی فەرموودە خۆ خەریك بکات ئیتر لەسەر چ بنەمایە سوننەت کرایە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت؟(ل٨٦).

ئا لێرەداو پاش ئەو هەموو لاپەڕانە نیوەی تری بەڵگەکـەی بیردەکەوێتەوە بەڵام خۆش ئەوەیە یەکسەر دوای قسەکەی سەرەوەو بێئەوەی بیریبکەوێتەوە کە ئەو باس لە سەرجەم بەڵگەکانی دژ بەکردنی سوننەت بە سەرچاوەی تەشریع دەکات باسەکە دەباتەوە سەر مەسەلەی سوننەتو لاپەڕەو شتێك لەسەر نووسینەوەی سوننەت دەڕوات(ل٨٦–٨٧)، یەکسەریش باز دەدات بۆ ((بیانوویەکی تری موجتەهیدان)) بۆ کردنی سوننەت بە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت ئەویش ((گوایە قورئان بەکورتیو چڕی ئەرکە ئایینییەکانی دەستنیشان کردووە))(ل٨٧)، ئینجا شتێکی خۆش دەڵێت ئەویش گوایە مەسەلەکانی نوێژو ڕۆژوو و حەج ئەرکی ئایینینو پێویستی دەکرد پێغەمبەر لەسەرەتاوە مەرجەکانی ئەو ئەرکانەی دەستنیشان بکردایە بەڵام ئەمانە ئەرکی ئایینینو ناچنە خانەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانەوە(ل٨٨). مەبەستی میسری لێرەدا ئەوەیە سوننەت تەنها

بۆ ئەرکە ئایینیەکانە بەڵام مەسەلەکانی کۆمەڵگەو دەوڵەتو فەرمانڕەوایی پێویست بە ڕوونکردنەوەیان نەبوو، ئەمەش قسەیەکی خۆشە چونکە هێندەی بزانم یەکەمجارە سوننەت وەك سەرچاوەی تەشریع تەنها بۆ نوێژو ڕۆژوو و حەج قبووڵ بکرێت، لەوەش خۆشتر ئەوەیە میسری قسەی خەڵکی تری دەهێنایەوە سەبارەت بە گومانکردن لە سوننەت وەك سەرچاوەیەکی تەشریع کەچی لێرەدا سوننەت دەکاتە سەرچاوەیەك بۆ تەشریع، سەرباری ئەوەش ئیبداع دەکاتو ئەو تەشریعە تەنها بۆ شتی دیاریکراو دادەنێت.

میسری دوای ئەوە بازێکی تر بۆ مەسەلەیەکی تر دەدات ئەویش کە قورئان هەموو شتە حەرامکراوەکانی دەستنیشان کردووەو ئەوەی قورئان لێیان بێدەنگ بووە حەرام نین، لەمەشەوە دەچێتە سەر موجتەهیدان کە قبووڵیان نەکردووە بازنەی حەرام بەو تەسکییە بمێنێتەوەو پێوانە (القیاس)یان کردووە بەو میکانزمەی بازنەی حەرام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ فراوانتر بکات(ل٨٨–٨٩). دواتر دەچێتە سەر شافعی کە خۆیو هاوەڵانی ویستیان لەسەر بناغەی یەکدەنگی (ئیجماع)و پێوانە مەسەلەی دەسەڵات بخەنە ناو چوارچێوەیەکی تیۆرییەوە(ل٩٠). ئەو هەموو بازبازێنەی میسری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو دەرەقەتی ئەو مەسەلانەی نییەو هەموو ئیشەکەی بریتی بووە لە نەقڵکردن لە سەرچاوەکانو بێئەوەی بزانێت یان بیربکاتەوە چەند سەرەتای قسەکانی لەگەڵ کۆتاییەکاندا گونجاونو چەند بەیەکەوە ڕەبتیان هەیە.

کۆتایی ئەو باسانەش لە کتێبی (السلطة في الاسلام)ی (عبدالجواد یاسین) وەرگرتووەو هەندێك جار ناوی هێناوەو زۆر جار سەرچاوەکانی ئەوی ((بردووە)) گوایە خۆی ئەو سەرچاوانەی بینیوە، ئەمەش هەڵدەگرم بۆ

بەشێکی ترو جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەر سەرەتای باسەکە ئەویش زۆر بەکورتی:

**مەسەلەی نووسینەوەی سوننەت** : (میسری سەرەتا لە لاپەرە ٧٩ دا باسی ئەوەی کردووەو دوایی ڕەشەبا فڕێیداوەتەوە سەری‌و لە لاپەرە ٨٦ ـەوە سەری دەرکردووە). وتم نووسینەوەی سوننەت‌و کردنی بە سەرچاوەیەکی تەشریع دوو شتی جیاوازن. ئەمەش چەند نموونەیەك لە تێگەیشتن لە باسەکە:

<u>یەکەم</u>: قسەی عومەر دەگێڕێتەوە: تا دەتوانن هیچ لەبارەی پەیامبەرەوە مەگێڕنەوە(ل٨٠) ئەوەشی لە یاسین وەریگرتووە لەکاتێکدا دەقەکە دەڵێت (اقلوا الرواية عن رسول الله) واتە (کەم بگێڕنەوە) نەك (هیچ مەگێڕنەوە). [٣١]

<u>دووەم</u>: دەڵێت : تەنانەت لەسەر گێڕانەوەی سوننەت سێ کەسی لە یاوەرانی پێغەمبەر زیندانی کردووە. ڕاستەکەشی (لەسەر زۆر گێڕانەوە) نەك (گێڕانەوە)، واتە کێشەکە گێڕانەوە نەبوو بەڵکو زۆر گێڕانەوە، بەم شێوەیەش عومەر دژ بە گێڕانەوە نەبووە، چۆنیش دژی بێت لەکاتێکدا هەر خۆی فەرموودەی گێڕاوەتەوە؟

<u>سێیەم</u>: باسی کۆکردنەوەو نووسینەوەی فەرموودە دەکات‌و دەڵێت

---

[31] کارێکی هەڵبژاردن لە باسەکەی (یاسین)دا هەیە. یاسین باسی ئەوە دەکات کە ئەوە ئامۆژگارییی عومەر بوو بۆ ئەو وەفدەی ناردبووی بۆ کووفە بەڵام هەموو باسەکە ناگێڕێتەوە کە هۆی ئامۆژگارییەکەمان بۆ ڕووندەکاتەوە ئەویش قسەکەی عومەر کە قورئان کارێکی گەورەی هەیە بەسەر خەڵکی ئەوێ بەڵام کە فەرموودەیان بۆ بگێڕنەوە خەڵکەکە دەڵێن ئەوانە هاوڕێی پێغەمبەرن ئیتر قسە لە ئێوە وەردەگرن (واتە لەجیاتی ئەوەی لە قورئان وەریبگرن). بڕوانە سنن ابن ماجە، ج١، فەرموودەی ٢٨. ئەلبانی بە صەحیحی داناوە.

بەرهەمی هەر یەك لەو كەسانە: ئەبو داوود، ئەبوبەكر عەبدوڵڵا كوڕی زوبەیر، ئەحمەد كوڕی حەنبەل ... تاد ناوی (مەسنەد)ی لێ نرا(ل٨٠) جارێ ئەوەی ئەبو داوود پێی ناوترێت (موسنەد) بەڵكو (سونەن)، دووەمیش میسری نازانێت موسنەد چییەو بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە، ئەو كتێبەی كە فەرموودەكانی بەپێی ناوی ئەو صەحابییانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە تەرتیب كردووە ناوی (موسنەد)ـە، واتا بەپێی بابەت تەرتیب نەكراوە.

میسری كتێبەكەی (مناع القطان) دەكاتە سەرچاوە كەچی ئەو زانیارییە لەوێدا نییەو دیارە لە سەرچاوەیەك ئەو زانیارییەی بەسەقەتی وەرگرتووە كە ناوی كتێبێكی بەهەمان ناوونیشانی كتێبەكەی (القطان) نووسیوە.

چوارەم: میسری دەیسەلمێنێت كە چاوی بە صەحیحی بوخاری نەكەوتووە چونكە دەڵێت بوخاری ماناو مەبەستەكانی فەرموودەكانی لێكداوەتەوە(ل١٨ پەراوێز).

بوخاری تەنها دەقی فەرموودەكە لەگەڵ سەنەدەكەی هێناوەو لەچەند شوێنێكی زۆر كەمدا ڕوونكردنەوەیەكی كردووە ئەویش زۆر بەكورتیو زۆر جار یەك وشەی نووسیوە كە واتای وشەیەكی فەرموودەكەیە.

پێنجەم: گوایە میسری كتێبی (تاریخ الخلفاء)ی (سیوطي)ی بینیوەو بەكاریهێناوە(ل٨١)، ڕاستەكەشی ئەوەیە ئەو زانیارییەی لە (عبدالجواد یاسین) وەرگرتووە ئەویش بەسەقەتی چونكە میسری دەڵێت سیوطي ((جەخت لەسەرئەوە دەكاتەوە كە لە ساڵی ١٤٣ی كۆچیدا ئینجا دەست بە نووسینەوەی حەدیث كراوە))، ڕاستیش ئەوەیە ناوبراو خۆی جەخت ناكات بەڵكو ئەو قسەیەی لە (الذهبي) نەقڵكردووە، بەهەرحاڵ سیوطي باسی نووسینەوەی فەرموودەو فیقهـ و تەفسیر دەكاتو دەڵێت پێش ئەو

سەردەمە ئیمامەکان یان لەبەر شتەکانیان دەگێڕایەوە یان لە ژمارەیەك نووسراوی تەرتیبنەکراو.[٣٢]

<u>شەشەم</u>: باسی کتێبی (الموطأ)ی مالك دەکات کە هاڕوون ئەلڕەشید ویستبووی لە سەرتاسەری قەڵەمڕەوی ئیسلامدا بڵاویبکاتەوە تا لە دادگا قەزاوەتی پێبکرێ(میسری، ل٨٢)، ئەوەش تێنەگەیشتنە لە فیقهی ئیسلامی. ئەو وادەزانێت فیقهی ئیسلامی تەنها لە دادگادا کاری پێدەکرێت، ڕاستییە سادەو زانراوەکەش ئەوەیە بەشێکی گەورەی فیقه تایبەتە بە ژیانی مرۆڤی موسڵمانو ئەو مرۆڤە بۆ زانیاری پرس بە فەقیهەکان لەدەرەوەی دادگادا دەکات (لەبارەی تەهاڕە، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، ئەحکامی مرددو، مامەڵەی دارایی..تاد).

<u>حەوتەم</u>: وەك وتم میسری بەدوورودرێژی باسی عیسمەتی پێغەمبەر دەکاتو هەوڵدەدات ڕەتیبکاتەوە ئەویش بەپشتبەستن بە ئایەتی قورئان. بەبێئەوەی زۆریش بچینە ناو وردەکارییەکان، عیسمەتی پێغەمبەر بەم جۆرەیە: عیسمەتی پێغەمبەر بەو مانایە نییە کە بەهیچ جۆرێك هەڵە نەکات بەڵکو واتای ئەوەیە پێغەمبەر وەکو هەموو مرۆڤێکی تر هەڵە دەکات بەڵام وەحی ئەو هەڵەیەی بۆ ڕاستدەکاتەوە چونکە ئەگەر بۆی ڕاستنەکاتەوە ئەو قسەیە یان ئەو ڕەفتارە دەبێتە تەشریع بۆ موسڵمانان، دەقی ئایەتەکانیش ئەوە ئاشکرا دەکەن کە خودا شتەکانی بۆ پێغەمبەرەکەی ڕاستدەکردەوە، ئەو قسەیەش بێمانایە ئەگەر بوترێت ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە لە قسەکانو ڕەفتارەکانی پێغەمبەر (بێگومان ئەوانەی بە گێڕانەوەی صەحیح بەدەستمان گەیشتوون) ئیحتمالی هەڵەیان هەیە چونکە ئەگەر وا بێت

---

[32] السیوطي، تاریخ الخلفاء، ل٢٣٠.

قورئانیش ئەو ئیحتمالەی تێدایە چونکە لەڕێگەی پێغەمبەرەوە ئەو قورئانەمان بەدەست گەیشتووە، ئەو کاتەش پێغەمبەرایەتی واتای نابێت. میسریش (کە شتەکانی لە خەڵکی تر وەرگرتووە) دەیەوێت بەپێی دەقی قورئان بۆمان بسەلمێنێت کە سوننەت قابیلی هەڵەیە چونکە پێغەمبەر عیسمەتی نییە بۆیە هەڵەیە بکرێتە سەرچاوەیەکی تەشریع.

سەیر ئەوەیە میسری هەر خۆی لەهەمان شوێندا دەڵێت مەعصووم ئەو کەسەیە خودا ڕێگای لێگرتووە هیچ شتێکی وا بکات پێچەوانەی فەرمانی ئەو بێت(ل٨٢ پەراوێز) کە ئەمە نەك تەنها حاڵەتی پێش ئەنجامدانی کردارە هەڵەکە دەگرێتەوە بەڵکو پاش کردارەکەش کە ئەمیان (ڕاستکردنەوەی هەڵە) دەگرێتەوە.[٣٣]

پرسیارێکی ڕەواش لێردەا هەیە: بۆچی ئەسڵەن خودا ڕێگەی داوە بە پێغەمبەر ئەو هەڵەیە بکاتو دوایی بۆی ڕاستبکاتەوە؟ ئەمە حیکمەتێکی گەورەی تێدایە چونکە تەئکیدکردنە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر مرۆڤە، خودا بە موسڵمانان بە ناڕاستەوخۆ دەڵێت پێغەمبەر مەخەنە ڕیزی من، ئەوەتا ئێوە دەیبینن هەڵە دەکاتو من بۆی ڕاستدەکەمەوە. ئەمە وریاکردنەوەی مرۆڤە لەلایەن خوداوە کەچی دەبینین لەسەردەمی جەهالەتدا بێئاگایان لە سەرچاوەکانی ئاین پێغەمبەریان گەیاندۆتە ئاستی سەروو مرۆڤەکانو تەنانەت ڕوو لە ئەوی مردوو دەکەنو وەکو خودا لێی دەپاڕێنەوە. ئەو جەهالەتەش تەشەنەی کردووە تا گەیشتۆتە مرۆڤەکانی خوار پێغەمبەر وەك

---

[33] میسری دەنووسێت عیسمەت واتە ڕێپێدان (المنع) –کە ئەمە هەڵەیەو ڕاستەکەی ڕێپێنەدانە– بابڵێین هەڵەی چاپە، بەڵام دیسان هەڵەیە چونکە ئەو (منع)ـە لێرەدا ڕێگەپێنەدان نییە بەڵکو (پاراستن)ـە.

شێخی مردوو و زیندوو کە ئەو کەسەی بڵێت هەڵەیەکیان کردووە دەخرێتە خانەی کافران.

وەکو وتم میسری چەند بازێك دەدات تا جارێکی تر لە شوێنێکی نەشیاودا دەچێتەوە سەر باسی نووسینەوەی سوننەت ئەویش چونکە ئەو سەرچاوەیەی سوودی ناڕەوای لێوەرگرتووە (کتێبەکەی یاسین) باسی نووسینەوەی سوننەت دەکات..ئێستاش کاتی هاتووە بچینە سەر ((بردنەکانی)) میسریو تێنەگەیشتنی لەو کتێبە.

## بەشی سێیەم

# سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی تەشریع

میسریو ((بردن)) لە کتێبی (السلطة فی الاسلام)ی
(عبدالجواد یاسین)و بەپاڵ ((بردن))
سەقەتکردنو پاش سەقەتکردن
قسەکردن لەسەر بابەتەکان

**میسری دەنیشێتە سەر (عبدالجواد یاسین)و بەئارەزووی خۆی لە کتێبەکەی (السلطة في الإسلام، العقل الفقهي السلفي بين النص والتأريخ) زانیاریو سەرچاوە ((دەبات))و لەکۆی بیست لاپەڕە (لاپەڕە ٨٦ تا ١٠٥)ی کتێبەکەی میسری تەنها شەش جار ناوی ئەو کتێبە دەنووسێت.[١] بەڵام کارەکەی میسری بە ((بردن)) ناوەستێت چونکە میسری وەکو سەرچاوەکانی تر کە بەر شالاّوی ((بردن))ی کەوتوون لە باسەکانی ئەو کتێبە تێناگات بۆیە باسەکان تێکەڵوپێکەڵ دەکاتو زانیاری بەهەڵە نەقڵ دەکات، لەبەرئەوەش کە کارەکەی بریتییە لە ((بردن))و شوێنپێ هەڵگرتن دەبینین چەند باسێك دەهێنێتە پێشەوە کە لە کتێبەکەی یاسیندا شوێنی خۆیانە بەڵام لە کتێبەکەی ئەودا لە شوێنی نەگونجاودا خۆیان قوت کردۆتەوە.**

---

[١] ئەمە بەشی سەرەکی ((بردنەکانە)) دەنا پێش ئەوە (ل٧٩ — ٨) هەمان کاری لەگەڵ کتێبەکەی یاسیندا کردووە.

میسری ئاگای لەوە نییە کە (یاسین) سوننەت بەشێوەیەکی جیاواز وەردەگرێت. یاسین سوننەتی پێ قبووڵە بەڵام ڕەتی ئەوە دەکاتەوە سەرجەمی ئەو فەرموودانەی لەبەردەستدا هەن سوننەت بن. مەبەستیشی لە فەرموودەی دانراو (موضوع)و لاواز (ضعیف) نییە کە کەس ئەمانە بە بەشێك لە سوننەت نازانێت، بەڵکو ئەو گومان دەخاتە فەرموودەی زۆری دوو صەحیحی (بوخاری)و (موسلم) چونکە بەپێی ئەو، واتە (یاسین)، سوننەت تەنها ئەو وتارو کردارانەی پێغەمبەرن کە بەشێوەی (التواتر المستفیض)[2] گەیشتوونەتە دەستمان(یاسین، ل٢٤٥-٢٤٦).

میسری چۆتە سەر خوانی خەڵکی تر بێئەوەی بزانێت چی لەسەر ئەو خوانەدا دەخورێتو بێئەوەی سوپاسی خانەخوێکەی بکات. پێویستە ڕەخنە لەو ڕەفتارەی میسری بگیرێت، ئەمما موناقەشەی بیروبۆچوونەکانی.. ئەوە لە میسرییەوە دوورەو پێویستە میسری بخرێتە ئەولاوەو موناقەشەی بیروبۆچوون لەگەڵ یاسیندا بکرێت.

---

[2] یاسین لێرەدا هەڵەی کردووە کاتێك ناوی ((التواتر المستفیض)) دەبات چونکە فەرموودەی موتەواتر جیایە لە ((موستەفیض))، فەرموودەی موتەواتر ئەوەیە ژمارەیەك هێندە زۆر دەیگێڕنەوە کە ناکرێت هەموویان لەسەر درۆکردن ڕێککەوتبن، ئەمەش لەهەموو ((چینەکانی)) سەنەدەکە، واتە ژمارەیەکی زۆری صەحابییەکان گێڕاویانەتەوە، ژمارەیەکی زۆری تابعییەکانیش لەو صەحابییانە گێڕاویانەتەوە.. تا دەکاتە کۆتایی سەنەدەکە، بەڵام فەرموودەی موستەفیض هاوواتای فەرموودەی (مەشهوور)ـە یان نزیکە لێی ئەویش کە جۆرێکە لە فەرموودەی ئاحادو لەهەر ((چینێك)) سێ کەس بەرەوژوور گێڕابێتیانەوە بەڵام ناگاتە موتەواتر. بڕوانە: التهانوی، قواعد فی علوم الحدیث، ل٣٢، د. محمود الطحان، تیسیر مصطلح الحدیث..، ل٢٣.

## سوننـــەت

### ناڕێکییەکی (یاسین)

یاسین هەندێك بابەتی خستۆتە ڕوو کە جێگەی ڕەخنەن، بەڵام شتیشی هەیە شایەنی ئەوە بێت پشتگیریی لێ بکرێت وەك کاری خۆسەپێنەری پێوانە (القیاس) بەسەر شەرعداو مەسەلەی تەسککردنەوەی بازنەی ڕێگەپێدراو (المباح) کە دواتر دەچمەوە سەری.

مەرجی یاسین بۆ سوننەت وەك وتم ئەوەیە بەشێوەی (تەواتور) بەدەستمان گەیشتبێت بۆیە لای ئەو هەموو فەرموودەکانی (ئاحاد)[٣] قودسییەتیان نییەو دەکرێت ڕەخنەیان لێ بگیرێت تەنانەت ئەگەر لە دوو صەحیحی (بوخاری)و (موسلم)یشدا هاتبن هەرچەندە زانراوە کە ئوممەتی ئیسلامی صەحیحی بوخاریی بەڕاسترین کتێب پاش قورئان زانیوە، دوای ئەویش صەحیحی موسلم.[٤]

یاسین دەیەوێت هەموو ئەو فەرموودانە بخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەوە، نەك تەنها لەڕووی ئیسنادەوە بەڵکو لەوە گرنگتر لەڕووی ناوەڕۆکەوە(مەتن)و دەڵێت زانایان تەنها لە کەمێك لە ناوەڕۆکی فەرموودەکانیان کۆڵیوەتەوە، ئەویش بەشەرمەوە، دەنا چەندین فەرموودە هەن لەگەڵ عەقڵ یان لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەکاندا ناگونجێن. ناوبراو چەند فەرموودەیەك لەم بارەیەوە

---

[3] لە بەشی پێشوودا وتبوومان فەرموودەی ئاحاد ئەوەیە لە چینەکانی سەنەدەکە کەسانێك گێڕابێتیانەوە ژمارەیان ناگاتە ژمارەی (تەواتور)، بڕوانە سەرەوە بۆ فەرموودەی موتەواتر.

[4] ئەوە بەشێوەیەکی گشتی ئەگینا گومان لەوەدا نییە کە غەیری ئەهلی سوننەت ئەوەیان قبووڵ نییە.

دەهێنێتەوە، لە بەشێکی ئەو فەرموودانەش هۆکاری سیاسی دەستنیشان دەکات کە سەرچاوەی هەڵبەستنیانە. ئەو بەتەواوەتیش ڕەتی فەرموودەکانی (ئاحاد) ناکاتەوە بەڵکو کاتێك قبووڵیان دەکات کە بخرێنە بەر تیشکی قورئانو عەقڵی کوللی(بۆ ئەمانە بڕوانە لاپەڕە ٢٤٧).

سەرەتا با لەم بۆچوونەی یاسین بکۆڵینەوە.

یەکەمو کوشندەترین ڕەخنە ڕوو لە یاسین دەکات ئەمەی خوارەوەیە:

یاسین بەشی هەرە زۆری فەرموودەکان ڕەتدەکاتەوەو بە بەشێك لە سوننەتیان نازانێت، یان با بڵێین داوا دەکات ئەو فەرموودانە بخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەوە تەنانەت ئەگەر بە سەنەدێکی صەحیحیشەوە هاتبن، بەڵام دەبینین ئەو بۆ سەلماندن یان بۆ بەهێزکردنی بۆچوونەکانی خۆی پشت بەو فەرمودانە دەبەستێت کە لە خوار صەحیحەوەن، تەنانەت ڕووداوە مێژووییەکانی ناو کتێبە کۆنەکانی مێژووش دەکاتە شایەت هەرچەندە ئەوە شتێکی زانراوە کە ئەو گیانی وردبوونەوەو حەزەرکردنەی لە گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەردا هەبووە لە گێڕانەوەی مێژوودا کەمتر بووە، یان بەواتایەکی تر: کتێبەکانی مێژوو (تەنانەت کتێبەکانی سیرەتی پێغەمبەریش) لەڕووی دروستی یان بەهێزی سەنەدەوە تەساهولو چاوپۆشیی زۆرتریان تێدا کراوە.

بەم جۆرە بەشێك لە ئەنجامەکانی یاسین لەناو بازنەیەکی داخراودا دەسووڕێنەوە: بەپێی یاسین سەنەدی صەحیحی فەرموودە بەس نییە بۆ قبوولکردنی ئەو فەرموودەیە بەڵکو دەبێت فەرموودەکە بخرێتە بەر تیشکی

مێژوو، بەلام بەشێکی ئەو مێژووە[5] ئەنجامی گێڕانەوەیە کە لەباشترین حاڵەتیدا بە سەنەدێکی صەحیح هاتووە (بەلام بەم جۆرە حوکمی ئەو وەکو حوکمی ئەو فەرموودانەیە کە بە سەنەدی صەحیح هاتوون لەگەڵ ئەوەشدا دەخرێنە بەر تیشکی مێژوو) یانیش بە سەنەدێکی صەحیح نەهاتوون ئەمەش حاڵەتێکی خراپترە (واتە گێڕانەوەیەکە سەنەدی صەحیحی نییە کەچی دەبێتە پێوانە بۆ گێڕانەوەیەك کە بە سەنەدی صەحیح هاتووە). لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ئێمە گێڕانەوەیەکی مێژوو دەکەینە پێوانە بۆ فەرموودەیەك کە بە سەنەدی صەحیح هاتووەو لەمەوە پرسیارە ڕەواکە خۆی دەسەپێنێت: ئەی کام شت دەبێتە پێوانە بۆ ئەو گێڕانەوەیە مێژووییە؟ بێگومان گێڕانەوەیەکی مێژوویی تر، ئەی چیی تر دەبێتە پێوانە بۆ ئەمیان؟ .. بەم شێوەیە بازنەکە بەدەوری یاسینو بۆچوونەکەیدا دادەخرێت.

یاسین نەك تەنها لەو بازنەیەدا دەخولێتەوەو نەك تەنها گێڕانەوەی مێژوو، کە چاوپۆشیی تێدا کراوە، دەکاتە پێوانە بۆ فەرموودەکان بەڵکو کارێکی لەمە خراپتر دەکات کاتێك زانیاری لە کەسانێك وەردەگرێت کە ناکرێت ببنە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو هەروەك (إبن عبد ربه) لە (العقد الفريد)يدا يان (ئەلمەسعوودی).

ئەم کەلێنە گەورەیە ناچارمان دەکات پەنا بەرینەوە بەر ((گێڕانەوە))و بنەماکانی کە بەر لەهەموو شتێك بریتین لە سەنەد. بەپێچەوانەی هەموو

---

[5] مەبەست: ئەوەی ڕووی داو بڕایەوە چونکە بەشێکی تری "مێژوو" ئەو ڕووداوانەن کە فەرموودە پێشبینیی کردووە ڕووبدەن بەلام هێشتا ڕوویاننەداوە.

گومانەکانی یاسینیش سەبارەت بە سەنەدەکان، فەرموودە ببووە زانستێکی وردی ((پیاوانی فەرموودە))و بەهۆی ئەو زانستەوە ڕێژەیەکی گەورەی فەرموودەکان پاڵەفتە کراون، ئەم کارەش تا ئێستا بەردەوامە[6]. ئەوەش کە دەتوانرێت باس بکرێت و پێویستە باس بکرێت دوو شتە:

یەکەم: لەبەر ئەوەی فەرموودەکانی ئاحاد (ظني الثبوت)ـن، یان وەك وردتر دەوترێت (تفيد الظن الراجح بصحة نسبتها الى النبي)، واتە لەڕووی گێڕانەوەیان لە پێغەمبەرەوە لەسەددا سەد ئەکید نییە بەڵکو ئەگەری بەهێزتریان هەیە پێغەمبەر بەڕاستی ئەوانەی وتبێت[7] نابێت بکرێنە بەڵگە بەسەر کەسانی موخالفەوە هەر لە عەقیدەوە تا وردەکارییەکانی فیقە. بەواتایەکی تر فەرموودەی ئاحاد لە عەقیدەوە تا فیقە بکرێتە بەڵگە لەسەر بۆچوونی خۆم بەڵام نەکرێتە بەڵگە لەسەر هەڵەی بۆچوونی بەرامبەرەکەم و ئەو بۆچوونانەی لەسەر بناغەی فەرموودەی ئاحاددا دامەزراون بچنە خانەی خیلاف لە ئیجتهاد. لەڕاستیشدا زانایانی فەرموودە هەموو فەرموودەکان جگەلە فەرموودە موتەواترەکان بە (ظني الثبوت) دەزانن، واتە هەرچەندە فەرموودەکە بە سەنەدێکی صەحیحەوە هاتووە بەڵام ناتوانرێت بوترێت کە

---

[6] بەشێك لەو کەسانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە جێگەی مشتومڕن چونکە زانا کۆنەکان کە باسیان کردوون بە یەك شێوە هەڵیاننەسەنگاندوون، واتە یەکێك دەیوت فلانە کەس کە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لاوازە (یان هەر وەسفێکی سلبیی تر)و یەکێکی تر دەیوت جێی متمانەیە (یان وەسفێك لەوە خوارتر). ئەو حاڵەتانە زۆرن بەڵام بایەخ بە حاڵەتە گشتییەکە دەدرێت کە فەرموودەناسەکانو ((پیاوناسەکان)) زانستێکی وردیان داهێنا کە تا ئەو کاتە، بەڵکو تا ئەمڕۆش، هیچ میللەتێك داینەهێنابوو.

[7] ئەویش بەپێی جومهووری زانایان، بڕوانە د. زیدان، الوجيز في اصول الفقه، ل ١٧١.

هیچ گومان نییە کەوا پێغەمبەر وتوویەتی بەو شێوەیەی قورئان کە (قطعي الثبوت)ـە واتە بەدڵنیاییەوە لە خوداوە هاتووە. سەیریش ئەوەیە ڕەوتی سەلەفی[8] کە باوەڕی بە (ظنية الثبوت)ی فەرموودەی ئاحاد هەیە باوەڕی بەوەشە کە فەرموودەی ئاحاد لە مەسەلەی عەقیدە بەڵگەیە هەرچەندە دەشزانین کە عەقیدە مەسەلەیەکی هەستیارەو کوفرو ئیمانو بیدعەی لەسەر دادەمەزرێن.

دووەم: عەقڵ تەنها لە سنوورێکدا وەکو پێوانەیەك بۆ فەرموودە بەکاربهێنرێت چونکە ئەو پێوانەیە نیسبییەو ئەوەی ئەمڕۆ لەڕووی عەقڵەوە قبووڵ نییە سبەی دەبێتە شتێکی ئاسایی هەروەکو ڕووداوی شەوڕەوی (ئیسراء) کە لای موشریکەکانی مەککە جێگەی باوەڕ نەبوو ماوەی مانگێك پیادەڕەویی نێوان مەککەو بەیتولمەقدیس پێغەمبەر بە شەوێك بیبڕێت کە ئاشکرایە ئەوە بەڵگەیەك بوو بۆ ئەو سەردەمە دەگونجا بەڵام بۆ سەردەمی خۆمان کە هۆکارەکانی گواستنەوە ماوە دوورەکانیان نزیککردۆتەوە جێگەی قبووڵ نییە. ڕەخنەی دروست لە ناوەرۆکی فەرموودەی صەحیح ئەوەیە ناکۆکیی ئەو فەرموودەیە لەگەڵ دەقی قورئان بدۆزرێتەوەو پێویستە ناکۆکییەکە ڕاستەقینەو ئەکید بێت نەك وەهمی یان تەنها گومان بێت، هەروەها ناکۆکیی لەناو خودی فەرموودەکە هەبێت بەجۆرێك فەرموودەکە خۆی حوکم بەسەر خۆیدا بدات.

ئەوەی سەرەوە کورتەی موناقەشەیەکی دورودرێژە کە پێویستە بکرێتو

---

[8] مەبەستمان لە ڕەوتی سەلەفی بەو واتایەی لەناو ڕەوتی ئیسلامیدا ناسراوە نەك بەواتا عەلمانییەکە کە زۆربەی کەسانی پابەندبوو بە ئیسلام بە سەلەفی دەزانێت.

بۆ بەرهەمێکی تر هەڵیدەگرم.

## دەق و پێوانەو بازنەی ڕێگە پێدراو

## ڕەخنە لە یاسین و پشتگیریکردنی

ئاشکرایە کە یاسین لەو تێڕوانینەی بۆ فەرموودەو بۆ دوو صەحیحی بوخاری و موسلم زیادەڕەویی کردووە، بەڵام ئەوەش هەروەها دیارە کە هەڵەی تێڕوانینی موسڵمانان بۆ دوو صەحیحەکە بۆتە هەڵەیەکی باو و موسڵمانان قودسیەتییان بەو دوو کتێبە، بەتایبەتی ئەوەی بوخاری، داوە کە لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی ئیسلامدا ناگونجێت. ڕاستە صەحیحی بوخاری، با زیاتریش باسی ئەو کتێبە بکەم، لە کتێبەکانی تری فەرموودە وردترەو مەنهەجەکەی بوخاری مەرجی قورستری تێدایە بەڵام لەکۆتاییدا کارەکەی بوخاری کارێکی بەشەرییە، هەم ئیشەکەی خۆی کە کۆکردنەوەی فەرموودەکانەو وەرگرتن و ڕەفزکردن بەپێی زانستی پیاوان و بەپێی مەرجەکانی خۆی و هەم لەڕووی ئەو کەسانەی فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە کە نەك تەنها هەندێکیان جێگەی مشتومڕن بەڵکو هەروەها هەر هەموویان مرۆڤن و تووشی هەڵەکانی مرۆڤ دەبن وەك لەبیرچوونەوەو لێتێکچوون و گێڕانەوەی فەرموودەی درێژ بەکورتی..تاد.

وەکو وتم یاسین زیادەڕەویی کردووە لە بۆچوونەکەی چونکە ئەگەر بمانەوێت نەشتەرگەری لە صەحیحی بوخاری و موسلم بکەین دەبێت بەئەمانەتەوە ئەو کارە بکەین و نەك تەنها ئەو دوو کتێبە بەڵکو هەرچی کتێب پێش ئێستا خوێندبێتمانەوە دەبنە جێگەی گومان ئینجا پێویستە لەڕێگەی کتێبێکی ((ڕاستتر))ـەوە بە زانیارییەکانی بوخاری و موسلمدا بچینەوە بەڵام ئەو کتێبە کامەیە؟ لەوەش زیاتر هەرچی زانیارییە هەمانە

دەبێتە جێگەی گومانو پێویستە بۆ ئەمانەتی ((زانستی)) هەموو زانیارییەکان بە یەك چاو تەماشا بکەینو بە یەك دەست گرپیان تێبەربدەین بۆ ئەوەی لەسەرەتاوە دەستپێبکەین.

دیار نییە مەبەستی یاسین ئەوە بووبێت لەسەرەتاوە دەست پێبکەینەوە، بەڵام خودی بنەماکە وا پێویست دەکات، ئەگەر بشڵێین نەخێر مەبەستمان نییە لەسەرەتاوە دەست پێبکەینەوە ئەو کاتە خەڵك مافی ئەوەیان هەیە بڵێن بە چ حوکمێك ڕۆشتیتو ئێمەت لەگەڵ خۆتدا بردو لەپڕ لەشوێنێکدا وەستایو وتت ئێوەش بوەستن.

زۆر لەسەر ئەم عەبەسییەتە ناڕۆم کە لە یاری دەچێت نەك لە زانستو دەچمە سەر کێشەیەکی تری ناو بۆچوونەکانی یاسین:

ئەو پشتگیری لە بنەمایەك دەکات کە بەم جۆرەیە: دەبێت دەق نەك قیاس(پێوانە) حاکم بێت، پێوانەش سنووری حەرامکراوەکانی فراوان کردو شتە ڕێگەپێدراوەکانی کەمکردەوە، ئەمەش شایەنی پشتگیریلێکردنە، بەڵام دواتر دەبینین کە ئەوە لەگەڵ بۆچوونەکەی سەرەوەیدا سەبارەت بە دەق ناگونجێت. بەواتایەکی تر یاسین بۆ حەڵاڵو حەرام پەنا تەنها بۆ دەق دەبات بەڵام لەهەمان کاتدا سنوور بۆ دەق دادەنێت بەوەی کە نابێت تەنها ڕەچاوی سەنەدی صەحیح بۆ دەق بکەین.

پشتگیریی یاسین دەکەین کە زاڵبوونی پێوانە لەسەر حسابی دەق کێشەیەکی گەورەیە. بەپێی قوتابخانەی پێوانە بەتایبەتی قوتابخانەی (شافعی) حاڵەتی زۆر هەن دەقیان لەبارەوە نەهاتووە بۆیە پەنا بۆ پێوانە دەبرێت بۆ دیاریکردنی حوکمەکەیان کە ئایا بەر حەڵاڵ دەکەوێت یان بەر حەرام یان هەر یەکێك لە سێ حوکمەکەی تر: وجووب، نەدب، کەراهەت

(یاسین دەڵێت واجب یان حەرام كە ئەمە هەڵەیە چونكە ئەوەی دەق لێی بێدەنگ بووەو قیاس كاری تێدەكات حوكمەكەی تەنها واجب یان حەرام نییە).

لەلایەكی ترەوە (ئیبنو حەزم)و قوتابخانەی (ظاهری) بەگشتی ئەوە ڕەتدەكەنەوە چونكە لای ئەوان هەموو شتێك كەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی دەق. بەپێی ئیبنو حەزم هەر شتێك دەق بەتایبەت باسی نەكردووە حەڵاڵە چونكە هەر دەق خۆیەتی كە هەموو شتێكی بۆ مرۆڤ حەڵاڵ كردووە: (خلق لكم ما في الأرض جميعا –البقرة ٢٩)، هەر دەقیشە كە حەرامەكانی دیاریكردووە: (وقد فصل لكم ماحرم عليكم –الانعام ١١٩)، ڕووەكەی تری ئایەتەكە دەڵێت كە ئەوانەی خودا حەرامی نەكردوون حەرام نین. ئەركەكانیش بەهەمان شێوە بە دەق دەستنیشان كراون‌و ئەوەی دەق نەیكردۆتە ئەرك بەسەر مرۆڤدا كەس بۆی نییە بیكاتە ئەرك.[٩]

بەم شێوەیە هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی دەقدایەو ئەوەی شەرع لێی

[9] گومان نییە فیقهی زاهیری شتی نەگونجاوی تێدایە، هۆكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە پێوانە بەتەواوەتی ڕەتدەكاتەوە. فیقهی زاهیری دەڵێت: ئەوەی كاری پێوانە دەكات لەخۆیەوە شەرع دادەنێت‌و خۆی یەكسان دەكات بە خودا كە تەنها ئەو مافی تەشریعی هەیە. بەڵام لەلایەكی ترەوە موبالەغە لە قیاس لەو خراپترە، ئەوەتا فیقهی زاهیری سنووری ڕێگەپێدراو فراواندەكات بەڵام پێوانە تەسكیدەكاتەوە. ئینجا ئەوە سەیر نییە كە زاهیریەت كە خۆی بە دەق دەبەستێتەوە ئەو كارە بكات بەڵام قیاس كە كارێكی عەقڵییە پێچەوانە خراپەكە دەكات؟ دەڵێین ئایا ئەوە سەیر نییە؟ وەڵامەكەش نەخێر سەیر نییە بەڵام هۆی ئەوەی وەكو ئەنجامێكی سەیر دێتەبەرچاو دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی هەڵەی عەلمانییەكانە كە لاسایی یەكتر دەكەنەوەو كوێرانە ڕەخنە لە دەق‌و خۆبەستنەوە بە دەق دووبارە دەكەونەوە.

بێدەنگ بووە هەر لەژێر حوکمی دەقدایە، لەبەرئەوەشە ئیبنوحەزم ئەو قسەیە وەك درۆکردن دەزانێت کە دەڵێت: (فلآنە مەسەلە دەقی لەبارەوە نەهاتووە) (یاسین ل١٥–١٧، هەروەها ٥١–٥٢، هەروەها ١٧٦ بەدواوە). دەشبینین کە لێرەدا ئیبنو حەزم کێشەی نییە چونکە ئەو بەپێی فەرموودە دەڕوات، بەڵام یاسین بزانێت یان نەزانێت کێشەیەکی گەورەی هەیە چونکە وەکو ئیبنو حەزم لە پێگەی دەقەوە ڕەخنە لە پێوانە دەگرێت، کەچی لەهەمان کاتدا سنووریش بۆ دەق دادەنێت، هێشتاش ڕەخنە لە ئیبنوحەزم دەگرێت کە گوایە وەکو پێویست ئاگای لە خەلەلی مەنهەجیەتە تەقلیدییەکەی زانستی فەرموودە نەبووە (یاسین ل١٧١ هەروەها ل١٩٤)و نازانێت کە خەلەلی گەورە هی خۆیەتی کە هەستی پێنەکردووە.

ئەوەی ئیبنو حەزمو قوتابخانەی (ظاهری) دەیڵێن چارەسەری گرفتی زۆری تێدایە. لەڕاستیدا ئەگەر نەکرێت لەسەدا سەد پێوانە ڕەتبکرێتەوە ئەوا دەکرێت، بەڵکو پێویستیشە، دژ بەو موبالغەیە بین کە لە پێوانە کراوە. ئەوەش زۆر ڕاستە کە دەستوەردان لەو شتانەی کە قورئانو فەرموودە لێیان بێدەنگ بوونو بەکارهێنانی پێوانە بۆیان تا حوکمی حەڵاڵ یان حەرلم وەربگرن.. دەڵێم دەستوەردان لەو شتانە زوڵمێکە لەهەردوو شەرعو مرۆڤی موسڵمان دەکرێت. ئەوەتا فەرموودە صەحیحەکە بەڕوونی پێمان دەڵێت کە بەدوای ئەو شتانەدا نەچین کە پێغەمبەر نە فەرمانی داوە بکرێنو نە قەدەغەی کردوون:

((ذروني ماتركتم، فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم علي انبيائهم، فإذا أمرتكم بشئ فأتوا منه ما استطعتم ومانهيتكم عن شئ

فأنتهوا).[10]

لەڕاستیدا وردبوونەوە لەشتەكان بەو جۆرەی پێوانە كردوویەتی شەرعی لەسەر خەڵك قورس كرد بەوەی حوكمی زۆری داوە بەسەر ئەو شتانەی دەق بەتایبەت لەبارەیانەوە نەهاتووە، هەروەها چەندین شتی لەسەر خەڵك حەرام كردووە كە دەق لێیان بێدەنگ بووە (واتە دەق ناڕاستەوخۆ وتوویەتی حەلاڵن)، ئەگەر تەماشای كتێبەكانی فیقهیش بكەی سەرت دەسوڕمێت لە زۆریی ئەو حوكمانەو هەست دەكەی بەشێكی ئەو فەقیهانە بێكار بوون بۆیە هەر خەریكی دەركردنی حوكمی فیقهی بۆ شتە وردەكان بوون[11]، قوتابخانەی (ڕەئی)ش كە قوتابخانەی ئەبو حەنیفەیەو پێش شافعی بووە لەوەشی زیاتر كردووەو تەنانەت باسی فەقیهەكانی دەكرێت كە پێكەوە دادەنیشتن‌و دەیانوت: وەرن با مەسەلە دابمەزرێنین، ئینجا دەستیان دەكرد بە پرسیار كردن لەیەكتر: ئەگەر فلان شت بوو حوكمەكەی چییە.. كارەكەی

---

[10] ئیبنو حەزم كردوویەتی بە بەڵگە، موسلم ڕیوایەتی كردووە (كتاب الفضائل)و یاسین باسی كردووە، ل١٥، هەروەها بوخاری ڕیوایەتی كردووە (كتاب الاعتصام بالكتاب والسنە) بەلام (دعوني) لەجیاتی (ذروني).

[11] هەروەكو فەرمووده ماوەیەك خەریكی خوێندنەوەی فیقه بووم، لەبەرئەوە ڕەخنەكانم لە موقعێكی فیقهییەوەیە دەخەمە ڕوو نەك وەك ئەوانەی ڕەخنە دەگرن بێئەوەی شتێكی وا لەبارەی فیقهەوە بزانن‌و پاڵنەرەكەیان تەنها ڕەفزكردن‌و حەزپێنەكردنە. زۆربەی هەرە زۆری ڕەخنەگرە عەلمانییەكان زانستە ئیسلامییەكان‌و پابەندبوون بە ئیسلام بەگشتی بە مەملەكەتێك‌و جیهانێكی جیاواز دەزانن كە خۆیان تێیدا وەكو غەریب دەبینن بۆیە چاوەڕوانكراوە لێیان هەڵەی زەق بكەن‌و بەگیانی ڕەفزەوە مامەڵە لەگەڵ پابەندبوون بەئیسلام بكەن، لەبەرئەوەشە ڕەخنەكانیان، جگەلەوەی پڕ هەڵەن، لەلایەن ئەو كەسانەوە قبووڵ ناكرێن كە پابەندی ئیسلامن.

**شافعیش بریتی بووە لە ڕێکخستنی بنەما زانستییەکان بۆ گەیشتن بە حوکمی فیقهیو خستنی پێوانە لەناو چوارچێوەیەکی زانستیدا، بەڵام هەر ئەو مەنهەجییەتە زانستییە بوو کە ژیانی ئاڵۆزتر کردو وایکرد هەموو شتێك حوکمی حەڵاڵو حەرام وەربگرێتو زۆر شت لە حوکمی بەڕائەتی ئەسڵی، واتە بێدەنگبوونی قورئانو فەرموودە کە ئەسڵی مەسەلەکە دەکاتە حەڵاڵ، دەرکران.**[١٢]

**دەقی فەرموودەکەی سەرەوە باسی (تیاچوون) دەکات، ئەوەش جۆرێکە لە تیاچوون کە ڕووی کردە موسڵمانان کاتێك ڕێژەیەکی گەورەیان خەریکی فیقه بوون وەك چۆن خودا تەنها فیقهی بۆ مرۆڤ ناردبێت. کاتی خۆشی (غەزالی) ڕەخنەی لەو خەڵکە گرتبوو کە خەریکی فیقه بوون چونکە دەیبینی لەگوندێکدا چەندین فەقیه هەن کەچی یەك پزیشکی لێ نییە بۆیە خەڵك ناچار دەبن ڕووبکەنە پزیشکە نەصرانییەکان.**

**خەریك بوون بە فیقه وایکرد موسڵمانان دووربکەونەوە لەو زانستانەی دەیانتوانی هێزێکی زیاتریان پێببەخشن بەتایبەت لە سەردەمەکانی لاوازیی دەوڵەتی خیلافەت، بەپلەی یەکەمیش زانستە تاقیگەرییەکان کە ڕۆژئاوا پاش ماوەیەکی زۆر لە خەریك بوون بە فەلسەفەوە زانی چەند بۆ پیشکەوتن گرنگن. بنەماکانی ئیسلام زۆر زیاتر لە شارستانیەتی یۆنانو دوای ئەوە**

---

[12] نەك تەنها شافیعی بەڵکو سەرجەم ئیمامەکان خاوەن پایەو قەدرێکی بەرزنو خزمەتیان کردووە بۆیە ڕێزگرتن لێیان نیشانە ڕێزی ئەو کەسەیە، بەڵام ڕێزو پێزانین شتێکەو تەقدیسکردن شتێکی ترە، شوێنکەوتووە نەزانەکانی ئەو ئیمامانەش زیادەڕەوییان لە بەخشینی پایەی بەرز بە ئیمامەکانیان کردووە لەکاتێکدا دەبینین زاناکان هەندێك حوکمی پێچەوانەی ئیمامەکانیان داوە.

سەردەمە مەسیحییەکانی سەدە ناوەڕاستەکانی ئەورووپا ئەو توخمە فیکریو عەقیدەییانەی تێدایە کە مرۆڤ بەرەو بایەخدان بە زانستی تاقیگەری بەرن. فەلسەفەی یۆنانی دەیویست بە کەرەسەیەکی فەلسەفی، نەك بە کەرەسەیەکی تاقیگەری (ئیختباری) یان بەلایەنی کەمەوە ئەزموونگەری (تەجربی)[13]، تەنانەت لە جیهانی ماددەش بکۆڵێتەوە، فیکری مەسیحیش بووە میراتگری فەلسەفەی ئەرستۆو هەمان هەڵەی دووبارە کردەوە، لەگەڵ هەڵەیەکی گەورەتر ئەویش بایەخدان بە لاهووت.

جیهانی ئیسلامی لە سەدە ناوەڕاستەکاندا هەمان ئەو هەڵانەی دووبارە کردەوە، واتە بایەخدان بە فەلسەفەی یۆنانیو وەرگرتنی مەنهەجەکەی، لەلاکەی تریشەوە دووبارەکردنەوەی هەڵەی بایەخدان بە لاهووتی مەسیحی کە خۆی لە ((زانستێك))دا بینییەوە کە وەکو بەشێکی گەورە لە فەلسەفەی یۆنانی، نەزۆکترین ((زانست)) بوو، ئەویش ئەو توڕڕەهاتەی پێی وترا (علم

---

[13] تاقیگەری(ئیختباریەت) experimentalism جیایە لە ئەزموونگەری(تجربیە یان تەجریبیە) empiricism، یەکەمیان پەیوەندیی بە تاقیکردنەوەیەکی مەبەستانەی مرۆڤە هەروەکو ئەوەی لە تاقیگەکان دەکرێن، دووەمیشیان پەیوەندیی بە ئەزموونی مرۆڤە لە ژیاندا، بۆ نموونە کە مرۆڤ دەزانێت ئاگر شت دەسووتێنێت ئەمە تەجروبەیە بەواتای ئەزموونگەری، بەڵام زانینی پلە سەدەیی سووتانی ئەو شتە ئەنجامی کارێکی زانستییە لە تاقیگە. ئەو تیۆرەش کە هەموو جۆرەکانی زانین دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەزموون بە تیۆری تەجریبی (ئەزموونگەری) ناسراوە، بۆ نموونە بیرۆکەی (سووتاندن) بەهۆی بینینی سووتاندنی شتەکانەوە دەزانین. تێکەڵکردنی تاقیگەریو ئەزموونگەریش هەڵەیەکی باوە، لە سەرچاوە عەرەبییەکانیشدا بەزۆری بۆ (تەجربی) (تەجریبی) بەکاردێت، وشەی تاقیگەریو ئەزموونگەری بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوانە بەکاردەهێنم چونکە بەباوەڕی خۆم زیاتر مەبەستە فەلسەفەییەکە دەپێکن.

الكلام).[١٤] ئەوە کارەسات بوو بۆ شارستانیی ئیسلامی، بەڵام بەپاڵ ئەو کارەساتەوە گاڵتەجاڕییەك هەبوو (زۆربەی کاتیش کە کارەسات هەبێت گاڵتەجاڕی هاوڕێی دەبێت) ئەویش کە هەردوو تاقمەکە: ئەهلی کەلامو موتەفەلسفەکان گاڵتەیان بە ئەهلی فەرموودە دەکرد.

هۆکارێکی گەورە لەپشت بایەخدان بە بوارە بێکەڵکەکەی (علم الكلام)و ڕۆچوون لە فیقهو تەنانەت لە فەرموودەش[15] دەگەڕێتەوە بۆ خواستی ئەو کەسانە بۆ دەستکەوتنی ناو و ناوبانگ لەناو کۆمەڵگەدا، لەهەندێك حاڵەتیشدا دەستکەوتی ماددی، چونکە لەو سەردەمەدا کۆمەڵگە بەرز دیڕوانییە ئەو بوارانە. وەنەبێت ئەو نەخۆشییە تەنها لەو سەردەمانەدا هەبووبێت، ئەو نەخۆشییە لەهەموو کۆمەڵگەو سەردەمێکدا هەیە، نموونەیەکی واقعیی ڕۆشنبیریی ئەمڕۆی کوردستانیش ئەوەیە کەسانێکی زۆر

14 وەکو لەسەرەوەدا وتم ئەوە ((دووبارەکردنەوە))ی هەڵەی مەسیحییەکان بوو بەڵام واتای ئەوە نییە لاسایی لاهووتی مەسیحی بوو، سەرهەڵدانی (علم الكلام) بەبۆچوونی خۆم ئیسلامییەکی پوخت بوو و هەوڵ بوو بۆ وەڵامی چەند مەسەلەیەکی کەمی دیاریکراو وەك قەدەر، دواتریش فراوان بوو و پەلی بۆ مەسەلەی ترهاویشت.

15 زیاد لە پێویست خۆمەشغوولکردن بە گێڕانەوەی فەرموودەو کۆکردنەوەی فەرموودەو قسە لەسەر پیاوانی فەرموودە هەڵەیەکی تر بوو بەڵام هەڵەکە بە بۆچوونی خۆم ئەهوەنتر بوو چونکە جیاکردنەوەی فەرموودەکانی صەحیح (بەجۆرەکانییەوە) لە لاواز (بەجۆرەکانییەوە) کەرەسەی خاوی دەخستە بەردەم کۆمەڵگەو زانایان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زانستە بەشی خۆی موبالەغەی تێکەوت وەکو گەڕان بەدوای سەنەدی بەرزتری فەرموودە (ئەوەی ژمارەی ڕاوییەکانی کەمترن)...تاد. بیگومان پێش هەموو ئەوانەش کۆکردنەوەی فەرموودە بێگوێدانە پلەی ڕاستییان کە هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوە کارێکی نادروستە.

بۆ دەستکەوتنی ناوبانگ لەناو ناوەندی ڕۆشنبیریدا بێزار نابن لەدووبارە کردنەوەی ((فوکۆ وای وت.. وەك نیتشە دەڵێت..)).

بگەڕێمەوە سەر زیانی ڕۆچوون لە (پێوانە):

لێرەدا بانگەشە بۆ فڕێدانی پێوانە بەتەواوەتی ناکەم لەبەرئەوەی بڕیارێکی وا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وردە، لەکۆتاییشدا چ ئیمامی شافعیو چ ئیمامی ئیبنو حەزم دوو زانای بەرزن بەڵام ئیسلام لەسەرووی هەموو شتێکدایەو دەمارگیری بۆ هەر کامیان یان بۆ هەر کەسێکی تر لادانە لەسەرچاوە ئەسڵییەکە کە ئیسلامەو کەوتنە ناو گوناهی عیسمەتدان بە مرۆڤەکان[16].

لەمەوەو سەرەڕای قبووڵنەکردنی بۆچوونەکانی تری (عبدالجواد یاسین) بۆچوونەکەی ڕاستە کە بازنەی (موباح) سنوورێکی زۆر فراوانی هەیەو پێوانە تەسکیکرۆدتەوە بۆ حەڵاڵو حەرام، لەگەڵ ئەوەشدا (یاسین) ئاگای لەوە نییە کە خۆی خستۆتە ناڕێکییەکی گەورەوە ئەویش بەهۆی ئەو بۆچوونەی

[16] ماوەیەك بەر لەئێستا هەندێك لەوانەی تازە ببوونە (سەلەفی)و لەناو بازنەی عەقیدەدا دەخولانەوە ڕەخنەیان لە ئیمامی شافعی دەرگرت بێئەوەی یەك لە ملیۆنی زانستەکەی شافعییان هەبێت. کەمێکیش لەمانە ڕەخنەکەیان دەگەیاندە ڕاددەی تێپەڕاندنی سنووری ئەدەب. سەیر ئەوەشە ئەوانە بێ قەیدو شەرت قبووڵی قسەی ئەو زانایانەیان دەکرد کە شوێنیان کەوتبوونو قسەکانی ئەوانەیان وەکو دەق وەردەگرت، بۆ نموونە بەس بوو شێخ (ئەلبانی) فەرموودەیەك بە صەحیح یان لاواز بزانێت بۆ ئەوەی ئەوانیش بە صەحیح یان لاوازی بزانن ئەویش بێئەوەی بپرسن بۆچی ئەلبانی ئەوەی کردووە، هەروەها ئەو شێوە نوێژەیان پەسەند دەکرد کە شێخ ئەلبانی پەسەندی کردبوو. بەم جۆرەش تەقلیدی ئەلبانییان دەکرد کەچی پاش ئەوە ڕەخنەیان لە خەڵکی تر دەگرت کە تەقلیدی مەزهەبی شافعی دەکەن.

پێشتر باسمان کرد ئەویش: بەپێی یاسین مەرج نییە فەرموودەیەك قبووڵ بکەین تەنها لەبەرئەوەی سەنەدەکەی صەحیحە، یاسین بۆ مەسەلەی بازنەی (موباح) پشت بە ئیبنو حەزم دەبەستێت کە ئەمیان پشت بە فەرموودە دەبەستێت، گرنگترین فەرموودەش: (ذروني ماتركتم)، کەچی هەر ئەو فەرموودەیە خۆی بە تەواتور نەهاتووە کە مەرجی یاسینە بۆ ئەوەی شتێك ببێتە سوننەت.[17]

ناڕێکییەکی هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە ئەوەیە کە یاسین تێیکەوتبوو سەبارەت بە نووسینەوەی فەرموودە. ئەو دەڵێت کە پێغەمبەر لە ژیانیدا نەیهێشتووە هاوەڵان فەرموودە بنووسنەوە(ل٢٣٨ بەدواوە). ئەم قسەیە یان پێچەوانەکەی، واتە پێغەمبەر ڕێگەی دابوو فەرموودە بنووسرێتەوە، کەسانێك دەتوانن بیڵێن کە بەپێی زانستی فەرموودە مامەڵە لەگەڵ ئەو فەرموودانەدا دەکەن کە باسی قەدەغەکردن یان ڕێگەپێدانی نووسینەوەی سوننەت دەکەن، بەڵام کەسێك گومانی لە خودی فەرموودەکان بێت (جگە لەوانەی موتەواترن وەك یاسین داوا دەکات) چۆن دەتوانێت فەرموودەیەك بکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ڕێگەی داوە فەرموودەکان بنووسرێنەوە یان نووسینەوەیانی قەدەغە کردووە؟

---

[17] ئەوەی بینیومە ئەو فەرموودەیە ژمارەیەك تابعی لە یەك صەحابی، ئەویش ئەبو هورەیرە، گێڕاویانەتەوە، واتە موتەواتر نییە. بۆ ئەمانەتیش پێویستە بڵێم کە ئەو ناڕێکییە بۆچوونەکەی خۆشم دەگرێتەوە سەبارەت بەوەی فەرموودەی ئاحاد بکرێتە بەڵگە لەسەر بۆچوونەکانی خۆم بەڵام نەکرێتە بەڵگە لەسەر هەڵەی بەرامبەرەکەم، یەکێکیش لە ناڕێکییەکان کردنی فەرموودەکەی سەرەوە بە بەڵگە لەسەر هەڵەی تەسککردنەوەی بازنەی موباح.

ڕەنگە هێندە موناقەشەی بۆچوونەکانی (یاسین) بەس بێتو لەمیانەی ئەو باسانەی دادێن موناقەشەی تر دێنە ڕێگەمان، ئینجا کاتێتی بپرسین: یاسین باسی ئەو شتانەی کردووە، ئێمەش موناقەشەمان کردووە ئەی (میسری) تۆ لەکوێیتو چیت کردووە؟

## ((بردنەکان))و سەقەتکردنەکانی میسری

ئیشی میسری تەنها نەقڵکردنی قسەکانی یاسین بوو بەڵام:

١–وەك لەسەرەتای ئەم بەشەدا وتبووم، میسری تەنها شەش جار ناوی یاسینی وەکو سەرچاوە هێناوە، ئەگینا بەدرێژایی بیست لاپەڕە کە بریتین لە قسەکانی ناوبراو ئەو سەرچاوانە ((دەبات)) کە ناوبراو نووسیونی تا وا لە خوێنەر تێبگەیەنێ کە خۆی ئەو سەرچاوانەی بینیوەو بەکاری هێناون وەکو صەحیحی بوخاری (شەرحی ئیبنو حەجەر)و صەحیحی موسلمو (الرسالة)ی شافعی ...تاد.

٢–میسری شوێن پێی یاسین هەڵگرتووەو شتەکانی ئەوی ((بردووە)) بەڵام نەیزانیوە کە ناوبراو لە زۆربەی ئەوانەدا باسی شتێکی تری کردووە بەتایبەت کە ئەو دەیەوێت سنووری سوننەت بۆ سوننەتی موتەواتر تەسك بکاتەوە کەچی میسری وا تێگەیشتووە باس لەوەیە سوننەت سەرچاوەی دووەمی تەشریع نییە، یان لەوانەیە ویستبێتی لەقسەکانی ناوبراوەوە بگاتە ئەو ئەنجامەی دەیەوێت، ئەوەش دیارە لە سەرەتای ((بردنی)) لە (یاسین) میسری دەپرسێت ئەگەر بەپێی قورئان پێغەمبەر مرۆڤەو لەچەند جێگەدا قورئان ڕەخنەی لە پێغەمبەر گرتووەو ئەگەر پێغەمبەرو خەلیفەکان نەیانهێشتبێت کەس فەرموودەکان بنووسێتەوە ئەی لەسەر چ بنەمایەك سوننەت کرایە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت؟(میسری لاپەڕە ٨٦).

بۆ ئەوەی پەیوەستێکیش دروست بکات لەنێوان ئەو پرسیارەو ((بردنەکانی)) لە یاسین دەپرسێت: هەر ئەم پرسیارە زنجیرەیەك پرسیاری تر بەدوای خۆیدا دەهێنێت: ئاخۆ کارکردن بە سوننەتێك دوای سەدەیەك زیاتر دەست بەنووسینەوەی کرابێ دروستە؟(ل٨٦).

لێرەشەوە دەنیشێتە سەر کتێبەکەی یاسین‌و تا لاپەڕە(١٠٥) دەنووکی تێدا دەچەقێنێت. وتمان کارەکەی میسری بریتییە لە ((بردن)): هەمان قسەکانی یاسین دووبارە دەکاتەوە بێئەوەی ڕەبتێکی وایان هەبێت بەو پرسیارەی سەرەوە، بۆیە دەبینین باسی شافعی‌و پێوانە دەکات، باسی بوخاری‌و صەحیحەکەی دەکات...تاد. بەڵام دیارە دوای چەند لاپەڕەیەك هەست دەکات ڕەبتەکە نییە بۆیە دەبینین ئەمجارە قسەیەکی خۆی دەنووسێت ئەویش بۆ دروستکردنی ئەو رەبتە: ((بۆیە لەو کاتەوەی بوخاری‌و موسلم کۆتاییان بە صەحیحەکەی خۆیان هێنا، ئیدی موجتەهیدانی سوننە کردیاننە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت)) (ل٩٧). سوپاس بۆ خوا میسری قسەیەکی خۆی هێناو لە کەسی تری ((نەبرد))، بەڵام هەر بەم قسەیەی خۆی دەیسەلمێنێت کە چەند لەبارەی ئیسلام‌و شەریعەت‌و سوننەت‌و هەرچی زانستی ئیسلامی‌و مێژووی زانست لە ئیسلامدا هەیە نەشارەزایە. سوننەت کرایە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت؟ بەڵێ ڕاستە بەڵام ئەوە کێیە دەڵێت کە صەحیحەکەی بوخاری‌و موسلم کرایە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت؟ ئەوە کێیە وا تێگەیشتووە ئەو دوو کتێبە دەتوانن بەتەنیا نازناوی سەرچاوەی دووەمی شەریعەت پێکبهێنن؟ بێگومان تەنها ئەو کەسانەی بەگیانی چەتەگەرییەوە دەیانەوێت باسی ئیسلام‌و زانستە ئیسلامییەکان بکەن.

ئیبداعێکی تری میسری، کە لەسەرەوەدا تەنها ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوەیە نووسینەوەی سوننەت لای ئەو یەکسانە بە کردنی سوننەت بە سەرچاوەی دووەمی تەشریع(ل٨٦ و ٨٨) وەك بڵێیت گێڕانەوەی دەماودەمی سوننەت بەس نەبێت بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی تەشریع. میسری دەڵێت تا پێغەمبەر تا لەژیاندا بوو نەیهێشتووە سوننەتەکەی بنووسرێتەوە ئیتر لەسەر چ بنەمایەك سوننەت کرایە سەرچاوەی دووەمی شەریعەت؟(ل٨٦) ئەم قسەیەش هی کەسێکە لە مەسەلەکە تێنەگەیشتووە بۆیە شتەکان تێکەڵ بەیەك دەکات، ئەگەر نووسینەوەی سوننەتیش یەکسان بێت بە کردنی سوننەت بە سەرچاوەیەکی تەشریعو ئەگەر پێغەمبەر لەسەر ئەو ئەساسە نەیهێشتووە سوننەتەکەی بنووسرێتەوە کەواتە پێغەمبەر ناڕاستەوخۆ وتوویەتی بایەخ بۆ قسەو کردارەکانم دامەنێن ئەوەش یەکسانە بەوەی پێغەمبەر بڵێت من لەخۆمەوەو بۆ خۆم قسە دەکەم، بەڵام خوێنەر ئێستا دەزانێت کێ لەخۆیەوە قسە دەکات. ڕێگەنەدانیش بە نووسینەوەی فەرموودە لەسەردەمی پێغەمبەردا لە ترسی تێکەڵبوونی بە قورئان بوونەك لەبەرئەوەی پێغەمبەر داوای کردووە قسەکانیو کردارەکانی حسابی هیچیان بۆ بکرێت.

لیستی ((بردنەکانی)) میسری لە یاسین دوورودرێژەو ئەمانەی خوارەوە دەخەمە ڕوو، وەك باسیشم کرد مەسەلەکە تەنها ((بردن)) نییە بەڵکو هەروەها تێنەگەیشتنیشە لە زانیارییەکانو سەقەتکردنیان:

١–میسریمان بینی باسی ڕێگەگرتن لە نووسینەوەی فەرموودە لەلایەن پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکان دەکات(ل٨٦) ئەوەشە کە یاسین باسی کردووە(ل٢٣٨ بەدواوە).

٢-دوای ئەوە باسی فەرموودەکەی (ئەبو شاهـ) دەکات(ل٨٦) کە یاسین باسی کردووە(ل٢٤٢). یاسین لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە دەڵێت: ئەو فەرموودەیە ((بەهێزترین بەڵگەیە)) کە مەنزومەی سەلەفی (کە فەرموودەکانی نووسیبو وو زانستی فەرموودەی تیۆریزەکرد) پشتی پێوە دەبەستێت بۆ سەلماندنی دەعواکەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ڕێگە درابوو فەرموودە بنووسرێنەوە. میسریش لەبەرئەوەی ئەرکی لەگەڵ زانستی فەرموودەو سەرچاوەکانی نەکێشاوە ئاگای لەفەرموودەی تر نییە بۆیە وایزانیوە ئەو فەرموودەیە تاکە بەڵگەیە بۆیە دەنووسێت: ((موجتەهیدانی ئەهلی سوننە تاقە بەڵگەیەك کە پشتی پێدەبەستن))(ل٨٦).

٣-فەرمانی نووسینەوەی وتاری حەجیماڵئاوایی بۆ ئەبو شاهـ حاڵەتێکی تایبەتییە (میسری، ل٨٧) لەکاتێکدا یاسین نووسیویەتی مۆڵەتی نووسینەوەکە تایبەت بووە بەو حاڵەتە(٢٤٢).

٤- میسری دەپرسێت: بۆچی پەیامبەر سوور بوو لەسەر نووسینەوەی قورئان کەچی ڕێگەی بە نووسینەوەی سوننەتی خۆی نەداوە(ل٨٧) کە ئەمە هەمان پرسیاری یاسینە (یاسین ناڵێت "سوور بوو")، بەڵام لەجیاتی (سوننەت) نووسیویەتی (فەرموودە)(٢٤٣) کە ئەمەیان وردترە چونکە باس لە نووسینەوەی وتارەکانی پێغەمبەر کراوە نەك سوننەت کە ئەمیان، واتە سوننەت، نەك تەنها وشە وتراوەکان دەگرێتەوە بەڵکو هەروەها کردارەکانیشی هەروەها کردارو ڕەفتاری صەحابییەکان کە ئەو بە زمان پەسەندی دەکردن یان لێیان بێدەنگ دەبوو و ئەو بێدەنگییە واتای ڕەزامەندیی هەبوو.

٥-یاسین لەسەر پرسیارەکەی سەرەوە دەدوێتو دەڵێت جومهووری

ئەهلی فەرموودە وای بۆ چووبوون کە ڕێگەنەدان بە نووسینەوەی فەرموودە لەسەرەتای ئیسلامدا بووە نەوەکو تێکەڵ بە قورئان بێت، دواتریش کە مەترسییەکە نەما ئەو حوکمە نەسخ کراو ڕێگە بە نووسینەوەی فەرموودە درا(ل٢٤٣).

میسریش لەمە تێنەگەشتووە کە بۆچوونی ئەهلی فەرموودە ئەوەیە قەدەغەکردنەکەش‌و ڕێگەپێدانەکەش لە ژیانی پێغەمبەردا بووەو وایزانیوە ڕێگەپێدانەکە دوای مردنی پێغەمبەر بووە بۆیە دەنووسێت: ((موجتەهیدان... بیانوویان ئەوەیە گوایە لە ترسی ئەوەی نەبا دەقی (حدیث) تێکەڵ بە (قورئان) ببێ بەڵام خۆ دوای مردنی پەیامبەر کۆتایی بە(وەحی) هاتووەو دەقی قورئان جێگیر بووە. لەحاڵەتێکی وادا مەترسی تێکەڵ بوون لەئارادا نەماوە)) (ل٨٧)، ناهەقیشی ناگرین ئەوەی لێ تێك بچێت چونکە جگەلەوەی ئاگای لەو مێژووەو لە زانستی فەرموودە نییە لە قسەکانی یاسین تێنەگەیشتووە کە لەهەمان لاپەڕەدا هەن.

جگەلەوەش میسری لەنێوان (ئەهلی فەرموودە) و(موجتەهید) جیاناکاتەوە بۆیە دەبینین میسری ئیبداع دەکاتو تەعبیرەکەی یاسین (جومهووری ئەهلی فەرموودە) دەکات بە (موجتەهیدان)، ئەمەش یەکێکە لە دەیان بەڵگەی نەشارەزایی میسری چونکە ئەهلی فەرموودەو موجتەهید نەك تەنها یەك شت نین بەڵکو زۆربەی کات دوو کەسایەتیی جیاواز بوون، ئەوەی خەریکی فەرموودە بووە خەریکی فیقه نەبووە، ئیجتیهادیش لەناو فەقیهەکاندا بووە، تەنها هەندێك لەئەهلی فەرموودە لەهەمان کاتدا فەقیه بوون، تەنانەت کێشەو ناحەزی لەنێوان دوو لایەنەکە هەبووەو وەك ئەحمەد کوڕی حەنبەل دەڵێت ئێمەی ئەهلی فەرموودە نەفرەتمان لە ئەهلی ڕەئی

(کە ئەو کاتە فیقھ لەناو ئەھلی ڕەئیدا بوو) دەکردو ئەوان نەفرەتیان لێکردین تا شافعی ھاتو ھەردووکمانی تێکەڵ بەیەك کرد.[١٨]

٦- یاسین دوای قسەکانی سەرەوەی رەتی ئەوە دەکاتەوە پێغەمبەر ڕێگەی داوە فەرموودەکانی بنووسرێنەوە، یەکێکیش لە موناقەشەکانی لە پەراوێزدا کردووە سەبارەت بە قسەیەکی (ئەبوھوڕەیرە) کە ئەوەی تێدا ھاتووە کە عەبدوڵڵا کوڕی عەمر فەرموودەی دەنووسییەوە (ل٢٤٣ پەراوێز).

میسریش ھەمان باس دەکات بەڵام بەسەقەتیو بێئەوەی بزانێت پێش کەمێك چیی وتبوو. ئەو پێش کەمێك وتی بیانوویەکی موجتەھیدان بۆ ڕێگەنەدان بە نووسینەوەی سوننەت ئەوە بوو تا تێکەڵ بە قورئان نەبێت، کەچی لێرەدا دەڵێت کە بیانوویەکی تری موجتەھیدان ئەوە بوو ئەبوھوڕەیرە وتوویەتی عەبدوڵڵا فەرموودەی دەنووسییەوە(٨٧)، کە ئەمەیان ((بیانووی موجتەھیدانە)) بە نووسینەوەی فەرموودە نەك نەنووسینەوەی!

بێگومان کە ئاستەکەی میسری ھەرئەوەندە بێت ئیتر ناتوانێت ھەڵەیەك بۆ یاسین چاکبکاتەوە. یاسین لای سەیرە چۆن عەبدوڵڵا کوڕی عەمڕ کوڕی ئەلعاصو ئەبو ھوڕەیرە زۆرترین کەس بن فەرموودە لە پێغەمبەر بگێڕنەوە لەکاتێکدا کورتترین ماوەی ھاوەڵێتیی پێغەمبەریان ھەبووە(ل٢٤٣ پ ٢٤)، بۆیە یاسین گومانی ھەیە ئەبو ھوڕەیرە فەرموودەی زۆری گێڕابێتەوە، بەڵام ئەو ئاگای لە قسەیەکی ئەبو ھوڕەیرە نییە کە تێیدا ڕوونی دەکاتەوە بۆچی

---

[18] تەعلیقی عبدولفەتتاح ئەبو غوددە لەسەر (قواعد فی علم الحدیث)ی (تەھانەوی)، ل٣٨٤.

لە صەحابییەکانی تر زیاتر فەرموودەی لایە. ئەبو هورەیرە دەڵێت کە صەحابییەکان خەریکی کەسابەت بوون بەڵام ئەو بۆ خۆتێرکردن لای پێغەمبەر دەمایەوە بۆیە ئەو فەرموودانەی دەبیست کە ئەوان نەیاندەبیست.[19]

لەبارەی عەبدوڵڵاشەوە کە لەژیانی پێغەمبەردا فەرموودەی دەنووسییەوە، عەبدوڵڵا هەندێك فەرموودەی لە ((سەرچاوەیەکەوە)) دەگێڕایەوە کە لەناو ئەهلی فەرموودە بە (الزاملتان) ناسراوە ئەوانیش دوو حوشتری بار بوون لەشەڕی یەرمووك دەستیکەوتبوونو نووسراوی ئەهلی کتاب بوون، زۆربەی ئەوانەش بریتی بوون لەبابەتی ڕووداوەکانی ڕابوردووو قیامەت..تاد نەك نزاو دوعا وەك یاسین وایزانیووە. خۆش ئەوەیە میسری تەنانەت ئەو قسە هەڵەیەی یاسینیش بەهەڵە نەقلْ دەکات، ئەوەتا دەڵێت:((زۆربەی هەرە زۆری ئەو بابەتانەی لەزمانی عەبدوڵلاوە گێڕدراونەتەوە نزای ئاینینو ناچنە خانەی حەدیسەوە))، ئێمە وتمان ئەوانە نزا نین، خۆ نزاش بن ئایا سەرچاوەکەیان چییە؟ لەخۆوە وتراون یان لەڕێگەی حەدیسەوە هاتوون؟ هاوەڵانی پێغەمبەر نزاو دوعاشیان بەپێی سوننەت بووە، واتە لە ((خانەی حەدیسەوە)) وەرگیراون.

٧– یاسین ئینجا باسی فەرموودەی (ئەبو شاه)ی دەکاتەوە(٢٤٤)، بێگومان میسری دوای ئەوە ئەویش باسی دەکاتەوە(ل٨٧).

٨–میسری باسی ئەوە دەکات کە قورئان شتی حەڵاڵ کردووەو شتی حەرام کردووە بەڵام عەقلْ فیقهی بەهۆی پێوانەوە سنوورەکانی حەرامی

---

[19] صحيح البخاري، كتاب العلم، باب حفظ العلم.

فراوان کردووە(ل٨٨–٩٠) پاشان دەچێتە سەر مەسەلەی دەسەڵات کە لێرەشدا پێوانە کاری خۆی کردووە(ل٩٠). ئەمەش شوێن پێ هەڵگرتنی (یاسین)ـە کە بۆچوونەکەی ئەمەیە: کاتی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکانو ماوەیەك دوای ئەوە کاریان بە قورئان دەکرد هەروەها سوننەتی موتەواترکە دەماودەم دەگێڕدرایەوە بۆیە بازنەی ڕێگەپێدراوە فراوانتر بوو(٢٤٦).

٩–میسری باسی ئەو مەسەلەیە دەکات کە یاسین ورووژاندبوویو پێشتر باسمان کردبوو: ئەوەی لەقورئاندا نەهاتووە حوکمی ڕێگەپێدراو (موباح)ی هەیە بەڵام بەهۆی (قیاس)ـەوە فەقیهەکان (بەتایبەت شافعی) وازیان لەو (موباحانە) نەهێناو هەموو ئەو شتانەی قورئان باسی نەکردوون بوونە دوو بەش (واجب)و (حەرام) (یاسین لاپەڕە ٥١ بەدواوە).

یاسین بۆیە ئەوە دەڵێت تا دواتر گوناهێکی تر بخاتە ئەستۆی قیاس ئەویش بەکارهێنانی قیاس لە مەسەلەی دروستیی خیلافەتی ئەبو بەکر(٥٥) بەڵام وەك بینیمان میسری ئاگای لەم کەینوبەینە نییەو هاتووە قسەکانی یاسینی نەقڵکردووە سەبارەت بەوەی (قیاس) بازنەی حەرامی فراوانتر کرد(٨٨–٨٩).

میسری دوای ئەوە دەڵێت کە مەسەلەکە بەوە تەواو نابێتو حەڵاڵێكو حەرامێك کە شافعی ئیجتیهادی بۆ دەکات دەبێ جێبەجێ بکرێت، ئەوەشی جێبەجێیان دەکات دەسەڵاتە، ملکەچکردنیش بۆ دەسەڵات بەپێی حوکمی شەریعەت ئەرکێکی ئاینییەو ناشێ موسڵمانان لێی دەربچن(٨٩).

ئەوەش بۆ پێکەنین دەشێت چونکە میسری وایزانیوە ئەم قسەیەی سەرەوە کە لە یاسینی وەرگرتووە هی شافعیو موجتەهیدە کۆنەکانە لەکاتێکدا هی یاسین خۆیەتی، مەسەلەکەش ئەوە نییە کە میسری

تێگەیشتووە، یاسین دەیەوێت بڵێت کە ئەو شتانەی دەق لێیان بێدەنگ بووە دەکەونە بازنەی ڕێگەپێدراو، ئیجتیهادیش لەناو ئەو بازنەیەدا هەیە بەڵام ئەم ئیجتیهادە ناخرێتە پاڵ خودا (وەکو ئیجتیهادەکەی شافعی) بەڵکو دەخرێتە پاڵ دەسەڵاتی موسڵمان کە دەتوانێت لەو بازنەیەدا هەندێك لەو ڕێگەپێدراوانە بکاتە ئەرك یان هەندێکیان قەدەغە بکات[20] بەپێی شەرعیش گوێڕایەڵیکردنی ئەو دەسەڵاتە واجبە بەڵام ئەو گوێڕایەڵییە پەیوەستە بە کات وشوێنو تا هەتا بەردەوام نابێت(یاسین ٥٣). بەواتایەکی تر قسەکەی سەرەوە هی یاسینە نەك شافعی، باسی گوێڕایەڵیش بۆ دەسەڵات لەو حاڵەتەدا پێشنیاری یاسینە نەك ڕەخنەیە لە قسەیەکی شافعی کە نەیکردووە. بێگومان میسرییەك دەرك بەو مەبەستە نەکاتو بەهەڵە لێی تێبگات ناتوانێت ڕەخنە لە یاسین بگرێت کە ئەوەی بە دەستێك لە فیقهی سەندەوە (کردنی ڕێگەپێدراو بە حەڵاڵ یان حەرام) بەدەستەکەی تر دەیداتە دەسەڵات، هەموو جیاوازییەکەش ئەوەیە یەکەمیان دەدرێتە پاڵ خوداو ئەوەی تریان دەدرێتە پاڵ دەسەڵات، لەکاتێکدا دەکرێت کێشەکە بەوە چارەسەر بکرێت ئیجتیهاد بدرێتە پاڵ موجتەهیدو نەوترێت ئەوە حوکمی خودایە.[٢١]

---

[20] مەبەستی لێرەدا دەسەڵات بە یاسایەك ئەو شتانە قەدەغە بکات کە دەقیان لەبارەوە نەهاتووە (واتە حەڵاڵن) یان دەیانکاتە ئەرك بێئەوەی دەقێك لەبارەی واجبێتییان هاتبێت، بۆ هەموو ئەمانەش دەسەڵات نەڵێت ئەم یاسایە حوکمی خودایە.

[21] ئەوەش جگەلەوەی ئەو بۆچوونەی یاسین واتای ئەوەیە مافێکی گەورەتری تەشریع بدرێتە دەست دەسەڵات کە تەرەفە لە سەرهەڵدانی ئیستبدادو ستەمکاری لەکاتێکدا موجتەهیدان جێگەی ئەو مەترسییە نین بەتایبەت ئەگەر سەربەخۆ بن لە دەسەڵات.

١٠-هەر لەبارەی دەوری پێوانە لە حەڵاڵکردنو حەرامکردنی ئەو شتانەی دەق لەبارەیانەوە بێدەنگ بووە میسری باسی چەند نموونەیەك دەكات وەك سزای مەیخواردنەوەو سزای لەئاین وەرگەڕان کە لەقورئاندا نین، ئەم قسەیەش هێندە سادەیە کە مەگەر بۆ کەسانی سادە ڕوونیان بکەینەوە: حوکمەکان مەرج نییە تەنها لەقورئاندا بن بەڵکو لە سوننەتیشدا حوکمی زۆر هەنو دوو سزاکەی سەرەوە لە سوننەتدا هەن، یەکەمیان پێغەمبەر بە کرداری کردوویەتیو دووەمیان بەلای کەمەوە دەقی فەرموودەی لەسەرە. نموونەیەکی تری میسری، کە پێشتر باس کرا، سزای سەد جەلدەیە کە بە وتەی خۆی لە قورئاندا هەیە بۆ ((ئەو ژنو پیاوەی بەشێوەیەکی ناشەرعی سێکس بکەن))و دوایی گۆڕاوە بۆ بەردبارانکردن. وتیشمان هەر کەسێك شارەزاییەکی کەمی هەبێت دەزانێت ئەو سزایە نەگۆڕدراوەو لەکۆنەوە بۆ ئەوانەیە کە هاوسەریان نییەو زینا دەکەن لەکاتێکدا بەردباران بۆ ئەوانەیە کە هاوسەریان هەیە، دووەمیشیان بە سوننەت سەلمێندراوە جگە لەو ڕوایەتانەی دەڵێن کە ئایەتی بەردباران لەقورئاندا هەبووەو خوێندنەوەکەی نەسخ بووە بەڵام حوکمەکە ماوە، جگەلەوەی ئەوە هەڵەی تێگەیشتنە لە قسەی شافعی.

١١-دەڵێت موجتەهیدەکان شتیان حەرام دەکرد کە لەقورئاندا حەرام نەکراوە، حەرامێکیش قورئان سزای بۆ دیاری نەکردووە ئەمان بۆیان دیاری کردو دەبێت دەسەڵات سزا جێبەجێ بکاتو دەبێت ئەو دەسەڵاتە ئاینی بێت، ئەم سەرەنجامەش ناچاری کردن تیۆرێك لەسەر مەسەلەی دەسەڵات گەڵاڵە بکەنو شەرعییەت بدەنە دەوڵەتی خیلافەت(ل٩٠)، ئەمەش ئەوپەڕی بێئاگایی میسرییە چونکە دەوڵەتی خیلافەت تا زیاتر لە ١٣٠٠ ساڵ پاش

پێغەمبەر شەرعیەتی هەبووەو پێویستی بە موجتەهید نەبووە تا شەرعیەتی پێبدات، هەروەها دەسەڵاتی ئاینی هەر هەبووە، ئەوەش کە گۆڕاوە کەسی خەلیفەیە، گەڕانیش بەدوای شەرعیەتدا بۆ خاتری دەوڵەتی خیلافەت نەبووە بەڵکو بۆ کەسێکی دیاریکراو یان بنەماڵەیەکی دیاریکراو تا بسەلمێنرێت مافی خیلافەتیان هەیە، خەڵکیش دەیانزانی کە خیلافەت وەزیفەیەکی ئایینە، کێشەش ئەوە بوو ئەو خەلیفەیە چەند پابەندبووە بە ئاین.

١٢–(یاسین) گومان دەخاتە گێڕانەوەکانی (ئەبو هورەیرە) سەبارەت بەوەی پەیوەندیی بە بەنو ئومەییەوە هەیە(ل٢٧٠) میسریش شوێنی دەکەوێت(ل٩٢). یاسین لە لاپەڕەکەی دوای ئەوە دەڵێت مەسەلەکە مەسەلەی ئەبو هورەیرەو ڕەخنەگرتن لە صەحابی نییە چونکە لای ئەو صەحابی مەعصووم نییە(ل٢٧) لەهەمان لاپەڕەشدا دەڵێت لامان یەکسانە ئەگەر ئەبو هورەیرە ئەمانەی گێڕابێتەوە یان بەدەمییەوە هەڵبەسترابن. میسری شوێن ئەو دەکەوێت بەڵام لەجیاتی کەوتن بەسەر کەلاکێکی چەور بەسەر ئێسقاندا دەکەوێت: ((هەڵبەت مەبەستی ئێمە (بڕوانە وشەی "ئێمە") لەم نموونانە ئەوە نییە مۆری تاوان بنێین بەتەختی تەوێڵی ئەبوهورەیرەدا))(ل٩٣). بەختی ئەبو هورەیرە شاهێنی دوو چاوی تیژی میسری سەری کرد (لەگەڵ پۆزشێك بۆ نالی).

١٣– ئەمەش نموونەیەکی دووردرێژ:

میسری لەفەرموودە ((سیاسییەکان)) لە سەردەمی ئومەوی(ل٩١–٩٤) دەفرێتو بەسەر ئەو فەرموودەیە دەنیشێت کە حوکمێکی فیقهیی تێدایە ئەویش شیردان بە کەسی گەورە پاشان فەرموودەی (ئوم حەڕام) (ل٩٤–٩٦) ئینجا دیسان دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی سیاسی (ل٩٦ بەدواوە) کە

ئەوە شوێنکەوتنی کوێرانەی یاسینە، ئەمەش ڕوونکردنەوەکەیە:

یاسین سەرەتا باسی دانانی دەقی (واتە فەرموودەی) سیاسی لە سەردەمی ئومەوی دەکات(ل ٢٥٨–٢٧٧) دواییش لەسەردەمی عەبباسی (٢٧٧ بەدواوە). ئەی بۆچی باس لە فەرموودەی شێردان بەگەورەو فەرموودەی (ئوم حەڕام) دەکات؟

یاسین سەرەتا باسی فەرموودەی دووەم دەکات کە لەبارەی یەکەم هێرشەوەیە بۆ سەر قوستەنتینیە، دواییش باسی ئەو لەشکرە دەکات کە هێرشی کردە سەر قوستەنتینیەو لە سەردەمی عوسمان کوڕی عەففاندا نێردراو یەزید کوڕی موعاویە سەرکردەی بوو(ل٢٦٧–٢٦٨). یاسین ئەمە بە فەرموودەیەکی هەڵبەستراو دەزانێت هەرچەندە لە صەحیحی بوخاریدا هەیە ئەویش چونکە بۆ مەبەستێکی سیاسی هەڵبەستراوە ئەویش شکۆمەندکردنی یەزیدو ئومەوییەکان بەگشتی. یاسین کە دەزانێت ئەو فەرموودەیە لەڕووی سەنەدەوە کێشەی نییە دەیەوێت لەڕووی واتاوە ڕەتییبکاتەوە ئەویش بە گومانخستنە سەر چۆنێتیی گێڕانەوەی کە بەم جۆرەیە: پێغەمبەر لەماڵی (ئوم حەڕام)دا دەبێتو ئەو ئافرەتە قژیی لە ئەسپێ بۆ دەپشکنی، پێغەمبەر خەوی لێدەکەوێتو پاشان خەبەری دەبێتەوەو ئەو مژدەیە دەدات کە لەشکرێك هێرش دەباتە سەر قوستەنتینیە..[22] یاسین دەپرسێت چۆن پێغەمبەر لای ئافرەتێکی نامەحرەم دەمێنێتەوەو ئەو ئافرەتە دەست لە سەری دەدا. لەمەشەوە فەرموودەکە ڕەتدەکاتەوە، بەواتایەکی تر یاسین

---

[22] صحیح البخاری، کتاب الجهاد والسیر (هەروەها کتابی تری صەحیحەکە)، صحیح مسلم، کتاب الامارة، باب فضل الغزو فی البحر.

دەڵێت نەك تەنها گومان هەیە فەرموودەكە بۆ ستایشی موعاویەو یەزیدی كوڕی دانرابێت بەڵكو ئەوەتا لەڕوویەكی فیقهیشەوە دروست نییە بۆیە زیاتر ڕێی تێدەچێت هەڵبەسترابێت، بەواتایەكی دووەم مەسەلە فیقهییەكەی خستۆتە خزمەت موناقەشە سیاسییەكە، بۆیە دەبینین یەكسەر دوای ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەو فەرموودانەی بۆ ستایشی بەنو ئومەییە وتراون چونكە یاسین لەبیری نەچووە كە باس باسی دانانی فەرموودەیە لەسەردەمی ئومەویداو باسە فیقهییەكەی خستۆتە خزمەتی ئەو مەبەستە.

یاسین فەرموودەكەی (ئوم حەڕام) دووبارە دەكاتەوە(ل٢٨١) ئەویش كاتێك دەچێتە سەر باسی دانانی فەرموودە لەسەردەمی عەبباسیداو لێرەدا قسەی موفەسسیرەكان دەهێنێتەوە تا پیشانی بدات لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە چەند سەریان لێتێكچووە(٢٨٢ بەدواوە)، پێش ئەوەش باسی فەرموودەی شیردان بە كەسی گەورە دەكات[23] (٢٧٩) ئەمەش هەمووی بۆ ڕەخنەگرتن لە زانایانی كۆن كە زۆریان نەكۆڵیوەتەوە لە ناوەرۆكی فەرموودەكان بەتایبەت فەرموودەكانی (ئاحاد)و فەرموودەكانیان قبووڵ كردووە ئەگەر سەنەدەكەیان صەحیح بووبێت هەتا ئەگەر ناوەرۆكەكەیان نامەعقوولیش بێت یان ئەگەر لەگەڵ دەقی تردا نەگونجابێت. یاسین دوای موناقەشەیەكی زۆر (تا لاپەڕە ٢٨٨) ئینجا دەچێتەوە سەر مەسەلەی هەڵبەستنی فەرموودەی سیاسی لە سەردەمی عەبباسیدا بۆیە لێرەدا زۆرتریش لەسەر فەرموودەی ئاحاد دەڕوات چونكە سەردەمی عەبباسی سەردەمی نوسینەوەی زۆرتری فەرموودەیە بەتایبەتی فەرموودەی ئاحاد.

---

[23] صحيح مسلم، ج٤، كتاب الرضاع، باب رضاعة الكبير.

کەواتە یاسین بەمەبەست لە باسێکی سیاسییەوە دەچێتە سەر باسێکی فیقهی‌و فەرموودەناسی، بەڵام میسریی داماو نازانێت چی لە جەوالّدا هەیە؛ لیرەی زەرد یان دووپشکی ڕەش.. دەستی پیا دەکات‌و شتی لێدەردەهێنێت، بۆیە وەك وتم لە فەرموودەی سیاسییەوە باز بۆ دوو فەرموودەی شیردان بە کەسی گەورەو فەرموودەی ئوم حەڕام دەدات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەی سیاسی بێئەوەی ڕەبتێك لەو بازانەدا بکات، بەڵکو بێئەوەی لەخۆی بپرسێت چ ڕەبتێکیان تێدایە.

خۆش ئەوەیە میسری دوای ئەوە دەڵێت: ((ئەم حەدیثانەو دەیانی تر دەهێنن قسەوباسی زۆریان دەربارەوە بکرێ))(ل٩٥).. بۆچی تۆ زانیوتە باس لەچی دەکەی تا قسەو باسی زۆریان لەبارەوە بکەی؟!

میسری یەکسەر دوای ئەوە باسی فەرموودەکەی (ئوم حەڕام) دەکات‌و زۆریی قسەکانی یاسین لەبارەیەوە دووبارە دەکاتەوە بەڵام دیسان نازانێت بۆچی باسکراوە(٩٥—٩٦).

١٤—میسری تەنانەت ((بردنەکە))ش بەتەواوی ناکات، ئەوەتا ئاماژە بۆ فەرموودەیەکی تر دەکات کە ئەویش لە یاسینی ((بردووە))و تێیدا هاتووە: (إنما الرضاعة من المجاعة) واتە شیردان لەبرسێتیەوەیە. یاسین خۆی شەرحی دەکات کە ئەو شیرەی دوو کەس پێی دەبنە خوشك‌و برا ئەو شیرەیە کە منداڵ کاتێك برسیی بوو دەیخوات (ل٢٨٠) کەچی میسری پاش ((بردنی)) قسەکە ئەتکی دەکات: ((شیرپێدان ئەنجامی برسێتی‌و قاتو قڕییە))(ل٩٥)، واتە ئەو مەجاعەیەی باسکراوەو کە برسێتیی منداڵە میسری بە مەجاعەی گشتیی زانیوە واتە برسێتی خەڵك‌و قاتوقڕیی وڵات، بێگومان بێئەوەی بپرسێت بۆچی ئەو شیردانەی دوو منداڵ پێی دەبنە خوشك‌و برا بە

قاتوقڕیی وڵات دەبەسترێتەوە. بەڵگەی ترمان ناوێت بۆ سەلماندنی ئەوەی میسری ئەو لاپەڕانەی ئەو بابەتەی لە یاسین ((بردووە)) ئەویش پاش سەقەتکردن، بەڵام بۆ خۆشیو کەیف نموونەیەکی تر دەڵێین:

یاسین تەفسیری (ئیبنو عبدولبەڕ) دەهێنێتەوە سەبارەت بەوەی چۆن پێغەمبەر لای ئافرەتێکی نامەحرەم دەمێنێتەوەو لەدەقی (ئیبنو عبدولبەڕ) ئەوە هاتووە کە ئوم حەڕام: ((مەحرەمی پێغەمبەر بووە ئەویش لەتەرەفی خوشکانی دایکییەوە چونکە عەبدولموتتەلیبی باپیری پێغەمبەر لە (بنو نەجاڕ) بووە)). یاسین ئەوە ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت: مەبەستی لەوەیە کە ئوم حەڕام خوشکی دایکی عەبدولمەتتەلیب بووە(٢٨٣) قسەی یەکەم هی (ئیبنو عبدولبر)ـە بۆیە یاسین خستوویەتییە ناو جووتەکەوانەی وەرگرتنی دەقاودەق، قسەکەی دوای ئەوەش ڕوونکردنەوەی یاسین خۆیەتی بۆیە لەناو جووتەکەوانەدا نییە. میسری وایزانیوە ئەوەی دووەمیش هەر قسەی ئیبنو عبدولبەڕە بۆیە قسەکەی خستۆتە ناو کەوانەوەو نەزانینەکەیمان بۆ تەئکید دەکاتو دەنووسێت: بۆیە تەئویلی دەکات (واتە ئیبنو عبدولبەڕ)ـەو دەڵێت: (پەیامبەر بۆیە ڕێگای داوەتە ئوم حەڕام دەست بخاتە ناو سەرو قژییەوە چونکە پووری –خوشکی دایکی– عبدولموتتەلیبی باپیرەی بوو) کەوانەکەش دادەخاتو ژمارەی پەراوێزی (٢٠٠) دادەنێتو ناوی شەرحی ئیبنوحەجەری صەحیحی بوخاری واتە کتێبی (فتح الباری) وەك سەرچاوەی حەڵاڵی خۆی دەنووسێت (ل٩٦) کە نە حەڵاڵەو نە پێی دەشێت چونکە قسەی یاسینە[24].

[24] میسری ژمارەی بەرگی ئەو کتێبەی گۆڕیوە، واتە لەجیاتی بەرگی ١١ بەرگی ١٢ی نووسیوە. گۆڕینی بەرگو ژمارەی لاپەڕە بۆ ئەوەیە چاپی ئەو کەسەی کاری ((بردن))

**١٥-میسری نەشارەزایی خۆی دەسەلمێنێت کاتێك دەڵێت: هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلم ئەگەر چی لەسەردەمی عەبباسییەکاندا نووسراونەتەوە بەڵام زۆربەی بابەتەکانیان کاریگەریی دەسەڵاتی ئومەوییان پێوە دیارە. ئەو دەقانە ئەوەندەی خزمەتی دەسەڵاتی ئومەوییان کردووە دە ئەوەندە لە خزمەتی دەسەڵاتی عەبباسیشدا بوون (٩٦) ئەوەش قسەی کەسێکە لەژیانیدا ئەو دوو صەحیحەی نەدیوە چونکە دوو صەحیحەکە پڕن لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە سیاسەتەوە نییە: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، کڕین‌و فرۆشتن، باسەکانی مردن‌و قیامەت‌و بەهەشت‌و جەهەننەم، زوهد...تادو ئەو فەرموودانەی باس لە شتی سیاسی دەکەن تەنها بەشێکی بچووکن ئیتر ئەوە ئەوپەڕی نەزانینە بوترێت ((زۆربەی بابەتەکانیان کاریگەریی دەسەڵاتی ئومەوییان پێوە دیارە)) ئیتر ئەگەر ئەم ((زۆربە))یە هەبێت‌و ((دە ئەوەندە))شی بچێتە سەر چی لەو دوو کتێبە دەمێنێتەوە؟**

**میسری ئەمەی لە کێ ((بردووە))؟ ئەمەیان ئیبداعی خۆیەتی... پیرۆزە!**

**ئێستاش تەنها بەئاماژە ((بردنەکانی)) میسری دەستنیشان دەکەم:**

**لەلاپەڕە ٨٩ تا ناوەڕاستی لاپەڕە ٩١ ی میسری لە یاسینەوە براوە (ل٥٥، ٥٧، ٦٢)، لاپەڕە٩٧ میسری/ لاپەڕە٢٨٩ یاسین، لاپەڕە ٩٨ میسری/ لاپەڕە٢٩١ یاسین، ل٩٨ میسری/ ل٢٩٥ یاسین، ل٩٩ میسری/ ل٢٩٩ یاسین، ل١٠٠ میسری/ ل٣٠٠ یاسین، ل١٠١ میسری/ ل٣٠٤ بەدواوە**

---

دەکات جیا بێت لە چاپی ئەو کەسەی زانیارییەکانی لێ ((براوە)). ئەمە سپیکردنی ((بردنە)) هەروەکو سپیکردنی پارەی تلیاك بەوەی بخرێتە ناو پرۆژەی یاساییەوە.

یاسین، ل١٠٢ میسری/ ل٣٠٦ یاسین، ل١٠٣ میسری/ ل٣١١ یاسین، ل١٠٣ میسری/ ل٣١٢ یاسین، ل١٠٤ میسری/ ل٣١٣ یاسین. بەدرێژایی لاپەڕە (٩٧) تا (١٠٥)ش میسری تەنها یەك جار ئاماژە بۆ یاسین دەكات.

## بەشی چوارەم

# ڕەوتی نوێو هاوچەرخی ئیسلامی

((بردنەکان))ی میسری لە کتێبی
(الأحزاب والحركات والجماعات الإسلامية)
ئەویش بە سەقەتکردنو پاش سەقەتکردن
قسەکردن لەسەر بابەتەکان
وەك ((پسپۆڕێك))

**میسری لە لاپەڕە(١٨٤)ی کتێبەکەیەوە دەستدەکات بە سوودوەرگرتن لە کتێبەکەی دکتۆر فەیصەل دەرڕاجو جەمال باroot: الأحزاب والحركات والجماعات الإسلامية.**

**ئەو دوانە ئامادەکاری کتێبەکەن کە لەلایەن چەند کەسێکەوە نووسراوەتەوەو کە یەکێکیان جەمال باrootە. ناوبراو بەشە یەکەمەکانی هەردوو بەرگی یەکەمو دووەمی نووسیوە، میسریش سوودی لەوەی بەرگی یەکەم وەرگرتووە بۆیە بەدرێژایی ئەم باسەمدا ناوی (باroot) بەکاردەهێنم بۆ ئاماژەکردن بۆ کتێبەکە.**

**وتم میسری سوودی لەو کتێبە وەرگرتووە، بەڵام ئەو هەروەکو سەرچاوەکانی تر بە سوودوەرگرتن نەوەستاوەتەوەو کاری ((بردن))یشی لەگەڵدا کردووە. جگە لە ((بردنیش)) میسری بەئارەزووی خۆی زانیاری هەڵدەبژێرێت.. بەئارەزووی خۆی واتە ئەوەی مەبەستێتی، ئەویش لە یەك مەبەستدا کورت دەبێتەوە کە دروستکردنی وێنەیەکی ناشیرین بۆ کۆمەڵە**

ئیسلامییەکانو بەتایبەتی کۆمەڵەی ئیخوانی موسلمین. هەروەکو لەسەرەتای ئەم کتێبەشدا باسم کردبوو ئەم کارە بریتییە لە گێلکردنی خوێنەر هەر وەك هەر کارێکی تری هەڵبژاردنی بەئارەزوو. ڕەنگە میسریش ئەنجامەکەی پێکابێت بەڵام زەرەرمەند خوێنەری نەشارەزایە کە فیکرەیەکی بۆ دروست دەبێت لەبارەی سەردەمێكو لەبارەی کەسانو لایەنی کارای ناو ئەو سەردەمە .. فیکرەیەکی سادە وای لێدەکات هەڵوێستێکی سادەی هەبێت.. سادەش‌و ناتەواویش.

وەك وتم میسری لە لاپەڕە(١٨٤)ـەوە دەستدەکات بە ((سوودوەرگرتن)) لە کتێبی (الأحزاب والحركات..). کتێبەکە لە بەشی یەکەمی ئەو بەرگەدا باسی نەهێشتنی خیلافەتی عوسمانی دەکات تا دەگاتە دروستبوونی کۆمەڵەی ئیخوانی موسلمین کە لە بەشەکانی تردا بەدووروودرێژی باسی دەکات. میسریش کە شوێنیکەوتووە بەهەمان شێوە باسی ئیلغاکردنی خیلافەتی عوسمانی دەکاتو بەهەمان تەرتیبو زانیارییەکانی (بارووت) کاتی باسەکە دەگەیەنێتە سەرەتای دروستبوونی ئیخوان.

(بارووت) لە دوا دێڕەکانی ئەو بەشەدا پاش باسکردنی جیاوازیی نێوان سەلەفیەتی ئیسلامیی ڕۆژهەڵات، کە (محمد رشيد رضا) کەسی دەرکەوتووی بوو، باسی بۆچوونەکانی (عبدالحميد بن باديس) دەکات کە بە (لاهووتیەتی تەحریری مەغریبی–مەغریبی: واتە ڕۆژئاوای جیهانی عەرەبیو ئیسلامی) ناویان دەبات دەڵێت کە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیخوان بریتی بوو لە بەدەزگابوونی بزوتنەوەی سەلەفیەتە ڕۆژهەڵاتییەکە(ل٣٧) میسریش لە دوادێڕەکانی ئەو بەشەی کتێبەکەیدا (ل٢٠٠) دەنووسێت:

((مەبەستی سەرەکی لەم بەراوردکردنە (لە نێوان بن بادیسو ڕەزا/

ف.ق) ئەوە بوو خوێنەر تا ڕادەیەك لە ناوەڕۆكی گوتاری ئوسووڵی تێبگا كە یەكێكی وەكو (موحەممەد رەشید ڕەزا) چۆن چۆنی لەدوای هەرەسی دەوڵەتی خیلافەتەوە پیادەی كردووە، بەتایبەتی ئەو تێزەی كە پەیوەندیی هەیە بە سروشتی دەوڵەتو شێوەی دەسەڵاتی ئیسلامەوەو دوای خۆی بووە گوتاری بزوتنەوەی (ئیخوانولموسلمون)و لەبەرگێكی تردا فیكری ئوسووڵیەتی بەرهەم هێناوە)).

ئەو خوێنەرەی كە میسری دەیەوێت لەناوەڕۆكی وتاری ئوسووڵی تێبگات پێویستە ئەوەش تێبگات كە چۆن چۆنی میسری دەستی بەسەر بەرهەمی خەڵكی تردا گرتووە.

بەكورتی ئەمە چۆن چۆنیی شوێنكەوتنی بارووتە لەلایەن میسرییەوە، بە سوودوەرگرتنو ((بردن))ـەوە:

باروووت باسی تەوژمەكانی ناو دەوڵەتی عوسمانی دەكات، میسریش باسیان دەكات، باروووت باسی نەهێشتنی خیلافەتی عوسمانی دەكات، میسریش باسی دەكات، باروووت ئینجا باسی كاردانەوەی ئەزهەر دەكات، میسریش دوای ئەوە باسی دەكات.. زنجیرەكەش بەردەوام دەبێت: ئیدیعاكردنی خیلافەت لەلایەن مەلك حسێن، هەوڵی مەلك فوئادی میسر بۆ خەلیفە بوون، باسكردنی بۆچوونەكانی (ڕەزا) لەبارەی خیلافەتەوە، باسی ئەو حزبەی كە (ڕەزا) بیری لە دامەزراندنی دەكردو بەتەمابوو مستەفا كەمال (ئەتاتورك) بچێتە ناویەوە، ڕەزاو بزوتنەوەی نەتەوایەتی، باس لە(عەلی عەبدولڕازق)و كتێبەكەی، باسی جیاوازیی نێوان بۆچوونەكانی ڕەزاو بن بادیس، كۆتاییش چەند دێڕێك بۆ ئامادەكردن بۆ بەشی داهاتوو ئەویش دامەزراندنی كۆمەڵەی ئیخوانی موسلمین.

بەم شێوەیە میسری پێ بەپێی شوێنی بارووت کەوتووەو لەو شوێنەکەوتنە لەبیرینەچووە دوو شت بکات:

١– سەرچاوەکانی باروووت ((ببات)).

٢– هەندێك داهێنانو قسەی خۆی زیاد بکات.[1]

هەروەکو سەرچاوەکانی تر ناکرێت بڕگە بە بڕگە بەراوردیی نێوان ئەوەی بارووتو میسری بخەمە بەردەم خوێنەر بۆیە ناچارم چەند شتێك هەڵبژێرم:

١– بارووت باسی ڕێککەوتنی ئاگربەستی ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ دەکات (لە نێوان دەوڵەتی عوسمانو هاوپەیمانان)و هەڵهاتنی سەرکردایەتیی نەتەوەیی تۆڕانی لە تورکیاو هەڵوەشانی کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەقیو دامەزراندنی کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکانی ئەنادۆڵو ڕۆمللی لەلایەن مستەفا کەمالەوە کە زۆربەی کورسییەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەدەستهێنا (ساڵی ١٩٢٠)و بڕیاردان لەسەر پەیمانی میللی (نەتەوەیی) یاخود پەیمانی ئەنقەرە بۆ ڕزگارکردنی هەموو ئەو ناوچانەی زۆرینەیەکی عوسمانیی موسڵمانیان تێدا دەژیاو سەربەخۆبوونیانو یەکگرتنیان لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی بەڵام سوڵتان لەلایەن خۆیەوە کۆمەڵەکەی هەڵوەشاندو هێرشی چەکداری بردەسەر .. تاد. (بارووت، لاپەڕە ١٦).

میسری (ل١٨٦–١٨٧) ئەمانە نەقڵ دەکات (بەڵام لەجیاتی تشرینی

[1] سەرچاوەیەکی تر لەو لاپەڕانەدا هەیە کە میسری زۆر ناوی دەبات ئەویش (الصراع بين التيارين الديني و العلماني في الفكر العربي)ی (د. محمد كامل ظاهر) کە لە کتێبەکەی بارووت کۆنترەو بەداخەوە دەستم نەکەتووە. با بەراوردکردنی ئەو کتێبە لەگەڵ کتێبەکەی میسری ڕاهێنان بێت بۆ ئەو خوێنەرە، یان ئەو ڕەخنەگرە، کە ئەو کتێبەی دەستدەکەوێت.

یەکەم دەنووسێت نۆڤەمبەر کە دەکاتە تشرینی دووەم)، ئەوەشی سەیرە، یاخود ڕاستتر بڵێم سەیر نییە ئەوەیە سەرەڕای نووسینەوەی هەموو زانیارییەکانی باروووت لەجیاتی ئەو سەرچاوەیە ناوی سەرچاوەیەکی تر دەنووسێت کە باروووت نووسیویەتی ئەویش: (الدکتور وجیه کوثراني، الدولة والخلافة في الخطاب العربي ابان الثورة الکمالیة) ئینجا میسری هەمان قسەکانی باروووت دەکات سەبارەت بە هەبوونی دوو دەسەڵات لەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی: دەسەڵاتی شەرعی(ئەوەی سوڵتان لە ئیستەمبووڵ)و دەسەڵاتی ڕاستەقینە (ئەوەی ئەنجوومەن لە ئەنقەرە)، بەڵام میسری ئەو ڕاستییە دەکاتە ئەنجامێك کە خۆی پێی گەیشتووە(ل١٨٧).

دوای ئەوە باروووت باسی هەڵهاتنی سوڵتان وحید الدین لە ئیستەمبووڵ دەکاتو کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نیشتمانی لە تشرینی دووەمی (١٩٢٢) (ل١٧) میسریش (ل١٨٧) باسی ئەوە دەکات بەڵام ئەمجارە بە پێچەوانەوە تشرینی دووەم دەکاتە ئۆکتۆبەر لەجیاتی نۆڤەمبەر.

ئەوی نە میسریو نە غەیری میسری نایانەوێت لەسەری بوەستن ئەوەیە دەسەڵاتەکەی مستەفا کەمال(کە نازناوی ئەتاتورك=باوکی تورکی لەخۆی نابوو) کۆششی کردبوو بۆ نەهێشتنی ڕێککەوتننامەی (سیڤر)و ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی (لۆزان) لەجیاتی ئەو. باروووت باسی ئەوەی کردووە(ل١٦) میسریش هەر باسی کردووە(ل١٨٧ پەراوێزی ٤٠٢) باروووت پێویستی بەوە نەبووە لەسەری بوەستێت چونکە باسەکەی لەبارەی کوردەوە نییە بەڵام میسری کە دەزانێت ئەتاتورك عەلمانیەتی لە تورکیا دامەزراند(ل١٨٨) نایەوێت بڵێت ئەتاتورکی عەلمانی لۆزانی سەپاند. میسری تەنانەت پێچەوانەی ئەوە دەڵێت کاتێك دەنووسێت کە لۆزان ئەو زەمینەیەی بۆ

مستەفا کەمال ڕەخساندو ڕێککەوتننامەکە شەرعیەتی دایە پەیمانی ئەنقەرە.. تاد (ل١٨٧ پەراوێزیی ٤٠٢)[٢]، واتە کاری ئەتاتورك سوودوەرگرتن بوو لە (لۆزان) بۆ دامەزراندنی دەولەتی نەتەوەیی و پێشێلکردنی ڕێککەوتننامەی (سیڤر)و بەم جۆرە میسری ناڕاستەوخۆ ئەتاتورك لە هاتنەدنیای ڕێککەوتننامەی لۆزان بێتاوان دەکات.

میسری (ل١٨٧) ((بردن))ێکی تر دەکات کاتێك باسی شەرعیەتدان بە جیاکردنەوە لەنێوان پلەی خیلافەتو پلەی سەلتەنەت لەلایەن فەقیهە تورکەکانی سەر بە کەمالیەت دەکات (واتە خەلیفە تەنها پێشەوایەکی روحی بێت). میسری قسەی بارووت دەکاتەوە کە ئەمیان لە کتێبی (الخلافة وسلطة الأمة) وەرگێڕانی عبدالغنی سنی بەگ وەریگرتووە ئەویش نەك ڕاستەوخۆ لەو کتێبە بەڵکو لەڕێگەی کتێبەکەی سەرەوەی دکتۆر (وجیه کَوْثراني) (بارووت ل ١٧و پەراوێزی ٩ ل٣٨)، میسریی خۆشمان هەمان ئەم ئاماژانە دەنووسێتو پالێك بەبارووتو کتێبەکەیەوە دەنێت.

بەڵام ئایا ناکرێت میسری بەڕاستی کتێبەکەی (کوثراني)ی بەکارهێنابێتو ئەو دەقەی (الخلافة وسلطة الأمة)ی تێدا بینیبێت؟ نەخێر چونکە ناکرێت بارووت باسی (أ) بکاتو میسری باسی(أ) بکات (بارووت) یەکسەر دوای ئەوە باسی (ب) بکات میسریش هەروەها، بارووت بڵێت(ج)و میسریش بەهەمان تەرتیب بڵێت (ج)، دواییش کە بارووت زۆر ڕۆیشتو میسری شوێنیکەوت میسری لەپڕ باسی ئەو دەقە بکاتو بڵێت بوەستن ئیلهامم بۆ هاتووەو من خۆم بینیومە، بەمەرجێك هەر لەسەر ڕێگەکەی بارووتەو بارووت بەهەمان

---

[2] جگە لەوە میسری شتەکانی تێکەڵ کردووە بەڵام باسکردنی ئەو تێکەڵکردنە زۆری دەوێت.

تەرتیب باسیکردووە.. ئەوە ئیلهام نییە ئەوە ((بردنێکی)) زەقە.[٣]

ئیلهامی میسری بەردەوام دەبێتو یەکسەر دوای ئەوانەی سەرەوە بەبێ ئاماژەکردن بۆ هیچ سەرچاوەیەك (کەواتە ئەمە بۆچوونی خۆیەتی) باسی فەتواکەی فەقیهانی تورك سەبارەت بە جیاکردنەوەی خیلافەت لە دەسەڵات[4] دەکاتو دەڵێت ڕیشەیەکی مێژوویی هەیەو دەچێتە سەر ئیجتهادەکانی (ئەلماوەردی) بەڵام چەمکی خیلافەت بەو جۆرەی کە ببێتە دەسەڵاتێکی ڕووحیو بەس ئەو سنوورە دەبەزێنێت کە کاتی خۆی (ئەلماوەردی) بۆ پایەی خیلافەت دەستنیشانی کردبوو چونکە موجتەهیدانی تورك بەم فەتوایە پایەی خیلافەتیان کردە هاوشێوەی دەسەڵاتی پاپا (ل١٨٧ – ١٨٨) ... ئەمەش دیسان ئیلهام نییە بەڵکو قسەی بارووتە (ل١٧)و میسری ئاماژەی بۆ نەکردووەو کردوویەتی بەهی خۆی.

لەسەرەوە سەرچاوەیەکمان بینی (ئەوەی دکتۆر کوثراني) کە میسری لە باررووتی ((بردووە))، سەرچاوەیەکی تر بریتییە لە کتێبێك کە دیسان باروت ناوەکەی نووسیوە ئەویش وەك سەرچاوەی قسەیەك لەبارەی بەیاننامەی

---

[3] بەڵام ڕێشی تێدەچێت ئەو کتێبەی بینیبێت بەم بەڵگەیەی خوارەوە: میسری ل١٩٠ پ ٤١٣ دەڵێت سوودی لە چاپە نوێکەی کتێبەکە وەرگرتووە.. واتە ئەمە یەکێکە لەو سەرچاوە کەمانەی میسری ئیعتراف دەکات کە بەراستی بینیونی...ئینجا کەسێك دەیان سەرچاوەی نووسیوە گوایە بینیونیو بەکاریهێناون چ پێویستی بەوەیە بۆ سەرچاوەیەکی دیاریکراو بڵێت بینیومە؟ ئەوە قسەیەکە لەگەڵ خۆیدا دەیکات: ئەمەیانم بەڕاستی بینیوەو لە کەسم نەبردووە.

[4] وشەکەی میسری "دەسەڵات" هەڵەیەو ڕاستەکەی "سەڵتەنەت"ـە چونکە لەو نیزامەدا کە هاوشێوەی سەردەمەکانی دوایی دەوڵەتی عەبباسییە خەلیفە هێشتا بەشێك بوو لە دەسەڵات بەڵام دەسەڵاتی فیعلی (سوڵتان) دەیکرد.

شانزە زانای ئەزهەر کە لابردنی خەلیفە عەبدولمەجیدو ئیلغاکردنی خیلافەت بە نادروست دەزانێتو داوا دەکات بەپەلە کۆنگرەیەك لەبارەی خیلافەتەوە ببەسترێت(باروت ل٢٧). باروت دوای ئەوە باسی شتی تر دەکات: بابەتی شێخ موحەممەد حەسەنەین سەبارەت بە بەردەوام بوون لەسەر بەیعەتی عەبدولمەجیدو ئیددیعای خیلافەت لەلایەن مەلیك حسێنەوەو هەوڵی مەلیك فوئاد بۆ هەمان شتو دامەزراندنی لیژنەیەك بۆ خیلافەت... دوای هەموو ئەمانە ئینجا باروت پەراوێزێك بۆ سەرچاوەکەی خۆی دادەنێت کە ئەمەیە: د. محمد حسين (الإتجاهات الوطنية في الأدب المعاصر) بەرگی دووەم، (ل٤٧–٤٩). میسری (ل١٨٨–١٨٩) تەنها بۆ زانیاریی یەکەم، واتە بەیاننامەی شانزە زانای ئەزهەر ئەو کتێبە وەکو سەرچاوەیەکی خۆی دەنووسێت (بەهەڵەش دەنووسێت سوڵتان عەبدولحەمید لەجیاتی عەبدولمەجید)، بەپاڵ ئەم سەرچاوەیەش کتێبەکەی باروتیش دەنووسێت. چۆن ڕێکەوتێکی سەیریشە: باروت بۆ ئەو زانیارییانە کتێبێك بەکاردەهێنێت بەناوی (ڕەوتە نیشتمانپەروەرەکان لە ئەدەبی هاوچەرخ) کە دیارە باس لە ئەدەبو سیاسەت دەکات نەك سیاسەت بەتەنیا، میسرییش لەهەمان خاڵو وێستگەدا هەمان سەرچاوەی ((دەستدەکەوێت))و ((دەیبینێت))و ((بەکاریدەهێنێت)).

میسری دوای ئەوە باسی بابەتەکەی شێخ محمد حەسەنەین وەکیلی پێشووی ئەزهەر دەکات کە داوای لە موسڵمانان کرد ((بەردەوام بن لە سەر بەیعەتکردن بە سوڵتان عەبدولمەجید ئەگەر بەئارەزووی خۆیشی کارکەنار بووەو دەستی لەپایەی خیلافەت هەڵگرتووە، دەبێ موسڵمانان بەیعەت بە خەلیفەیەکی تر بکەن)) (ل١٨٩).

سەرچاوەی میسری ئەم کتێبەیە کە نەیدیوە: تطور الفكر السياسي في الإسلام لە نووسینی د. فتحية النبراوي و د. محمد نصر مهنا، بەرگی دووەم ل٣٨٨.

ئەو کتێبە (ل٣٨٨—٣٨٩) باسەکە بەشێوەیەکی تر دەنووسێت: شێخ حەسەنەین ئەوەی نووسیبوو: ئوممەتی میسری شایەنی خیلافەتەو لەهەموو میللەتێکی تر هەقترە وەریبگرێت چونکە چەندین هەزار زانای ئاینیو قوتابیی عیلمی تێدایەو ئەزهەریش هەر لە میسرە.

جیاوازیی دوو دەقەکەش بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی میسری سەرچاوەکەی نەبینیوە. خۆشیش ئەوەیە میسری ئەو قسەیەی خستۆتە ناو کەوانەوە کە نیشانەی وەرگرتنی دەقاودەقە.

barووت سەبارەت بە هەوڵی دامەزراندنەوەی خیلافەت لە میسردا دەڵێت وا دیارە مەلیك فوئاد هاندان(تەشجیع کردن)ی بەریتانیای دەستکەوبێت، بەریتانیاش بیری لەوە دەکردەوە پایەی خیلافەت بۆ ئیحتواکردنی موسڵمانانی هندستان بەکاربهێنێت(ل٢٨) بەڵام میسری یان لەو قسەیە تێناگات یان تێدەگاتو دەیەوێت وای پیشان بدات حەزکردنی بەریتانیا مەسەلەیەکی بڕاوەیە بۆیە دەڵێت: ((سەرچاوە مێژووییەکانیش بەگشتی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەریتانیا ڕۆڵێکی دیاری هەبووەو هانی پادشای میسری داوە هەوڵ بدا پایەی خیلافەت بۆ خۆی مسۆگەر بکات)) (ل١٨٩—١٩٠).

بڕگەکەی میسری دەستکارییەکی تەواوی ئەوەی barووتە چونکە بەپێی ئەو کتێبە نازانین کامانەن ((سەرچاوە مێژووییەکان)) چونکە سەرچاوەکەی میسری ئەوەی barووتە، barووتیش لەو شوێنەدا ئاماژەی بۆ هیچ

سەرچاوەیەك نەداوەو تەنها دوای بڕگەیەكی تر كە باسی مستەفا كەمال دەكات ناوی كتێبەكەی ئەرمستڕۆنگ (گورگی بۆر) دەهێنێت. ئەمە یەك، دووش ئەوەیە ئەو ((سەرچاوە مێژووییانە)) جەخت لەسەر دەوری بەریتانیا ناكەن چونكە بینیمان سەرچاوەكەی میسری (واتە بارووت) دەڵێت ((وادیارە)) یاخود ((واپێدەچێت)).

میسری لە دێڕەكانی دوای ئەوە مەبەستی خۆی ڕوونتر ئاشكرا دەكات: ئەو دەیەوێت خوێنەر تێبگەیەنێت كە بەریتانیا مانەوەی خیلافەتی مەبەست بوو ئەوەتا دەنووسێت: ((پێشتریش بەریتانیا هەوڵێكی زۆری دا نەهێڵێ (مستەفا كەمال) پایەی خیلافەت ئیلغا بكات. لەڕێگای چەند ڕێبەرێكی ئاینییەوە هانی موسڵمانی هیندستانی دا دژ بە هەڵوێستی تازەی تورك بوەستن‌و ڕێگا نەدەن پایەی خیلافەت لەبەین بچێ!! كاتێكیش (مستەفا كەمال) بەكردەوە سیستەمی خیلافەتی نەهێشت هەلێكی باشتر بۆ بەریتانیا ڕەخسا هەوڵی دامەزراندنی خیلافەتێكی عەرەبی–ئیسلامی بدا، لەو كاتەشدا كەس لە پادشای میسر گونجاوتر نەبوو، خودی پادشای میسریش زۆری مەبەست بوو.. تاد) (ل١٩٠).

دوو سێ دێڕی یەكەمیش لەڕاستیدا هەر لە كتێبەكەی بارووتدا هاتوون بەڵام بەشێوەیەكی ترو میسری بەئارەزووی خۆی تێكیداون. وەك چۆنیش میسری بڕگەی سەرەوەی دوای باسی بەریتانیا نووسیوە، بارووتیش دوای باسی بەریتانیاو خیلافەت وفوئادو موسڵمانانی هیندستان دەڵێت: پێشتر مستەفا كەمال هەڵمەتێكی مەنهەجیی كرد بۆ ناوزڕاندنی دوو پێشەوای موسڵمانی هیندی (ئاغا خان)و (ئەمیر عەلی) كە بەناوی موسڵمانانی هیندستان داوایان لێكردبوو ڕێز لە پایەی خەلیفە بگرێت مستەفا كەمالیش

بە داردەست (صنائع)ی ئینگلیز ناوی بردن (ل٢٨).

هەڵگێڕانەوەی زانیارییەکانیش بەردەوام دەبێت کاتێك میسری دەڵێت کە هەلێکی باشتر بۆ بەریتانیا ڕەخسا هەوڵی دامەزراندی خیلافەتێکی عەرەبی ئیسلامی بدا (ل١٩٠) لەکاتێکدا باروت باسی هاندانی مەلیك فوئاد بۆ دەستکەوتنی پایەی خیلافەت وەك بەشێك لە سیاسەتەکەی بۆ دامەزراندنی خیلافەتێکی عەرەبی دەکات ئینجا باروت ئەوە بەشێوەیەکی ئەکید ناڵێت بەڵکو دەڵێت: ((دەتوانرێت وا دابنرێت)) بارووتیش باسی خیلافەی عەرەبی–ئیسلامی ناکات، بەڵام میسری مەبەستێتی ناوی ئیسلام بەهەموو شتێکی عەرەبییەوە بلکێنێتو بەپێچەوانەوە.

ڕەنگە لەم شوێنە گونجاوترمان نەبێت بۆ باسکردنی بەریتانیاو فوئادو خیلافەت:

باروت باسی دەکات کە یەکدەنگی نەبوو لەبارەی دانانی فوئاد بە خەلیفە وەکو ئەوانەی وڵاتی میسریان بە شوێنی شیاوی دامەزراندنی خیلافەت نەدەزانی وەکو شێخی ئەزهەرو ڕەزا، ئا لەو کاتەدا بوو (ساڵی ١٩٢٥) شێخ عەلی عەبدولڕازق کتێبە ناودارەکەی بڵاوکردەوە (ئیسلامو بنەماکانی فەرمانڕەوایی–الإسلام وأصول الحكم) (ل٢٨–٢٩).

باوکی عەبدولڕازقیش پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبووە لەگەڵ ئینگلیزو ئەو بۆچوونە هەیە کە بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە لەو کاتەدا دەگەڕێنێتەوە بۆ خواستی ئینگلیز دژ بە زیندووکردنەوەی خیلافەت[5].

هەڵوێستی ئینگلیز لە خیلافەت لەوەدا دەردەکەوێت کە پرۆژەکەیان بە

---

[5] زانیارییەکی دوورودرێژ لەو بارەیەوە هەیە لە کتێبێك بەناوی فصل الدين عن الدولة کە بەداخەوە ئێستا لەبەردەستمدا نییە.

جیدی وەرنەگرتبوو ئەگینا ئەگەر بەلایانەوە گرنگ بوایە دەیانتوانی وەکو هێزێکی داگیرکەر دەوڵەتی خیلافەت لە میسردا بسەپێنن، ئەوان تەنانەت پشتگیریی خەونەکەی شەریف حسێنیشیان نەکرد کە نیازی بوو بەپشتیوانیی ئەوانەوە خیلافەتێکی عەرەبی دابمەزرێنێت بەڵکو بەپێچەوانەوە وڵاتانی شامو عیراقو حیجازیان پەرت کرد.

بەکورتی بۆچوونێکی لاوازە گەر بڵێین ئینگلیزهانی فوئادی دا بۆ دامەزراندنی خیلافەت، وەك وتیشم لەبەر ئەم هۆیەیە باروووت دەڵێت: ((وا پێدەچێت)) واتە دەیخاتە خانە ئەگەر بەڵام میسرییەکەی کوردستان ئەو شتانە نازانێتو بەپێی نیازەکەی خۆی پێویستە ئەو هاندانەی ئینگلیز ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر بێت.

میسری لەبارەی ڕەزاو مستەفا کەمالەوە لە باروووت وەردەگرێت بەڵام ناوی کتێبەکەی ئەو ناباتو لەجیاتی ئەوە ناوی ئەو سەرچاوەیە ((دەبات)) کە باروووت نووسیویەتی. باروووت ئەمانە دەڵێت:

ڕەزا نەیدەویست خیلافەتی عوسمانی زیندووبکرێتەوە چونکە ئەو وەکو فەقیهانی سەر بە مستەفا کەمال ئەو دەوڵەتەی وەکو خیلافەتی (تەغەللوب)و پادشایەتییەکی (عەضووض) دەبینی بەڵام ئەنجوومەنی نیشتمانیی تورك کە بەڕاستی ئەهلی حەلو عەقد پێکدەهێنێت (تەغەللوب)ێکی تری خستە جێگەی ئەو (تەغەللوب)ـە، بەواتایەکی تر ئەو خیلافەتە ڕووحییەی لەکاتی ئەنجوومەنی نیشتمانیدا بڕیاری لەسەر درا خیلافەتێکی شەرعی نییە بەڵکو خیلافەتێکی نوێی (تەغەللوب)ـە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەو ڕازییە بەوەی ناوی خیلافەتی لێ بنرێت(ل٢٣).

پەراوێزی ٢٣ لە لاپەڕە٣٩ ئاماژە بۆ کتێبەکەی ڕەزا دەکات (الخلافة أو

الإمامة العظمى) ل٨٧ كە لە دووتوێی کتێبەکەی (کوثراني) جارێکی تر بڵاوکرایەوەو دەڵێت: لەبارەی دیدی ڕەزا سەبارەت بە خیلافەتی ڕووحی وەکو خیلافەتێکی نوێ (تەغەللوب) بڕوانە ل٧٤.

دوای ئەم بڕگەیەی سەرەوەش دەڵێت کێشەی ڕەزا لەگەڵ بڕیارەکەی مستەفا کەمال سەبارەت بە خیلافەتی ڕووحی بریتییە لە کێشەی جیاکردنەوەی تەواوی دین‌و دەوڵەت (ل٢٣) لێرەشدا ئاماژە بۆ هەمان سەرچاوە دەکات‌و دەنووسێت لاپەڕە (٥٣).

میسری (ل١٩٢) دوور لەئەمانەتەوە ئەو قسانەی باروت وەردەگرێت‌و لەجیاتی ئاماژە بۆ نووسینەکەی باروت لەپەراوێزدا دەنووسێت: محمد رشید رەزا الخلافة أو الإمامة العظمى ، بڕوانە (الدكتور وجيه كوثراني، الدولة والخلافة ...) ل٤٧.[٦]

لەلایەکی ترەوە میسری سەلماندوویەتی کە هیچ شارەزاییەکی لەو زاراوانە نییە کە لە بواری فیقهی سیاسیی ئیسلامیدا هەن. میسری نەیزانیوە خیلافەتی (تغلب)و پادشایەتی (عەضووض) چین بۆیە دەنووسێت: ((سیستەمی لەمێژینەی پاشایەتی))، هەروەها ئەو بۆچوونەی ڕەزا کە باروت نەقڵی دەکات ئەویش کە ئەنجوومەنی نیشتمانی لای ئەو ئەهلی حەل‌و عەقد پێکدەهێنێت لای میسری وای بەسەردێت: ((لەبەرئەوە بە

[6] لێرەدا نموونەیەکە لەسەر ((بردنی)) کوێرانە کە شوێنەوار لەدوای خۆیدا جێدەهێڵێت چونکە وەك بینیمان ئاماژەکەی باروت بۆ ئەو سەرچاوەیە بریتییە لە لاپەڕەکانی (٨٧)و (٧٤)و (٥٣) کە هیچیان لاپەڕە (٤٧) نین کە میسری نووسیویەتی. میسری تەنها لاپەڕە (٧٤)ی بینیوەو بە(٤٧) ی زانیوەو ژمارەی لاپەڕەکانی تری پشتگوێ خستووە هەرچەندە ئەو شتانەی میسری دەیانووسێت لەو لاپەڕانەدا هاتوون.

ئیجتیهادی خۆی جەمعییەتی نیشتمانیی تورك دەخاتە شوێنی خەڵكی خاوەن دیدو تەجروبەوەو پەسەندی دەكات))..تەعبیر ئەهلی حەلو عەقد، كە میسری دەڵێت ((خەڵكی خاوەن دیدو تەجروبە))، زاراوەیەكی فیقهی سیاسیی ئیسلامییەو چەند بۆچوونێكی لەبارەوە هەیە: زانایانن یان زانایانو سەرۆكانو پیاوە دەركەوتووەكانن.. تاد، تەعبیرەكەی میسریش نەك تەنها بەلای ئەو واتایەدا ناچێت بەڵكو تەعبیرێكی شێواوەو هیچ واتایەكی نییە.

میسری زۆر پێش ئەوانەی سەرەوە لە باروت ((دەبات)) .. واتە باسی ڕەزاو هەڵوێستەكەی لە ئیلغاكردنی خیلافەتو لەیەكچوونو جیاوازیی بیروبۆچوونی ئەو لەگەڵ فەقیهە توركەكانی سەر بە ئەتاتورك. پێشتریش مەسەلەی ئیلغاكردنی خیلافەتو هەوڵەكەی مەلیك فوئاد بۆ خیلافەت .. بەڵكو زۆر پێشتریش (ل١٨٣ بەدواوە).

باروت باسی ئەو حزبە دەكات كە لە مێشكی ڕەزادا بووە بەناوی(حزبی چاكسازیی ئیسلامیی میانڕەو)و بەتەما بووە مستەفا كەمال بچێتە ناو ئەو حزبە كە دەتوانێت هەموو ئەو كەسانە لە هەردوو لایەنەكەوە ڕابكێشێت كە ئامادەن ئوممەتی ئیسلامی نوێبكەنەوە(باروت ل٢٣)، میسریش كە دەبینێت دوای ئەوە باروت باسی بەشداریكردنی ڕەزا لە بزاڤی قەومی دەكات لەو قسەیەی سەرەوە تێناگاتو دەڵێت ڕەزا دەیەوێت ئەو حزبە ببێتە ((ئامرازێكی سیاسی بۆ هەموو ئەو كەسانەی ئامادەن گیان بكەنەوە بەبەر نەتەوەكەیانداو لە پێناو ژیاندنەوەیدا تێدەكۆشن)) (ل١٩٢–١٩٣) لێرەشدا سەرەڕای تێنەگەیشتن ناوی كتێبەكەی ڕەزا، لە دوو توێ كتێبەكەی (كوثراني)، ((دەبات))و دەنووسێت: سەرچاوەی پێشوو ٩١–٩٢–٩٣ میسری لێرەدا تەنانەت شێوەی نووسینی لاپەڕەكەش لە باروت دەبات

چونكە ناوبراو بە هەمان شێوەو ڕەسم دەینووسێت واتە: ص ٩١-٩٢-٩٣.

زانیارییەكی تری باروووت كە میسری نەقڵی دەكات بەڵام سەرچاوەكەی باروووت ((دەبات)) هەروەها زانیارییەكە دەشێوێنێت باسی بەشداریكردنی ڕەزایە لە بزاڤی قەومی بەڵام لەهەمان كاتدا بەتوندی دژ بەو ((بێباوەڕانە)) دەوەستێتەوە كە دەیانەوێت پەیوەستی ئیسلامی بگۆڕنەوە بە پەیوەستی ڕەگەز، موسڵمانە قەومییەكانیش بە ((موسڵمانە جوگرافییەكان)) ناو دەبات (باروووت، ل٢٣-٢٤). میسری لە باسی بەشداریكردنی ڕەزا لەو بزاڤە كەرەستەیەكی دەستدەكەوێت بۆ مەبەستەكەی خۆی: لكاندنی سیفەتی نەتەوەیی بە هەموو ڕێكخراو و كەسایەتییە ئیسلامییە دیارەكان. میسری دەنووسێت: ڕەزا لەبنەڕەتدا خاوەنی پرۆژەیەكی نەتەوەییە بەڵام لەبەرگێكی ئاینیدا، بەكردەوەش لەناو حزبی وادا كاریكردووە نە لە بەرنامەی سیاسیو نە لە هیچ ئەدەبیاتێكدا باسی پەیڕەوكردنی شەریعەتی ئیسلامیی نەكردووە... تاد (ل١٩٥) میسری قسەكەی سەرەوەی باروووت هێندە دەشێوێنێت تا دەیگەیەنێتە ڕادەی تەزویركردن، ئەوەتا دەنووسێت: ((یەكێتیی جیهانی ئیسلام كە زۆر پەرۆشی بووەو بەرگریی لە بوونو بەردەوامی دەكرد بۆ ئەوە بوو بیكاتە فاكتەری زیندووكردنەوەی ڕۆڵی عەرەبو ڕێبەرایەتیی موسڵمانانی جیهانی پێ بسپێرێ)) ل١٩٦.

ئینجا ئەو هێرشە توندەی ڕەزا دژی ئەوانەی پەیوەستی ئیسلام دەگۆڕنەوە بە پەیوەستی ڕەگەزو بە بێباوەڕ ناویان دەباتو جارێكی تر موسڵمانە قەومییەكان بە موسڵمانە جوگرافییەكان ناو دەبات... لەسەر دەستی میسریدا دەگاتە پلەیەكی بەرزی تەزویر كاتێك دەڵێت: ((ئەوەندەش پەرۆشی ئەم مەسەلەیە بووە خسوسیەتی نەتەوەیی لە گەلانی موسڵمانانی

غەیری عەرەب دەستێنێتەوە پێی وایە ئەوانەی قسە لە جیاوازیی نەتەوەیی دەکەن فریان بەسەر ئیسلامەوە نییەو (موسڵمانی جوگرافیایین) )) ل١٩٦.

تەزویرەکەش قێزەونتر دەبێت کاتێك لای بارووت ئەوە دەخوێنینەوە کە ڕەزا دەرکەوتنی مەسەلەی نەتەوەیی لە جیهانی ئیسلامیدا دەبینی بەڵام ئەو هەمیشە بە یەکێتیی ئەو جیهانەی دەبەستەوە (بارووت، ل٢٣)... کە دیارە ئەمە چەند دوورە لە تەزویرەکەی میسری: ((سەندنەوەی خسوسیەتی موسڵمانانی غەیری عەرەب)).

ئەم جۆرە تەزویرە لە شوێنی دیکەی کتێبەکەیدا دەبینینەوە چونکە مەبەستی میسری (یان با بڵێین مەبەستێکی میسری چونکە مەبەستێکی تری هەیەو پەیوەندیی بە قازانجی شەخسییەوە هەیە) ئەوەیە هەموو کەسایەتیو ڕێکخراوەکانی جیهانی ئیسلامی بە بەرژەوەندیی نەتەوەییەوە ببەستێتەوەو لەوەش وردتر: ئەو کەسو ڕێکخراوانە ئەگەر عەرەب بن ئیسلام دەکەنە پەردەیەك بۆ شاردنەوەی ئامانجەکانی عەرەبایەتیو تەماعی نەتەوایەتی.

دوای ئەوە میسری باسی بەرەنگاربوونەوەی بۆچوونەکانی رەزا لەلایەن عەلی عەبدولڕازق دەکات، لێرەشدا هەمان کار دەکات واتە نەقڵکردنی زانیارییەکان لە بارووتو ((بردنی)) ناوی سەرچاوەکانی کە یەکەمیان هەر کتێبەکەی رەزایە بەڵام دیسانەوە دەیسەلمێنێت کە بەپاڵ ((بردن)) باش لە قسەکانی تێناگات. بارووت باسی دوو ڕەوت دەکات کە یەکێکیان ئەوەی رەزایەو بە (تەوژمی سەلەفیەتی ڕۆژهەڵاتی) ناوی دەباتو کە داوای بەرنامەیەکی تایبەتی کردبوو بۆ ئامادەکردنی پاڵێوراوانی خیلافەتو هەڵبژاردنی خەلیفەی موجتەهید (بارووت، ل٣٥) کەچی میسری دەنووسێت: ڕەزا لە تێڕوانینێکی سەلەفییەوە داوای کرد کە دەبێ بە پشتبەستن بە

بەرنامەیەکی تایبەت چەند کەسێك بۆ پایەی خیلافەت کاندید بکرێن... تاد(ل ١٩٨)... ئەمەش نەشارەزاییەکی تەواوە: ئەوەی تەرح کراوە پەیوەندیی بە سەلەفییەتەوە نییە بەڵام لەبەر ئەوەی میسری ناوی (تەوژمە سەلەفییە ڕۆژهەڵاتییەکە) دەبینێت تەرحەکەی ڕەزا دەکاتە تێڕوانینێکی سەلەفی !

دوای ئەوە میسری شوێن پێی باروت هەڵدەگرێتو باسی (عبدالحمید بن بادیس) دەکاتو قسەکانی نەقڵ دەکات سەبارەت بەستایشکردنی ئەتاتورك لێرەشدا سەرچاوەیەکی تر لە باروت دەبات ئەویش کتێبی د. محمد عمارە: الإسلام والعروبة والعلمانية.

میسری وەکو دەڕڕاسەی جووتیارێکی تەمبەڵ بەرهەمی خەڵکی دەدورێتەوەو بێئەوەی بەخۆی بزانێت گەنمو مرۆر تێکەڵ بە یەك دەکات.

سەرەتا بن بادیس سەبارەت بە مەسەلەی خیلافەت، وەك لەخوارەوە دەیبینین، خۆی بە مەسەلە فیقهییەکە سەرقاڵ ناکات (باروت، ل٣٥) کەچی میسری پاش باسکردنی جیاوازیی نێوان بۆچوونی رەزاو بن بادیس دەڵێت کە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فیقهی ئیسلام نەیتوانیوە مەسەلەی دەسەڵاتو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام یەکلایی بکاتەوەو هەر هەوڵێك کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام لەو بارەوە دراوە نەیتوانیوە لەسەر بناغەی دەق خۆی بسەپێنێت (میسری، ل١٩٨).

بەواتایەکی تر باروت کە باسی بن بادیس دەکات دەڵێت لە لایەنە فیقهییەکەی نەکۆڵیوەتەوە چ جای ئەوەی بن بادیس بێتە سەرچاوەیەکی فیقهی ئیسلامی سەبارەت بە خیلافەت. بەکورتی جیاوازیی نێوان تەوژمەکەی (رەزا)و (بن بادیس) ئەوەیە یەکەمیان داوای دەکرد پاڵێوراوانی

خیلافەتو پاشان خەلیفە دەستنیشان بکرێن لەکاتێکدا دووەمیان دەیوت خیلافەت خەیاڵەو نایەتەدیو لەجیاتیی ئەوە دەزگای ئەهلی حلو عەقد هەبێت، بەم جۆرەش دوو هەڵوێستەکە سیاسینو باسی دەق نەکراوە، باسیش لە تەنها دوو کەس کراوە بەڵام میسری ئەوەی باس نەکراوەو عەیب نییە دەیکاتە عەیبێك بۆ هەموو فیقهی ئیسلامی ئەویش ((بەدرێژایی مێژوو)).

باروت بە ئاماژەکردن بۆ کتێبەکەی (عمارة) باسی بۆچوونەکانی (بن بادیس) دەکات کە لەبارەی مەسەلەی خیلافەتەوە خۆی ناخاتە ناو موناقەشەی فیقهی کە ئایا مەسەلەیەکی شەرعیو ئاینییە یان مەسەلەیەکی سیاسییە (ل٣٥)و نیزامی خیلافەت دەگۆڕێت بۆ دەزگای ئەهلی حەلو عەقد کە لای ئەو مەرجیعەتێکی ئاینیی ڕووتەو دوورە لە سیاسەت (ل٣٦). میسریش ئەمانەو قسەی تری باروت نەقڵ دەکات بەڵام ناوی کتێبەکەی د. محمد عمارة ((دەبات)) سەرەڕای ئەوەش هەڵە لەو ((بردنە)) دەکات وەك قسەی بن بادیس سەبارەت بە خەیاڵی خیلافەت کە قەت نایەتەدیو کە باروت بەم جۆرە دەیهێنێتەوە:

لەسەرەتای ئیسلامدا، ماوەیەکیش دوای ئەوە (بەڵام لەحاڵەتی پەرتەوازەییو پشێوی –علی فرقة واضطراب) ڕوویدابوو کە تاکە کەسێك دەبووە خەلیفە، پاشان پێویستی کرد چەند خەلیفەیەك لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا هەبوونایە، دوای ئەوەش لەواتا ئەسڵییەکەی جیابووەوەو وەکو هێمایەکی ڕواڵەتیو تەقدیسی مایەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە وەزعەکانی ئیسلامەوە نییەو هێمایەك بوو بۆ خیلافەتی ساختە (باروت ل٣٦).

بزانین چۆن میسری ئەو قسەیە ((دەبات)):

جا ئەگەر لەسەرەتای ئیسلامەوە یان دوای ئەو قۆناغە کەسێك کەڵکی لەئاژاوەو ناکۆکی وەرگرتبێتو لەسایەی پشێویو نائارامیدا گەیشتبێتە پایەی خیلافەتو دوای ئەویش چەندەها جار پایەی خیلافەت بۆ ئەمو ئەو تازە کرابێتەوە بەڵگەی ئەوەیە کە خیلافەت ڕەمزێك بووەو هیچی ترو فری بەسەر بنەماکانی ئیسلامەوە نەبووە. (بن بادیس) لەوەیشی تێدەپەڕێنیو سیستەمی خیلافەت بە ڕەمزی ساختە دەزانێ (میسری ل٢٠٠).

دەبوایە خەتمان بەژێر هەموو بڕگەکەدا بهێنانە چونکە سەرتاپا شێوێنراوەو هەر ڕستەیەکی بەڵگەیەکی تێنەگەیشتنی میسری لە دەقەکە دەسەلمێنێت، ئەوەش جگە لە تەزویرکردنی دەقەکە. هەر لەسەرەتاوە جیاوازیی نێوان وشەی (اذ)و (اذا) نازانێت، پاشان جگە لە سەلماندنی ئەوەی ناتوانێت دەقەکە بەدروستی بخوێنێتەوە تا بزانێت کابرا مەبەستی لە سەردەمی دوای سەرەتای ئیسلامە کاتێك باسی پەرتەوازەییو پشێوی دەکات نەشارەزایی خۆی لەبارەی مێژووی ئیسلام دەسەلمێنێت چونکە وادەزانێت لەسەرەتای ئیسلامدا(صدر الاسلام) کەس هەبووە کەڵکی لە ئاژاوە وەرگرتبێتو لەسایەیدا بووبێتە خەلیفە، بەڵام ئەوە هیچ لە چوار خەلیفەی یەکەم ناگرێتەوە مەگەر (عەلی) کە پاش ئاژاوەکەی دوای کوشتنی (عوسمان) خەڵکێك هەبوون چووبوونە لایو داوایان لێکردبوو ببێتە خەلیفە، دوای ئەوەش کە (بن بادیس) باسی فرەخەلیفەیی دەکات دەڵێت: (ثم قضت الضرورة بتعدده في الشرق والغرب). هەر کەسێکیش ئاگای لە مێژوویی سەردەمە ئیسلامییەکان بێت دەزانێت مەبەستی لە هەبوونی خەلیفەی عەبباسی لە ڕۆژهەڵاتو خەلیفەی ئەمەوی لە ئەندەلوس( ڕۆژئاوا)و دوایی خەلیفەی فاتیمی لە ڕۆژهەڵاتی جەزائیرو توونسو دواتر لە میسرو پاشان لە

شام، ئەوەشە واتای وشەی (تعدد) بەڵام میسری دەنووسێت: ((دوای ئەویش چەندەها جار پایەی خیلافەت بۆ ئەمو ئەو تازە کرابێتەوە))، ئەمەش جگە لە تێنەگەیشتن لە دەقو نەزانینی مێژوو قسەیەکی بێمانایە چونکە یانی چی پایەی خیلافەت بۆ کەسێك تازە کرابێتەوە؟ تازەکردنەوەی خیلافەت واتای هەبوونی شێوە هەڵبژاردنێك یان دامەزراندنێك کە ساڵی جارێك یان دوو ساڵ جارێك یان دە ساڵ جارێك تازە دەکرایەوە.

دوای ئەوە بن بادیس باسی سەردەمەکانی دواتر دەکات کە خیلافەت بووە هێما کەچی میسری خراپ تێدەگاتو دەنووسێت کە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خیلافەت تەنها ڕەمزێك بووە، ئەوەش نەشارەزاییەکی ترە لە مێژووی ئیسلام دەنا هەر کەسێك شتێکی کەمی لەو مێژووە خوێندبێتەوە ناڵێت خەلیفە راشیدەکان یان موعاویە یان عەبدولمەلیك کوڕی مەڕوان یان سولەیمان یان هیشام یان ئەبو جەعفەر ئەلمەنسوور یان هاڕوون ئەلڕەشید تەنها ڕەمزێك بوون.

میسری کۆتایی بەو فەزاحەتە دەهێنێت کاتێك قسەکەی بن بادیس هەڵدەگێڕێتەوە سەبارەت بە سەردەمەکانی دواتری خیلافەت (تێبینی بکە: سەردەمەکانی دواتر نەك هەموو سەردەمەکان) کە ئەو خیلافەتە لە واتاکەی دەرچوو و بوو بە هێمایەکو پەیوەندیی بە هیچ وەزعێکی ئیسلامەوە نەماو بووە هێمایەك بۆ خیلافەتی ساختە. میسریش قسەکە هەڵدەگێڕیتەوەو ئەو حاڵەتە نوێیە دەکات بە حاڵەتی کۆنو ئەسڵی کاتێك قسەکەی بن بادیس کە خیلافەت ((پەیوەندیی بە هیچ وەزعێکی ئیسلامەوە نەما)) دەکاتە ((فڕی بەئیسلامەوە نەبووە)). بینیشمان قسەکەی بن بادیس کە خیلافەت لە سەردەمە نوێترەکان بووە ڕەمزێکی ساختە لای میسری دەبێتە ئەمە: ((بن

بادیس ئەوەش تێدەپەڕێنێت‌و سیستەمی خیلافەت بە ڕەمزی ساختە دەزانێت)).

ئەو هەموو فەزاحەتەش کە لە پێنج شەش دێڕدا هەن ئەنجامی چاوەڕوانکراوی کاری کەسێکە ((بردن)) پیشەی بێت‌و لەسەر بەرهەمی خەڵکی تر بژی.

میسری ئەوانەی سەرەوە دەنووسێت‌و تەنها پێنج دێڕی دەمێنێت بۆ کۆتایی ئەو بەشە کە باس لە کەسانێك‌و بزاڤێك دەکات کە نەماون، دوای ئەوەش دەچێتە سەر بەشی ئیخوانی موسلمین کە تا ئێستا هەن، دیاردەیەکی زانراویشە کە مرۆڤ بەرامبەر هاوسەردەمەکانی خۆی، ئەگەر لەگەڵیاندا ناکۆك بێت، ڕەقترە، کەواتە دەبێت میسری چی لە ئیخوان بکات؟

## بەشی پێنجەم

# لەبارەی ئیخوانەوە

تێنەگەیشتن.. ((بردن)).. تەزویر.. بەرگری لە
دیکتاتۆریەت.. نیەتی خراپ..
ئێرە کوێیە؟

ئەگەر حساب بۆ نیازەکانی میسری لە نووسینی کتێبەکەی بکەین پێویستە چاوەڕێی توندتربوونی هێرشەکان بین ئەویش کاتێك باسەکان دەگەنە سەردەمی نوێ چونکە کتێبەکە بۆ مەبەستێك نووسراوەتەوە کە زیاتر پەیوەندیی بەم سەردەمەوە هەیە. مەبەستی میسری ئەوەیە هێرش بکاتە سەر ڕەوتی ئیسلامی کە حاڵەتێکە ئەمڕۆ هەیە. بەشێکی هێرشەکان بەر مێژووی ئیسلامی دەکەون، کە باسەکانیش دەگەنە سەردەمی نوێ مەبەستەکە دەچێتە مەیدانی خۆی بۆیە هێرشەکان توندتر دەبنو ئەو وەسیلانەی کە پێشتر ڕەوا بوون ئێستا دەبنە زەڕوورەت. ئەگەر حسابیش بۆ نیازەکەی تری میسریش بکەین (خۆنزیککردنەوە لە دەسەڵات) دەرگاکە بەتەواوەتی بەڕووی نەرمیو ئینسافو مەوزووعیەتدا دادەخرێت.

کۆمەڵەی ئیخوانی موسلمین بابەتێکی زۆر باشی هێرشە چ لە کوردستانو چ لە وڵاتانی عەرەبی، بەتایبەتی ئەو وڵاتە عەرەبییانەی ئیخوان تێیاندا مونافەسەی دەسەڵات دەکات. لەبەر ئەوەش کە شەڕەکە کەمتر مێژووییەو زۆرتر هی ئەم سەردەمەیە شەڕەکە دەبێتە شەڕی دەستەویەخەو هەر نەرمییەك یان مەوزووعییەتێك شکستی ئەکیدی بەدواوەیە.

ئەوانەی خوارەوە تەواوکەرەوەی مامەڵەکردنی میسرین لەگەڵ کتێبەکەی (دەڕڕاج)و (باروت)و هەڵبژاردەیەکی هێرشەکانە (ناڵێم ڕەخنەکان) لە بەشی دووەمی کتێبەکەی میسری: (ئیخوان ئەلموسلمون : میراتگری بیری ئسوولی ئیسلامی –ل٢٠١ بەدواوە)، هەڵبژاردەیەکە بەپێی شێوەی هێرشەکە پۆلێنمان کردووە.

بەر لەهەموو شتێکیش ئەوەمان لەبیر نەچێت کە کۆمەڵەکە ئیجتهادێکی بەشەرییە بەشی خۆی ڕاستیو هەڵەی هەیە، خۆ ئەگەر ئەم کتێبە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەوتی ئیسلامی بوایە چەندەی ئینساف ڕێگە دەدات ڕەخنەمان لەو کۆمەڵەیە پێشکەش بە خوێنەران دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کتێبەکە ڕەخنەیە لە کتێبێکی تر ناچارین هەندێك شوێن نەبێت بۆچوونی خۆمان دەربارەی ڕەوتو مێژوو وفیکرو فیقهی ئیسلامی نەڵێین.

جارێکی تریش باسی مەبەستی میسریو هاوشێوەکانی بکەین کە بریتییە لە نووسینی تاواننامەیەك بۆ ڕەوتی ئیسلامی، لەبەرئەوە پرسیارەکەم دەکەمەوە کە بەشی پێشوو کۆتایی پێهێنا: ئەگەر ڕەزاو بن بادیس لەسەر دەستی میسری وایان بەسەرهاتبێت ئەی دەبێت حاڵی ئیخوان چی بێت کە میسریو هاوشێوەکانی بە ئەرکی دەزانن دژایەتییان بکەن بەتایبەتی لەبەرئەوەی تا ئیستا ماونو درێژبوونەوەو کارگەرییان هەر ماوە؟

ئێستاش نموونەکانی تۆمەتبارکردنو بێئینسافو هەڵبژاردنڕەوی (انتقائیە)و هەوڵی خەڵەتاندنی خوێنەر دەخەینە ڕوو کە هەموویان دەنگدانەوەی نووسینەکانی خەڵکانی ترە (لەگەڵ هەندێك لە ئیبداعاتی میسریش) بەپاڵ ((بردن))و نەپاراستنی ئەمانەتی زانستیو تێنەگەیشتن لە نووسینەکانو دیسان هەوڵی خەڵەتاندنی خوێنەر.

## دەرکردن لەسیاقی مێژوویی

یەکەم هەنگاوی ڕەخنەی مەوزووعی لە هەر دیاردەیەك ئەوەیە ئەو دیاردەیە لە سیاقی مێژوویی –ئەگەر باس لە ڕابوردوو بکەین–و سیاقی گشتیی کۆمەڵگەو ڕەوتو ڕووداوەکانی دەرنەکرێت، بۆ نموونە توندوتیژییەك لە ئاستێکی مامناوەندی لەڕوانگەی کۆمەڵگەیەك یان سەردەمێکی توندوتیژ وەکو دیاردەیەکی ئاسایی تەماشا دەکرێت، کۆمەڵگەیەکیش ئاستێکی مامناوەندیی توندوتیژیی هەبێت کۆمەڵگەیەکی شەڕانگێزە لەڕوانگەی کۆمەڵگەیەك توندوتیژی تێیدا لە نزمترین ئاستدا بێت.

سەبارەت بە ڕەوتی ئیسلامی، یان هەر ڕەوتێکی تر، ئەو باسانەی دەورووژێنرێن ڕەچاوی ئەو خاڵی بەراوردییە ناکەنو حساب بۆ ئەو کۆمەڵگەیە ناکەن کە ئەو ڕەوتە تێیدا کار دەکات، ئەگەر باسی مێژووش بکەین، ڕەچاوی ئەو سەردەمە ناکەن کە ئەوڕەوتە تێیدا چالاك بوو.

زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە ڕەوتی ئیسلامی دەگرن مەبەستێکی سیاسی پاڵیان پێوە دەنێت لەبەر ئەوە نەك تەنها ڕەچاوی جیاوازیی کۆمەڵگەکانو سەردەمەکان ناکەن بەڵکو ئەگەر دەرك بەو جیاوازییانەش بکەن بازیان بەسەردا دەدەن. مەبەستی ئەوانە وەك وتبووم ناشیرینکردنی ڕەوتی ئیسلامییەو دوورخستنەوەی جەماوەرو توێژی ڕۆشنبیران لەو ڕەوتە، ڕاستییەکەیانیش بۆ جەهەننەم.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەو ڕەفتارە، واتە دەرکردنی ڕووداوەکان لە سیاقی مێژوویی خۆیان. ئایا میسری هەستی بەو جیاوازیانە کردبوو بەڵام پشتگوێی خستوون ئەویش بۆ بەجێهێنانی مەبەستی خۆی (سووکایەتی کردن بە ڕەوتی ئیسلامی) یان ئەسڵەن هەستی پێنەکردوونو

لەکویێ شتێکی بینیوە جێگەی ڕەخنە بێت هێناویەتیو خستوویەتییە ناو کتێبەکەی؟ هەردوو ڕاستن، لەشوێنێکدا وای کردووەو لە شوێنێکی تردا وای بەسەردا هاتووە

**یەکەم**: میسری ڕووداوەکانی سەر بە ئیخوان جیادەکاتەوە لە ڕووداوە گشتییەکانی میسر. یەکێك لە نموونە زۆرەکانی ئەو جیاکردنەوەو کاری هەڵبژاردنە ئەوەی لاپەڕە (٢٣٤)ـە کە تێیدا باسی ئیخوانی میسر دەکات کە لەنێوان ساڵانی ١٩٤٢–١٩٤٣ پەیوەندیی ئەو کۆمەڵەیە بە حکومەتەوە چەند جار گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبوو و ئیخوان توانیبووی کەڵك لە بارودۆخەکە وەربگرێتو بەهۆی سەپاندنی حوکمی عورفیو قەدەغەکردنی چالاکیی سیاسیی حزبەکانی ترەوە توانی لەسەر حسابی هێزە سیاسییەکانی تر گەشە بکات.

ڕووداوەکان زۆر لەم کلێشەیە وردترن کە لەم کتێبەو کتێبە هاوچەشنەکانیدا دووبارە دەبنەوە. ئەو کتێبەی کە میسری کردوویەتی بە سەرچاوەی خۆی، واتە کتێبی (الاحزاب والحرکات..)ی (دەڕڕاج)و (بارووت)و بەئارەزووی خۆی لێی هەڵبژاردووە باسی سیاقێکی تری ڕووداوەکان دەکات:

ئینگلیز لەو کاتەدا لەسەر سنووری میسر دژ بە ئەڵمانیا شەڕیان دەرکردو وەزعیان لە بەرەدا خراپ بوو، بارودۆخی ئەمنیو سیاسیی میسر داڕووخابوو، ئینگلیز فشاریان خستبووە سەر حکومەتی (حسێن سری پاشا) بۆ سنووردانان بۆ چالاکییەکانی ئیخوان، بەنناش لە قاهیرە گواسترایەوە بەڵام لەژێر فشاری پەرلەمان گەڕێنرایەوە، دوایی لەگەڵ دوو قیادیی تر گیرا، پاشان بەردرا. لەگەڵ داڕووخانی بارودۆخی ئەمنیو سیاسیش تانکەکانی ئینگلیز گەمارۆی کۆشکی پاشای میسریان داو ئەمیان ناچار کرد حکومەتی

(حسێن سری) لابەرێتو پێکهێنانی حکومەتێکی نویێ بە ئەلنەححاس پاشا، سەرۆکی حزبی (ئەلوەفد)، بسپێرێت. ئەو حکومەتە نوێیەش پەرلەمانی هەڵوەشاندەوەو هەڵبژاردنێکی پەرلەمانیی ڕاگەیاندو ئەلبەننا خۆی پاڵاوت بەڵام ئەلنەحداس لەسەر ئەوە ڕازی نەبوو ئەویش لەبەر تیشکی ڤیتۆی ئینگلیز کە نەیاندەویست ئەلبەننا خۆی بپاڵێوێت، ئیخوانیش سازشیان لەسەر ئەوە کرد کە ئەلبەننا خۆی نەپاڵێوێتو لەبەرامبەردا چەند داواکارییەکی ئیخوان بەجێبهێنرێن. دواییش لەناو حکومەتدا ناکۆکییەك دروست بوو سەبارەت بە چۆنێتیی مامەڵە لەگەڵ لایەنە نەیارەکان (کە ئیخوان یەکێك بوو لەو نەیارانە)، پاشانو لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٢ هەموو لقەکانی ئیخوان داخران جگە لە نووسینگەی گشتیی ڕابەرایەتی، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٣ دا بارودۆخ گۆڕاو وەفدێکی حکومی سەردانی نووسینگەکەی کرد. لەنێوان شوباتی ١٩٤٢ و تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ و لەکاتی حکومەتی (ئەلوەفد)دا ئیخوان زۆر گەشەی سەندو بوو بە هێزێکی ملیۆنی (باروت، ل٧٤–٧٧)، ئەمە کورتەی سیاقی ڕووداوەکانە کە لەو کتێبەدا هاتووە، لێرەشدا باسی ئەوە کراوە کە ئیخوان سوودمەند بوون لە وەستانی چالاکیی حزبی بەهۆی سەپاندنی حوکمی عورفییەوە هەروەها بەهۆی وەستانی چالاکیی حزبە مونافسەکەی ئەویش (مصر الفتاة). ئەوە لەگەڵ ئەو دێڕانەی سەرەوەی میسری نووسیونی بەراورد بکە تا بزانی میسری چۆن وێنەکەی شێواندووە.

<u>**دووەم:**</u> میسری دەیەوێت خوێنەر تێبەگەیەنێت کە ئیخوان بەتەنیا سیستەمی تایبەتی هەبووە یان هەبوونی ڕێکخراوێکی نهێنی داهێنانی ئیخوان بووەو هەر ئەوان هەیانبووە، مەبەستیشی دیارە: ئەو دەیەوێت

تۆمەتی تیرۆر بخاتە پاڵ ئیخوان و ئیسلامییەکان بەگشتی. ڕاستییەکەش ئەوەیە کە ئەو جۆرە ڕێکخراوانە نەك تەنها لە حزبەکانی تری میسردا هەبوون بەڵکو ئەوان پێش ئیخوان دایانمەزراندبوون. یەکێك لەو سەرچاوانەی کە میسری لەبارەی ئیخوانەوە سوودی لێوەرگرتوون و کە دیسان کتێبی (الاحزاب والحركات..)ـەو دەبوایە میسری وەکو ئەمانەتی مێژوویی باسی بکردایە، ئاماژە بۆ سیستەمە نهێنییەکانی حزبە میسرییەکان دەکات و دەڵێت یەکەم سیستەمی فیدائی یان نهێنیی تایبەت هی حزبی وەفد بوو کاتی شۆڕشی ١٩١٩ و بۆ کوشتنی سەربازو ئەفسەرە ئینگلیزەکان دامەزرابوو، بەڵام وەفد لەهەمان کاتدا بۆ لێدانی ئەو کەسانە بەکاریهێنابوو کە لێی جیاببوونەوە، بۆیە بەوە تۆمەتبار کرابوو کە هەردوو حەسەن پاشا عەبدولڕازق و ئیسماعیل بەگ زوهدی لە ١٧ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ی کوشتبوو کە سەر بە حزبی ئازادیخوازانی دەستووری بوون کە ئەو حزبە لە حزبی وەفد جیاببووەوە. ساڵی ١٩٣٦ حزبی وەفد ڕێکخراوی کراسە شینەکانی دامەزراند کە نیمچە سەربازی بوو و کاری بەرپەرچدانەوە (ردع)ی سیاسیی دەکردو دەیتوانی گەمارۆی سەرکردە نەیارەکان بدات و تەقەیان لێ بکات. یەکەم کوشتنی سیاسیش پەیوەست بوو بە ڕێکخراوی کراسە سەوزەکان کە سەر بە بزوتنەوەی (مصر الفتاة) بوو و ساڵی ١٩٣٧ هەوڵی کوشتنی ئەلنەحاس پاشای دا کە سەرۆکی حکومەت بوو و سەر بە حزبی وەفد بوو.

لەنێوان ١٩٤٠و ١٩٤٢ چەندین ڕیکخراوی ئیرهابیی نیشتمانپەروەر دامەزران و سەربازو سەربازگەکانی ئینگلیزیان کردە ئامانج، یەکەم ئامێری تایبەتیش لەنیوەی یەکەمی چلەکاندا بوو کە ئامێری تایبەتی ڕێکخراوی

زایۆنیی میسری بوو. ئەو ئامێرەشی هەوڵی تەقاندنەوەی ئەو ئوتێلەی داکە پەیماننامەی جامیعەی عەرەبی ساڵی ١٩٤٤ ی تێدا ئیمزا کرا، هەروەها کوشتنی وەزیری بەریتانیی نیشتەجێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لە نیوەی دووەمی چلەکانیشدا، کە توندوتیژیی سیاسی چڕ ببووەوەو ڕواڵەتەکانی توند بوون وەك خۆپیشاندانو مانگرتنو ئاژاوەگێڕیو کوشتنو تەقاندنەوە، چالاکیی ئامێرە تایبەتە نهێنییەکانی ئیخوانو بزووتنەوەی (مصر الفتاة)و حزبی نیشتمانی دەرکەوتن. ئەو ڕێکخراوانەش هەوڵیان دا تەنزیمی سەربازیی خۆیان لەناو سوپادا دابمەزرێنن یان هەماهەنگی لەگەڵ هەندێك کوتلەی ڕادیکالیی بەسیاسیکراوی سوپا بکەن، ئەوەش تەنانەت حزبی وەفدیشی گرتەوە کە ڕێکخراوی لاوانی خۆی بەناوی (پەیوەندیی وەفدی) هەندێك کاری تەقاندنەوەی ئەنجام دا، هەروەها ڕێکخراوە کۆمۆنیستە سەرەکییە کاریگەرەکە ئەویش بزوتنەوەی دیموکراتی بۆ ئازادبوونی نیشتمانی (حدتو) شانەی سەربازیی لە سوپادا پێکهێنابوو. کتێبەکەی (باروت) دەڵێت: دەکرێت بوترێت کە ساڵانی ١٩٤٦–١٩٤٩ بەرزترین ڕێژەی توندوتیژیی سیاسیی، هی ڕەسمیو ناڕەسمی، هەبوو بەجۆرێك دەتوانرێت ئەو ماوەیە بە ماوەی توندوتیژیی بەردەوام ناوببرێت کە چەندین لایەن تێیدا بەشدار بوون (بڕوانە باروت ل١٢١–١٢٢، بۆ نموونەی تریش بڕوانە ل١٢٣).

بەم شێوەیە ئەو چەند چالاکییەی ئامێری ئیخوان دژی ئینگلیزو پیاوانی حکومەت کاری تایبەتی ئەوان نەبووە، بەڵکو بە حوکمی ئەوەی پاش هەندێك لەو حزبانە دامەزرابوو درەنگتر ئەو کارەی کردبوو چونکە یەکەم کوشتنی سیاسیی ئامێرەکەی ئیخوان ساڵی ١٩٤٥ بوو (واتە هەشت ساڵ دوای یەکەم کوشتنی سیاسی لە میسر)، ئەو کەسەش کە ئەنجامی دابوو

خۆی وەکو ئەندامی لیژنەی باڵای حزبی نیشتمانی ناساندبوو نەك وەکو ئەندامی ئیخوان، ئەو کارەش تۆڵە بوو لە کوژراوەکە، سەرۆکی حکومەت ئەحمەد ماهر پاشا، چونکە ساختەکاریی لە هەڵبژاردنەکان کردبوو و پاڵێوراوانی ئیخوانی لە هەڵبژاردن دوورخستبووەوەو بەئاشکرایی دژایەتیی ئیخوانی دەکرد(بڕوانە باروت، ل١٢٤).

ئەمانە هیچیان لای میسری گرنگ نین چونکە میسری تەنها ئەو ڕووداوو قسانە هەڵدەبژێرێت کە تۆمەتبارکردنی ئیخوانیان تێدایە. میسری باسی تێکچوونی باری نێوان ئیخوانو حکومەت دەکاتو دەڵێت کە نائومێدیو گۆشگیری پاڵیان بە بەنناوە نا پەنا بۆ شێوازە دێرینەکەی ڕووبەڕووبوونەوە بەرێت ((شێوازێك کە هەر خۆی داهێنەرو بنیاتنەری بووە))، ئینجا باسی کوشتنی سەرۆك حکومەت (ئەلنەقراشی) دەکات. میسری بەردەوام دەبێت لەسەر پشتگوێخستنی ڕاستییەکانو دەڵێت کە حکومەت لەو ماوەیەدا ئامادەی وتوێژ بوو(ل٢٦٢)، بەڵام چۆن؟ باروت، کە وەك وتم سەرچاوەیەکی میسرییەو لێرەدا ناوی دەبات، باسی ئەوە دەکات کە پاش کوژرانی ئەلنەقراشی جێگرەکەی، ئیبراهیم عەبدولهادی، ئامێری توندوتیژیی بۆ بەرزترین پلە دژی ئیخوان خستە گەڕو چوار هەزار ئەندامی گرتو ئەو ئەشکەنجە دڕندەی کە لەگەڵیاندا پیادەی کردبوو وڵاتی میسر تا ئەوکاتە لە مێژووی نوێیدا نەیبینیبوو و خۆی سەرپەرشتیی ئەشکەنجەدانی دەکرد، فەتواشی بە موفتیی میسر دەرکرد کە ئەندامێتیی ئیخوان حەرامە هەروەها بەیاننامەی بە دەستەی گەورەی زانایانو شێخی ئەزهەر بۆ هەمان مەبەست دەرکرد. ئەو ئەشکەنجەیە خێزانو خزمانی بەندکراوەکانیشی گرتبووەوە بەجۆرێك ڕای گشتی، بە لیبرالییەکانیشەوە، لەگەڵ گیراوەکاندا هاوسۆز

بوو(باروووت، ل١٤٠). هاوکاتی ئەو کارانە حکومەت نیازی وتوتێژی دەربڕی.. باروووت ئەو نیازە بە ئیددیعا ناو دەبات.

بەم جۆرە میسری بۆ مەبەستەکەی خۆی مێژوو دەشێوێنێتو حکومەت وەکو قوربانییەکی ((تیرۆر)) نیشان دەدات، بەتایبەت ئەگەر باسی ئەوەی عەبدولهادی بکەین کە ئیخوان ((تەنها دوای لابردنی ئەو حکومەتە هەناسەی دا، ئەو حکومەتەی ناوی پەیوەست بوو بە سەختترین توندوتیژیی دەوڵەتو تۆقاندنی نەیارەکانی – باروووت ل١٤٢)). با قسەکەی میسریمان سەبارەت بە کوشتنی نەیاران لەبیر نەچێت کە دەڵێت شێوازێك بوو بەننا خۆی داهێنەرو بنیاتنەری بوو! خەڵەتاندنی خوێنەر دەگاتە ئەم ئاستە!

**سێیەم:** میسری دەڵێت کە ئیخوان نەیدەتوانی لە کێشەی بێ بەرنامەیی ڕزگاری بێت، بۆ نموونە: ((لەجیاتی ئەوەی ببێتە هاوپەیمانی هێزە دیموکراتخوازەکانو لایەنێك بۆ پاراستنی یەکێتیی ڕیزەکانی گەل، لە مەوقعی ڕژێمی دەسەڵاتدارەوە سەنگەری لە هێزەکانی بەرەی میللەت دەگرتو لەسەر زەمینەی واقیع سیاسەتی داگیرکەرانی وڵاتی پیادە دەکرد)) ئینجا دەڵێت: ((ئیخوان دڵنیا بوو لەوەی کە ئەگەر ببێتە هاوپەیمانی حزبە عەلمانییەکان دەبێ پەیڕەوی پرەنسیپەکانی دیموکراسیەت بکا، ڕێز لە دەستوور بگرێ)) (ل٢٥٣).

پێویستمان تەنها بەوەیە جارێکی تر ڕووداوەکانی سەرەوە بخوێنینەوە بۆ ئەوەی تێر پێکەنین بەو قسانەی میسریو بەو زاراوەو تەعبیرانەی بەکاریان دەهێنێت: سەنگەرگرتن لە هێزەکانی بەرەی میللەت.. پەیڕەوی پرەنسیپەکانی دیموکراسیەت.. وێنەیەکی کاریکاتێرییە بۆ سەردەمێك هەمووان تێیدا بەشێوەیەکی نیمچە سەربازی بیروڕەفتاریان دەکرد.

## تێنەگەشتنە لە نووسینەکان یان تەزویرکردنیانە یان قسەکردنە بەئارەزوو؟

ئەمەش چەند نموونەیەکی دیکەی مامەڵەی میسرین لەگەڵ سەرچاوەو زانیارییەکانیان:

**یەکەم:** میسری دەگاتە سەر کتێبێکی (هەیکەل)و قسەیەکی دەهێنێتەوە کە ڕێك پێچەوانەی ئەو قسەیەیە کە لەو کتێبەدا هاتووە، هەیکەل باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیخوان لەشاری ئیسماعیلیە دەکاتو دەڵێت ڕەنگە حەسەن ئەلبەننا موعارەزەیەکی بەدی کردبێت چونکە شارێکی نیمچە ئەورووپی بوو،[1] هیچیش لەبارەی باری کۆمەڵایەتییەوە ناڵێت. میسری قسەکەی هەیکەل تەواو هەڵدەگێڕێتەوەو دەنووسێت: شارەکە ئەو کاتە بەهۆی کۆمپانیای (کەناڵی سویس)ـەوە پڕ بوو لە کارمەندی ئینگلیز، خۆشگوزەرانیی کارمەندو فەرمانبەرە بیانییەکانو ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتییەی دانیشتوانی ناوچەکە بە چاوی خۆیان دەیانبینی فاکتەرێکی بەهێز بوونو ڕێگایان لەبەردەم ئەلبەننادا ئاسان کرد ژمارەیەکی باش لە دانیشتوانی ئەو شارە بە بیروباوەڕی خۆی ئاشنا بکا (ل٢٠٤). ئینجا ئەمە یەکێکە لە دوو حاڵەت: یان ئەوەیە هەڵگێڕانەوەی قسەکە ئیبداعێکی تری میسرییە یانیش ئەوەیە(باوەڕیشم بەمیان زیاتر هەیە) ئەو قسەیەی لەسەرچاوەیەکی تر (با بڵێین أ) وەرگرتووە کە تێیدا ناوی کتێبەکەی هەیکەل وەکو سەرچاوە نووسراوە. بێگومان کە ئەو کتێبەی هەیکەلی بەکارنەهێناوەو ((بردوویەتی)) نەشیزانیوە کە نووسەری (أ) بەهەڵە قسەکەی هەیکەلی وەرگرتووە.

---

[1] محمد حسنین هیکل، خریف الغضب، ل ٢٨٧، میسری نووسیویەتی ل٢٧٨.

**دووەم:** میسری لەبەرئەوەی کاری ((بردن))ی کردووە تەنانەت نەیزانیوە خۆیشی چی دەڵێت ئەوەتا پاش ئەو قسەیەو لەیەك لاپەڕەدا دوو شتی دژبە یەك دەنووسێت. سەرەتا دەڵێت ئەلبەننا لەسەرخۆو بەنهێنی دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی بیروڕای خۆی(ل٢٠٤) کەچی دوای پێنج دێڕ دەڵێت کە ناوبراو لە مزگەوت و لەناو خوێندنگاو کاتی وانەوتنەوەو لەکۆڕو کۆمەڵی گشتیو تایبەتیدا بیروڕای بۆ خەڵکی باس دەکردو بانگهێشتی دەکردن پەیوەندی بە بزوتنەوەکەیەوە بکەن (ل٢٠٤) ئینجا ئەگەر ئەوە بانگەوازی نهێنی بێت ئەی بانگەوازی ئاشکرا چییە؟

تێگەیشتنی هەڵە دەچێتە پاڵ تێنەگەیشتن. باروت باسی ئەلبەننا دەکات کە نەیویست ئەو نەواتە تازە پەیدابووە ناوێکی تەنزیمە هەڵبگرێت بۆیە ناوەکەی کرد بە برایانی موسڵمان(ل٤٧) کەچی میسری دەڵێت ئەلبەننا لەو قۆناغەدا نەیدەویست هیچ ناوێك لە ڕێکخراوەکەی بنێت(ل٢٠٥).. هیچ ناوێك؟! ئەی (الاخوان المسلمون) چییە؟

**سێیەم:** تێگەیشتنی هەڵەش هاوشانی نیازی خراپ دەڕوات؛ باروت باسی قەرزەکانی بازرگانەکانی ناوچەکە دەکات کە ئەو کاتە یارمەتیی ئیخوانیان دەدا بۆ دروستکردنی خانەیەکی ئیخوانو مزگەوتێك پاشان دوو قوتابخانە؛ یەکێکیان بۆ کوڕانو ئەوەی تر بۆ کچان، ئینجا باسی کۆمەکی کۆمپانیای ئینگلیزیی کەناڵی سویس کە ٥٠٠ جونەیهی میسریی بوو کە بەهۆیەوە بارەگاکەو مزگەوتەکەی پێ تەواو کرا(ل٤٨) کەچی میسری قەرزەکان وەکو یارمەتی باس دەکاتو ئەو تاکە یارمەتییەی کۆمپانیاکە لەگەڵ ئەو چەند یارمەتییە تێکەڵ بکات: ماوەی چوار ساڵدا (١٩٢٨-١٩٣٢) ئیخوان توانی ((لەڕێگای ئەو کۆمەكو یارمەتییانەوە کە بازرگانەکانی

ناوچەکەو کۆمپانیای کەناڵی سویسی ئینگلیزی پێیان بەخشیوە بارەگایەکو مزگەوتێك بنیاد بنێ))(ل٢٠٥)[٢].

نیازەکە جگە لەو گشتکردنە لە شتی تریشدا دەردەکەوێت: میسری باسی ئەوە دەکات کە بەننا دژی ڕەخنەگران، کە چۆن پارە لە کافران وەردەگرێت بۆ دروستکردنی مزگەوت، نەیشاردۆتەوە کە پارەکەی وەرگرتووەو پاشان دەڵێت تاکە پاساو بۆ ئەوە عەقڵیەتو هەڵوێستی پراگماتیی ئەو کەسەیە کە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی سڵ لە هیچ ڕێگـاو شـێوازێك نەکاتەوە(ل٢٠٥—٢٠٦).. ئەمەیە مەبەستی میسری، بەڵام بارووت وەڵامی بەننا دەهێنێتەوەو میسری ئەو وەڵامەی نەنووسیوە ئەویش کە ڕەخنەگران پەنا بۆ فیقهێکی لار دەبەن چونکە پارەی کۆمپانیاکە بریتییە لە پارەی میسرییەکان کە ئەوانە دەستیان بەسەردا گرتووە ئینجا بارووت دەڵێت کە ژیانی کورتی داهاتووی بەننا سەلماندی چەند لەڕووی سیاسییەوە زۆرزان بووەو شارەزاییە پراگماتییەکەی سەرسوڕهێنەر بوو و لەو مەسەلەیەدا مەبەستی نەك تەنها یارمەتیی کۆمپانیاکە بووە بەڵکو مەبەستی بوو سەری لێ بشێوێنێت کە گوایە کۆمەڵەکە ئایینییەو هیچ ئامانجێکی سیاسیی دژ بە ئینگلیز نییە، بەننا لێرەدا بەپێی قەبارەی ڕاستەقینەی خۆی مامەڵەی دەکرد نەك بەپێی ئامانجەکانی (بارووت٤٨—٤٩). بەکورتی بارووت باسی لێهاتوویی سیاسیی بەننا دەکات بەڵام نیازەکەی میسری ئەو لێهاتووییە

---

[2] میسری دەڵێت ئەمە لە نێوان (١٩٢٨—١٩٣٢) بوو، واتە دروستکردنی بارەگایەكو مزگەوتێك چوار ساڵی برد! خەتاکەش هی تێگەیشتنە چونکە بارووت لەسەرەتادا باسی ئەو ساڵانە وەکو قۆناغی دامەزراندنی کۆمەڵەکە دەکات نەك ماوەی دروستکردنی بارەگاو مزگەوتو دوو قوتابخانەکە.

دەکاتە سڵنەکردنەوە لە گرتنەبەری هەر ڕێگایەك[٣].

**چوارەم:** میسری وەك کەسێك ئیسلامییەکانی پێ قبووڵ نییە دەرفەت دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ((بیسەلمێنێت)) کە ئاواتەکانی بیری ئیسلامی خەیاڵن، ئەوەتا ئەو قسەیەی ئەلبەننا لە قۆناغێکی دیاریکراوی کارەکەیدا دەهێنێتەوە کە بە وتەی میسری: ((گەیشتۆتە باوەڕێك کە هەوڵدان بۆ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی خیلافەت خەو و خەیاڵەو مەحاڵە لەسەر زەمینەی واقع جێبەجێ ببێ –ل٢٣٦)).

سەربارى ئەوەی میسری ناوی ئەو سەرچاوەیە ((دەبات)) کە ئەو قسەیەی تێدا هاتووە، ئەویش کتێبەکەی میچڵ سەبارەت بە ئیخوان کە خۆیو زانیارییەکانی لە کتێبەکەی بارووت ((بردوویەتی))، ئەو قسەیە بەو جۆرە نییە چونکە وەك لە باروتدا باسکراوە، کە ئاماژە بۆ کتێبەکەی میچڵ دەکات، ئەلبەننا نەیوتووە دامەزراندنەوەی دەوڵەتی خیلافەت خەیاڵەو مەحاڵە بەڵکو ئەوە باسێکی نادیارەو ئامانجێکە دەکەوێتە دواڕۆژێکی دوور بۆیە باسکردنی بۆ ئێستا باسێکی بێواتا دەبێت (باروت، ل ١٤٩، پەراوێز ١٥٥).

**پێنجەم:** میسری سەربارى ((بردنی)) سەرچاوە جارێکی تر دەیسەلمێنێت کە لە باسەکانی تێناگات جگەلەوەی کە بەئارەزووش مامەڵە لەگەڵ زانیارییەکاندا دەکات. (باروت) باسی کۆمپانیای ئیخوان دەکات کە دەرگای بەشداریکردن تێیدا بە پشك (سەهم)ی بۆ غەیری ئەندامانی ئیخوان کردەوە.. تاد(باروت، ل٩١)، بەڵام میسری کە لەوە تێنەگەشتووە وا

[٣] هەمووو وەرگرتنەکە لە باروتەوە بوو بەڵام میسری ناوی نابات و لەجیاتی ئەوە ئاماژە بۆ مذكرات الدعوة والداعية.... ل١٢٧ –١٢٨ و رسائل الإمام الشهيد (ل٦٦) دەکات.

دەزانێت ئەو کارەی بە پشك دەکرێت بریتییە لە سووخواردن (ڕیبا) بۆیە توانج دەگرێتە ئیخوانو بەننا کە سووخواردنیان حەڵاڵ کردووە کە قورئان حەرامی کردووە(میسری، ل٢٤٠). بەپاڵ ئەوەشەوە میسری ((کردنەوەی بەشداری بۆ غەیری ئیخوان)) دەکاتە کردنەوەی بەشداری بۆ غەیری موسڵمانان. پێش ئەمەشو لەباسی کاروباری ئابووری میسری ئاماژە بۆ کتێبەکەی بەننا دەکات (مذكرات الدعوة والداعية) کە لەڕاستیدا ئەو سێ زانیارییانەی نەقڵی کردوون بەهەمان تەرتیب لەهەمان ئەو لاپەڕەیەی کتێبەکەی (باروت)دا هەنو لەجیاتی ناوبردنی ئەو کتێبە ناوی کتێبەکەی بەننای نووسیوە تا لیستی سەرچاوەکانی قەربالْغ بکات. بەپاڵ ئەم ((بردن))ـانەش میسری قسەیەکی بەننا بەئارەزووی خۆی نەقڵ دەکات. بەننا باسی ئەوەی کردووە کە نابێت تێکەڵی لەنێوان چالاکیی بانگخوازیو چالاکیی ئابووری بکرێتو کاروبارەکانی کۆمپانیاکە بەناوی ئیخوانەوە نەبێت بەڵکو بەپێی نیزامێکی ماددیی ئابووری کە هیچ سۆز یان کەمتەرخەمییەکی تێدا نەبێت(باروت، ل٩١) کە ئەمە نیشانەی کارکردنێکی عەقڵانییە لەبواری ئابووریدا، کەچی میسری ڕستەی دوایی وا دەنووسێت: ((..و گوێ بۆ هیچ شتێکی تر نەگرێ)).. کام شت؟ ئینجا میسری ئەو باسەی بەننا دەکاتە ((بەڵگە)) لەسەر ئەوەی بەننا ویستبووی خۆی لە حەڵاڵو حەرام قوتار بکات!

**شەشەم: ئەمەیان تەزویرکردنە:** (باروت) باسی پشك (سەهم)ـەکانی ئەلبەننا لە کۆمپانیاکانی ئیخوان دەکاتو دەڵێت ئەلبەننا لە زۆربەی ئەو کۆمپانیایانە بەشداریکردووە بەڵام بەپێی یاسا تەنها چەند پشکێکی کەمی هەبوو. سەد جونەیهی هەبوو وەك قەرەبووی مانگانە بەرامبەر بەوەی کە

سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیای ڕۆژنامەنووسی، سەد جونەیهی تریشی هەبوو بۆ سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی کۆمپانیای چاپەمەنی بەڵام هیچ لەو پارەیەی وەرنەدەگرتو مەبەستی بوو وەکو خۆبەخش دەربکەوێت(باروود، ل٩٢)، کەچی میسری بەئارەزووی خۆی ئەو زانیارییە سەقەت دەکاتو دەڵێت: ((خودی ڕێبەریش ئەگەر چی بەپێی یاسا تەنها خاوەنی چەند شەیرێك بووەو مانگانەیەکی ٢٠٠ جونەیهی بۆ بڕاوەتەوە، بەڵام نەیهێشتووەوە سەروەتو سامانی پێوە دیار بیٚو تەنانەت مووچەکەیشی وەرنەگرتووەو وەك کەسێکی خۆبەخش خۆی نیشان داوە)). میسری ئەوە دەنووسێت بە ویژدانێکی ئاسوودەوە ناوی کتێبەکەی (باروود) وەك سەرچاوە دەنووسێت.

میسری بەهەمان ویژدانەوە زانیارییەکی تر وەردەگرێت: ڕۆژنامەگەریی حزبی وەفد کە لەو کاتەدا لەگەڵ ئیخواندا ناکۆك بوو بەڵگەنامە بڵاودەکاتەوە سەبارەت بە سامانەکانی بەنناو بەشداریکردنی بە هەزاران جونەیھ لەو کۆمپانیایانەو هەزاران جونەیهی لە حکومەت وەرگرتووە(باروود، ل٩٢). ئەو تۆمەتە کە ڕۆژنامەگەریی حزبێك دەیخاتە پاڵ نەیارەکەی لای میسری دەبێتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرو دەڵێت کە بەننا ((دەرکەوت)) خاوەنی هەزاران جونەیھو سەدان شەیر (سەهم)ی کۆمپانیاو پرۆژە ئابوورییەکانە(میسری، ل٢٤١). زانیشمان کە ڕۆژنامەگەریی حزبی وەفد خۆی ئەو زانیارییانەی بڵاوکردبووەوە کەچی میسری دەڵێت: ڕۆژنامەکانی حزبی وەفد ئەم مەسەلەیە دەقۆزنەوەو بە بەڵگەو دەلیلو دیکۆمێنتەوە (بڕوانە چۆن میسری سێ وشە بەکاردەهێنێت بۆ وشەی بەڵگەنامە تا کاری قسەکردنەکەی گەورەتر بێت/ف.ق) سەلماندیان کە هەزاران جونەیھ کۆمەکو

یارمەتیی لە حکومەت وەرگرتووە.

ئینجا تەزویر کردن دەگاتە لوتکە. (باروت) باسی ئەو عەرزەی باڵیۆزخانەی ئینگلیزی دەکات کە چل هەزار دۆلارو سەیارەیەك بداتە ئیخوان تا چالاکیی سیاسی دژی پرۆپاگندەکانی ئەڵمانیاو هاوپەیمانانی بنوێنێت، ئەندامانی بزوتنەوەی (مصر الفتاة) باوەڕیان وابوو ئیخوان ئەو پارەیەی وەرگرتبوو، بەڵام (میچڵ) دەڵێت کە ((شت نییە هێندەی ئەوە لەڕاستییەوە دوور بێت)) [٤] (ل٩٣). میسری نەك تەنها ناوی کتێبەکەی (میچڵ) لە باروت ((دەبات))و دەیکاتە حەڵاڵی خۆی بەڵکو زانیارییەکەش هەڵدەگێڕێتەوەو دەنووسێت کە باڵیۆزخانەکە ئەو پارەیەو ئەو سەیارەیەی بە ئیخوان دابوو، ئینجا ناوی کتێبەکەی (میچڵ) وەکو سەرچاوە دەنووسێت.

## مرۆڤیش ئەوە کاری بێت خۆشی نازانێت چیی نووسیوە

دووبارەشی دەکەمەوە کە ئەوەی وەکو میسری پیشەی بێت خۆشی نازانێت چی دەنووسێت، ئەوەتا میسری لە یەك لاپەڕەدا دوو شتی دژ بە یەك دەڵێت. ئەو لە لاپەڕە ٢٨٠دا دەنووسێت: ڕاستە عەبدولناصر دەیویستو مەبەستی بووە سنوورێك بۆ دامەزراوەی ئاینیی دابنێ، بەڵام هەرگیز باوەڕی بە جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت نەبوو. میسری دوای شەش دێڕ دەنووسێت کە بەپێی تێگەیشتنی عەبدولناصر ئاین پەیوەندییەکە لەنێوان خواوەندو ئادەمیزاددا لەبەر ئەوە ئاینی نەکردە بناغەی دەسەڵات.

[4] میچڵ ئەمەریکییە و نووسەری کتێبی (ئیخوانی موسلمین)ـە. باروت پاش ئەوە دەڵێت سەرچاوە ئیخوانییەکان ئەوە دووبارە دەکەنەوەو چەوساندنەوەی ئیخوانو گرتنی ڕابەرەکەیو یارمەتیدەرانی دەگەڕێننەوە بۆ قبووڵنەکردنی ئەو بەرتیلەی ئینگلیز.

## پەیوەندیی نێوان ئیخوان و كۆمۆنیستەكان

میسری (ل٢٥٩) ئەو تۆمەتانە دەژمێرێت كە ساڵی ١٩٤٨ ئاڕاستەی ئیخوان كرابوون و لەوانە سێ تۆمەت نانووسێت كە دوانیان بریتین لە سووتاندنی موڵكەكانی یەكێك لە مەللاكەكان و هاندانی جووتیاران بۆ زیادكردنی كرێكانیان (بڕوانە باروت، ل١٣٧). بێگومان بۆ ئەوەی میسری لەگەڵ خودی خۆیدا ناڕێك نەبێت پێویستە ئەو دوو تۆمەتە لەلای تۆمەت نەبن بەڵكو سەروەری چونكە هەمان ئەو كارەن كە بزوتنـەوە سۆشیالیستەكان، بەتایبەتی كۆمۆنیستەكان، دەیكەن، هەر لەبەر ئەوەشە زانی كە ناوبردنی ئەو دوو تۆمەتە زیانی پێدەگەیەنێت. میسری بێگومان باسی بڕیاری ئەو قازییەش ناكات كە قەزییەی (سەیارەی جێبەكە) كەوتبووە ئەستۆی كە بریتی بوو لە بێتاوانكردنی بەننا: ((هەندێك لە ئەندامانی كۆمەڵەكە هاوسەنگیی خۆیان لەدەست دابوو و لەو ڕێگەیە لایان دابوو كە سەركردەكانی كۆمەڵەكە گرتبوویانە بەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكانیان))(باروت، ل١٣٥). میسری لەجیاتی ئەوەو بۆ ئەو مەبەستەی كە ئێستا خوێنەر شارەزای بووە خودی بەننا تاوانبار دەكات.[5]

تێبینیی تر: میسری ئەو تێبینییەی لە كتێبەكەی باروتدا هەیە، كە سەرچاوەیەكی سەرەكییەتی لەبارەی ئیخوانەوە، پشتگوێ دەخات. باروت باسی ساڵی ١٩٥١ كە دەكاتە كاتی ڕابەری دووەمی ئیخوان، ئەلهوزەیبی، دەكات. لەو ساڵەدا تەوژمێكی ڕادیكالی لە ئیخواندا سەریهەڵدا وێنە

---

[5] هەرچەندە میسری ناوی كتێبەكەی باروت وەك سەرچاوە نانووسێت بەڵام ئاشكرایە كە ئەو كتێبە سەرچاوەیەكێتیو ئەو كە ناوی كتێبەكەی میچڵ دەنووسێت لە كتێبەكەی باروت ((بردوویەتی)).

تەقلیدییەکەی گۆڕی لە بزوتنەوەیەکی دژ بە کۆمۆنیزم بۆ بزوتنەوەیەك ((بالە پێشکەوتنخوازەکەی)) بەڕاشکاوی تەئکید لەسەر هاوکاریی ئەوانو کۆمۆنیستەکان دژی ئیستعمار دەکات(بڕوانە ل١٥٨)، ئەوەش بۆ میسری کە جارجار خۆی وەکو کۆمۆنیستێك پیشان دەدات گرنگ نییە، بەڵام ڕاستمان بوێت ئێمە نازانین ئایا ئەوە لای میسری گرنگ نییە یان ئەو پیشتگوێخستنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی میسری دەربەست نەبووە بەوردی سەرچاوەکانی بخوێنێتەوەو تەنها مەبەستی ئەوە بووە کتێبێك بنووسێت بیگەیەنێتە ئامانجەکانی.

میسری لەبارەی ئەو تەوژمەی سەرەوە جگەلە بێدەنگی بەشێوەیەکی تر باسی دەکات. ئەو دەڵێت کە ڕابەری ئیخوان بارودۆخەکەی وەکو ئەوەی مەککە دەبینی کە پێغەمبەر بەهێمنی بانگەوازی دەکرد بەڵام ئەو سیاسەتەی بۆ نەچووە سەر ((چونکە ئەندامانی ئیخوان لەمێژ بوو گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە بانگهێشتن بەبێ توندوتیژیو زەبروزەنگ سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ))(ل٢٦٧–٢٦٨).

تەماشا میسری چۆن وشەکان بەکار دەهێنێت: باسی ((تەوژمێکی ڕادیکالی))ی ئیخوان لای خەڵکی تر لای ئەو دەبێتە خواستی ئەندامانی ئیخوان (هەموو ئیخوان) بۆ گەیشتن بەئامانج لەڕێگەی توندوتیژییەوە.

تێبینییەکی تر سەبارەت بەو تەوژمە ڕادیکالییە: بەرگریی سەید قوتب لە کۆمۆنیستەکانو داواکردنی بەردانیانو وەك خۆی دەیوت: چونکە ئەوانیش هەر دژایەتیی ستەمکارییان دەکرد..و چونکە ئەوان لەو شەریفانەن کە پێویستە بە بۆچوونو بەڵگە وەڵامیان بدەینەوەو بە ئاگرو ئاسن پێشوازییان لێ نەکەین(باروووت، ل١٧٠).

میسری باسی ڕووداوێك بەئارەزووی خۆی نەقڵ دەكات. لەو سەرچاوەیەی ناوی بردووە باسی ساڵیادی شەهیدانی زانكۆ لە شەڕی كەناڵی سوێس كراوە كە ساڵی ١٩٥٤ (كاتی عەبدولناصڕ) قوتابییانی ئیخوان بە هەماهەنگی لەگەڵ قوتابیانی كۆمۆنیست سازیان دابوو، لەكاتی ئاهەنگەكەدا سەیارەیەكی جێبی سەربازی بڵندگۆی هەڵگرتبوو دێت كە سەر بە ڕێكخراوی لاوانی (دەستەی ڕزگاریكردن)ی حكومی بووە. هاوارەكانی بڵندگۆكە وەكو تێكدانی ئاهەنگەكە تەماشا كرا بەتایبەت كە دەستەكە قوتابیانی قوتابخانەیەكی ناوەندی كە سەر بەون لەدەرەوەی زانكۆ كۆكردبووەوە وەك ئامادەباشییەك بۆ پێكاچوون، ئەو پێكاچوونە ڕووی داو دەیان برینداری لێكەوتەوەو سەیارەكە سووتێندرا، لە ئاكامی ئەوەش ئەنجوومەنی سەركردایەتیی شۆڕش بڕیاری دا ئیخوان هەڵبوەشێنرێتەوە، ژمارەیەكیش ئەندامی ئیخوان بە ڕابەرەوە گیران(باروت، ل١٨٤-١٨٥).

بەواتایەكی تر حكومەتی ئەفسەرەكان خۆی ئاهەنگەكەی تێكدابوو و خۆی بۆ شەڕەكە ئامادەكردبوو، كە شەڕەكەش كرا ئەوەی كردە بەهانە بۆ هەڵوەشاندنی نەیارەكەی، ئەمەش كارێكە دەسەڵاتدارە دیكتاتۆریو ستەمكارەكان پەنای بۆ دەبەن بەتایبەتی سەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵات، واتە ئەو كاتەی نەیارەكان خاوەنی جەماوەر بنو ئەوان هێشتا لەسەرەتادان.

میسری كە سوودی لەو سەرچاوەیە وەرگرتووە زانیارییەكان وا نەقڵ دەكات، یان ڕاستتر بەم شێوەیە دەیانشێوێنێت، ئەو نووسیویەتی: سەرەتای یەنایەری ١٩٥٤ (سەرەتا نەبوو بەڵكو ١٢ی مانگەكە بوو) خوێندكارانی ئیخوان (بڕوانە لێرەدا ناوی كۆمۆنیستەكانی نەبردووە) بڕیار

دەدەن یادی ساڵوەگەڕی شەهیدانی کەناڵ بکەنەوە، لەو بۆنەیەدا لەگەڵ ڕێکخراوی لاوانی سەر بە دەستەی ڕزگاری بەیەکدا هەڵدەپڕژێن (بڕوانە باسی ئیستفزازی سەیارەی جێبەکەو خڕکردنەوەی قوتابیانی ناوەندی لەدەرەوەی حەرەمی زانکۆ ناکات)، چەند کەس بەخەستی زامدار دەبن. ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ئەو ڕووداوە دەقۆزێتەوەو بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان دەردەکات(ل٢٧٦). بینیمان ئەفسەرەکان ڕووداوەکەیان نەقۆزتەوە، ئەوان نەخشەیان بۆ داڕشتبوو.

## جوانکردنی دیکتاتۆر

وتمان یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی میسری لەبارەی ئیخوانەوە کتێبەکەی باررووتە. لەو کتێبەدا باسی پەیماننامەی چوونەدەرەوەی بەریتانیا لە کەناڵی سویس کراوە کە ئیخوان لەدژی وەستا چونکە ڕابەری ئیخوان، ئەلهوزەیبی، چەند ڕەخنەیەکی لێگرتبوو کە پوختەکەیان ئەوەیە داگیرکردنە سەربازییەکە دەبێتە داگیرکردنی مەدەنی کە ڕەنگە دوای ئەو ساڵانە درێژبێتەوە. ڕێککەوتنەکە پاش حەوت ساڵ دەکەوێتە کارو دوای ئەوە میسر ڕاوێژ بە ئینگلتەرا بکات، ئەمەش شێوە هاوپەیمانییەك یان پەیوەندییەکە لەگەڵ بەریتانیا، بەریتانیاش بەپێی بڕگەی چوارەم مافی گەڕانەوەی بۆ کەناڵەکە هەیە ئەگەر میسر یان هەر دەوڵەتێکی عەرەبی یان تورکیا تووشی هێرش بوون ئەویش بێ پرسکردن بە میسر..تاد. ئەلهوزەیبی وتی کە نابێت هیچ ڕێککەوتنێك لەگەڵ دەوڵەتێکی بێگانە پەسەند بکرێت بێئەوەی بخرێتە بەردەم پەرلمانێك کە بەشێوەیەکی دروستو ئازادانە هەڵبژێردرابێت، هەروەها پێویستە ڕەقابە لەسەر ڕۆژنامەگەری لاببرێت بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەئازادی ڕای خۆی بڵێت. وەنەبێت تەنها ئیخوان

ئیدانەی ڕێککەوتنەکەی کردبێت بەڵکو لە وڵاتە عەرەبییەکانیشدا بەتوندی هێرشی کرایە سەرو خۆپیشاندان سازدران، ڕۆژنامەگەریی قەومیش ئەو ڕێککەوتنەی بە فرۆشتنی میسر بە ئیمپریالیستەکان وەسف کرد(باروت، ل١٩٢-١٩٣).

میسری دەبێتە پارێزەری عەبدولناصرو دەڵێت کە سەرکردایەتیی شۆڕش لەو باوەڕەدا بوو کە ئیخوان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازی لەم هەنگاوە دەکات، بەڵکو لەهەموو لایەنە سیاسییەکانی تر زیاتر پەرۆشی چوونە دەرەوەی هێزەکانی بەریتانیا بێت، بەڵام واقیع بەجۆرێکی تر بوو.. تاد(میسری، ل٢٧٧)، دوایی دەڵێت کە ڕابەر دەیویست پێگەی ئیخوان لەناو جەماوەردا پتەوتر بکاو لەلایەکی تر تۆمەتی ناپاکیو خیانەت بخاتە ئەستۆی عەبدولناصرو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو بەدناویان بکات، دیارە ڕژێمیش نەیدەتوانی لەم هەڵوێستەی ئیخوان بێدەنگ بێ(ل٢٧٧).

میسری کاتێك باسی هەوڵی کوشتنی عەبدولناصر دەکات لەخۆیەوە قسە دەکات. میسری دەڵێت عەبدولناصر ببووە ڕەمزی خەباتی نەتەوەییو نیشتمانیو خەڵك بە پێشڕەو و سەرکردەی خەباتی ڕزگاریخوازانەی خۆیانیان دەزانی(ل٢٧٨).

میسری زیاترو زیاتر نەزانیی خۆی سەبارەت بە ڕووداوەکانی میسری ئەو کاتە دەسەلمێنێت کاتێك دەڵێت ئیخوان سوور بوو لەسەر دژایەتیکردنی دەسەڵاتی نوێ بەتایبەتی کە دەیبینی ئەو دەسەڵاتە ڕووی کردبووە یەکێتیی سۆڤییێت، ڕۆژئاواش دوژمنایەتیی دەکات، لەناوخۆشدا ناسیۆنالیستو دیموکراتیخوازەکان لێی نزیك دەبنەوەو پشتگیری لە سیاسەتەکانی دەکەن(ل٢٧٨). ڕاستەکەش ئەوەیە عەبدولناصر تا ئەوکاتە،

ئێمەش باسی ساڵی ١٩٥٤ دەکەین، ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ سۆڤییێتدا نەبوو بەڵکو پەیوەندییەکەی دوای ئەوە بوو کە ئەمەریکا ڕازی نەبوو قەرز بدرێتە میسر بۆ دروستکردنی (بەنداوی بەرز–السد العالی). پێش ئەو کاتە پەیوەندیی عەبدولناصر لەگەڵ ئەمەریکادا خراپ نەبوو، کاتێکیش بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل ساڵی ١٩٥٦ سێقۆڵی هێرشیان کردە سەر میسر پاش خۆماڵیکردنی کەناڵی سوێس بە هەڕەشەی یەکێتیی سۆڤییێتو فشاری سەرۆکی ئەمەریکا هێرشەکە ڕاگیرا، تەنانەت قسە هەیە کە ئەفسەرەکان بە پشتیوانیی ئەمەریکا کۆدێتاکەیان دژی ڕژێمی پاشایەتی کرد چونکە ئەمەریکا ویستی جێگەی بەریتانیا لە میسردا بگرێتەوە.

خۆ ئەگەر میسری ئەو مێژووە نەزانێت، هەقیشێتی نەیزانێت چونکە زانیمان کتێبەکەی چۆنو لەبەرچی نووسیوە، دەبوایە ئەو باسانەی (باروت)ی بخوێندایەتەوە کە چۆن کۆمۆنیستەکانو سۆشیالیستەکان لەو بەرەیەدا بوون کە دژی حوکمی عەبدولناصر بوو. ئەو دیکتاتۆرەی میسریش کە بەخەیاڵی میسرییەکەی خۆمان دیموکراتیخوازەکان لێی نزیك دەبوونەوە لەژێر فشاری ئیخوانو باقی نەیارەکانی ڕژێم ناچار بوو، یان با بڵێین ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش (مجلس قیادة الثورة) بڕیارەکانی پێنجی ئازار ڕابگەیەنێت سەبارەت بە هەڵگرتنی باری نائاسییو هەڵبژاردنی کۆمەڵەیەکی دامەزرێنەر بڕیار لەسەر دەستوور بداتو بەکارەکانی پەرلەمان هەڵسێت، بەڵام دوای سێ هەفتە عەبدولناصر ئەمەی هەڵوەشاندەوە ئەویش لەڕێگەی ڕیکخستنی مانگرتنێکی حکومیی کرێکارانی دەزگای شەمەندەفەرو کرێکارانی گواستنەوەو ئەو مانگرتنە داوای هەڵوەشاندنی بڕیارەکانی پێنجی ئازارو ڕووخانی دیموکراسیو حزبەکانی کرد، ئەمەش بۆ عەبدولناصر چووە

سەرو ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش حوکمی بەتەواوەتی گرتەدەستو جارێکی تر حزبەکان، جگەلە ئیخوان، هەڵوەشێنرانەوەو شەقامەکانی قاهیرە لە حاڵەتی داگیرکردنی سەربازیی فیعلیدا بوون(باروت، ل١٨٧-١٨٩).

کەواتەو بەکورتی لەناو ئەوانەی نەیاری نیزامە سەربازییەکە بوون تەنها ئیخوان، ئەویش تەنها بۆ ماوەیەك، وەکو حزبێکی ڕێگەپێدراو مابوونەوە لەکاتێکدا هێزە چەپو دیموکراتییەکان قەدەغە کرابوون، ئەوەش بوو بە ڕەخنە لە ئیخوان، بەتایبەتیش کە ئیخوان بەوە تاوانبار کرا ئەو ڕێککەوتنەی هوزەیبی لەگەڵ ڕژێم ئەو ڕژێمەی لە کەوتن پاراست کە ئەوە تۆمەتێکی ڕاستەو دوایی ئیخوان باجەکەی دا چونکە بێدەنگیی نیزامە سەربازییەکە بۆ ماوەیەك و بۆ مەبەستێك بوو ئەویش بۆ ئەوەی ئیخوان پاڵپشتی ئەو نیزامە بێت. دوایی دەرکەوت کە زەبری عەبدولناصر لە مێژووی میسردا وێنەی نەبووە.

<u>جوانکردنێکی تری دیکتاتۆر:</u> میسری دەڵێت کە لەو کاتەی ئیخوان داوایان دەکرد موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ سەرەتاو دەوڵەتێکی لەجۆری دەوڵەتی خیلافەت بنیات بنێنەوە عەبدولناصر باوەڕی وا بوو پێویستە سوود لە زانستو زانیاریی مۆدێرن وەربگیرێت(ل٢٨٠). میسری کە ئەوە دەڵێت لەیادی دەچێت کە هەر خۆی باسی پرۆژە ئابوورییەکانی ئیخوانی کردووە، کە ئەمە کارێکی فعلییە بۆ چالاکیی عەقڵانی لەبواری ئابووریدا، ئەویش لەسەرەتاکانی دامەزراندنی کۆمەڵەکە واتە زیاتر لە سی ساڵ پێش ئەوەی عەبدولناصر لەگەڵ باقی ئەفسەرەکان کۆدێتاکەی خۆیان بکەن.

## بۆچی جەماوەر ڕوویکردۆتە ((ئوسووڵییەکان))

**یەکەم-دیفاعێکی تری میسری لە دیکتاتۆریەت:** میسری (ل٣٠٩ —٣١٠) باسی هۆکارێکی گەشەکردنی ڕەوتە ئیسلامییەکان دەکاتو دەڵێت کە سیاسەتی ئابووریی سەرۆکی میسر ئەنوەر ئەلسادات بریتی بوو لە پەیڕەوی کردنی سیستەمی بازاڕی ئازادو کە پێگەی سەرەکیی ئەو سیاسەتە گۆڕینی موڵکایەتیی گشتی بۆ موڵکایەتی تایبەت بوو و ئەمە کاری کردە سەر گوزەرانی چینی هەژار، دەستکەوتەکانی هاووڵاتییانیش، کە هی سەردەمی جەمال عەبدولناصر بوون، پاشەکشەیان کرد. نرخی کەلوپەل بەهۆی ئەو سیاسەتەوە زیادیان کردو بێکاریو نائومێدیی لاوانیش زیادیان کرد، لادێش پشتگوێخرا. لەئەنجامی ئەوەش کۆمەڵە ((مەزهەبییەکان)) باوەشیان بۆ لاوانی بێکار، هەروەها ئەوانەی لە گوندەکانەوە بۆ شار کۆچیان کردبوو، کردەوە.

میسری کە باسی ئەوە دەکات پاساو بۆ سیاسەتە فاشلەکانی عەبدولناصر دەهێنێتەوە کە دیارە ئەلسادات ویستی بە سیاسەتێکی فاشلی تر چارەسەری دەرهاوێشتەکانیان بکات. سیستەمی ئابووریی سەردەمی عەبدولناصر پاشکۆی سیستەمە سیاسییەکەی بوو کە نموونەی هەردوو سیاسەتەکە لە ولاتانی ڕۆژهەڵاتدا دەبینران، چ ولاتە عەرەبیو ئیسلامییەکانو چ ولاتەکانی سەر بە بلۆکی ڕۆژهەڵات، بێگومان بێئەوەی ئەو نیزامانەمان لەیاد بچێت کە چەپڕەو بوونو سەر بەو بلۆکە نەبوون. سەرمایەداریی دەوڵەت ببووە مۆدێلێکی باو تا زەمەن سەلماندی کە بەرگەی واقع ناگرێت. یەکێك لەو دەستکەوتانەی سەردەمی عەبدولناصر کە میسری

باسیان دەکات بریتی بوو لە بێکارییەکی داپۆشراو کە نموونەیمان لە عیراقدا بینیبوو. لەو نیزامانەدا هاووڵاتی دەرفەتی دەستکەوتنی کاری هەبوو بەڵام ئەو کارە لە فەرمانگەیەکی حکومیدا بوو، لەبەرئەوەش کە فەرمانگەو کارگەو پرۆژەکانی حکومەت سنووردارن‌و ناتوانن پێ بەپێی زیادبوونی هێزی کار برۆن ساڵانە ژمارەی فەرمانبەران‌و کرێکارانی حکومەتی زیادیان دەکردو بەم جۆرە فەرمانگەکان بەناچاری زۆرتر لە پێویستیی کارەکەی خۆیان هاووڵاتییانیان وەردەگرت‌و لەمەوە ئەوانەی دواتر دادەمەزران لەواقعدا بێکار بوون. ئەم شێوە بێکارییەش جگەلەوەی زیانێکی ئابووریی ڕاستەوخۆی بۆ دەوڵەت هەیە، چونکە مەسرەف بەهۆی مووچەی ئەو ژمارە زۆرەوە زۆرتر بوو، زیانێکی ئابووریی تری ناڕاستەخۆی لە دەوڵەت دەدا بەوەی حکومەت لەبەر کەمیی مووچەی هاووڵاتییان ناچار بوو کاڵای پێویست بە نرخێکی هەرزان، واتە بە نرخێکی کەمتر بە نرخی ڕاستەقینە بداتە هاووڵاتییان‌وئەوە دەبووە بارێکی تر بەسەر بودجەی دەوڵەت.

ئەوە بەکورتی یەکێك بوو لە زیانەکانی نیزامی سەرمایەداریی دەوڵەت کە لە میسری عەبدولناصردا بەناوی سۆشیالیزمەوە پیادە دەکراو میسرییەکەی خۆمان بە دەستکەوتی دەزانێت. باقی چیرۆکەکەی وڵاتی میسری دوای عەبدولناصر ئەوەیە ئەلسادات ویستی ئاکامەکانی ئەو سیاسەتە بسڕێتەوە بەڵام بە سیاسەتێکی تەواو پێچەوانەوە ئەوەیش بە ناوی کرانەوە (الانفتاح) بەڵام لەبەرئەوەی ئەو گۆڕانکارییە کتوپڕو بێ نەخشەیەکی عەقلانی بوو ئاکامی خراپی لێکەوتەوە وەك پەیدابوونی ئەو دەوڵەمەندە گەورانەی بەشێوەیەکی ناڕەوا سامانیان پەیدا کرد ئەویش لەڕێگەی سوودوەرگرتن لە کرانەوەو بەتایبەت لە هێنانی کەلوپەل لەدەرەوە، ئەو چینە تازە

هەڵکەوتووەش بەناوی (پشیلە قەڵەوەکان) ناسران، بەرامبەر بەوانیش گوزەرانی هاوولاتی باش نەبوو بەڵکو کەوتە ژێر ڕەحمەتی بازاڕی ئازاد.

**دووەم-شێواندنی تەنانەت عەلمانیەتیش:** میسری هۆیەکی تری ئەوەی خەڵك ڕوویانکردە ڕەوتە ئیسلامییەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان عەلمانی نەبوون. میسری دەڵێت کە ڕاستە زۆربەی ئەو دەسەلاتە سیاسییانە (کە دوای هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی دامەزران) بەڕواڵەت عەلمانین بەلام هیچیان، جگەلە تورکیا،[6] دەوڵەتی عەلمانی نین(ل٣١١). بەلام ئایا بەعەلمانیبوون چییە؟ ((عەلمانییەتەکان)) با لەیەکتریش جیاواز بن بەلام شتێك هەیە لەنێوانیاندا هاوبەش بێت ئەویش فیکرەی جیاکردنەوە دین لە دەوڵەت، ئەو فیکرەیەش لاوەکی نییە بەڵکو کرۆکی عەلمانیەتو عەلمانیەت بەوەوە دەناسرێتەوە، بەواتایەکی تر عەلمانیەتی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی ئەورووپای ڕۆژهەلاتی ئەوسا

[6] ئیشکالیەتێك لە پەیوەندیی تورکیا بە عەلمانیەتەوە هەیە. پێشێلکردنی مافی مرۆڤو نەسەلماندی مافی ((کەمایەتییەکان))، بە کوردەوە کە ستەمە ناوی کەمایەتیی لێ بنرێت، دوو تایبەتیی نیزامە عەلمانییەکەی تورکیایە، هێشتاش لای هەندێك کەس تورکیا نموونەی عەلمانیەتە، لەمەشدا شتێکی ناڕاستیان نەوتووە چونکە مەرج نییە عەلمانیەت مافی مرۆڤو مافی کەمایەتییەکان، تەنانەت دیموکراسیو ئازادی بەگشتی بسەلمێنێت، دەوڵەتەکانی بلۆکی ڕۆژهەلاتو نیزامە سۆشیالیستە هاوشێوەکانیان لەگەڵ چەند نیزامێك تری قەومی یان تەنانەت بەناو دیموکراتی نموونەن لەسەر ئەوە. خاڵی دەستپێکردنی عەلمانیەت (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت یان بەشێوەیەکی گشتی جیاکردنەوەی دینی لە دونیایی) لەگەڵ خاڵی دەستپێکردنی دیموکراسیو ئازادی (مافی بەشداری بۆ هەمووان یان بەلای کەمەوە بۆ زۆربە) جیاوازە. یەکەمیان بەشێکی گەورەی، بەڵکو زۆرینەی، کۆمەڵگە لە دەسەلاتو بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵگەیە بێبەش دەکات لەکاتێکدا دووەمیان، ئەگەر بەشێوەیەکی تیۆریش بێت، دژبە بێبەشکردنە.

عەلمانیەتێکی دروستە ئەگەرچیش نیزامەکە دیکتاتۆریەتی حزب یان پێشەوا بێت، بەهەمان شێوەش عەلمانیەتی دەوڵەتێکی سەرمایەداری ئەوروپای ڕۆژئاوا هەر دروستە ئەگەرچی نیزامەکە دیموکراتی بێت. بەواتایەکی تر هیچ توخمێکی دیموکراتیی ڕەسەن لەناو فیکرەی عەلمانیەتدا نییە چونکە بناغەی عەلمانیەت جیاکردنەوەی دینە لە دەوڵەت. لەمەشەوە دەزانین ئەو قسە نوێیەی بڵاوبۆتەوە گوایە عەلمانیەت بێ دیموکراسیەت نابێت قسەیەکە لە بناغەی عەلمانییەتەوە هەڵنەقوڵاوە بەڵکو بیدعەیەکە لەناو عەلمانیەت.

میسری ئاگای لەم بیدعەیە بێت یان ئاگای لێ نەبێت ئەو شتێك دەڵێت کە نەك تەنها ناتوانێت بیسەلمێنێت بەڵکو خودی تیۆری عەلمانی بەدرۆی دەخاتەوە ئەویش کاتێك دەڵێت کە ئەو دەوڵەتە موسڵمانانە عەلمانی نەبوونو ئەوانە هیچیان بە ویستی هاووڵاتییان دەسەڵاتیان نەگرتۆتە دەست(ل٣١١). ڕاستە ئەو نیزامانە بە ویستی هاووڵاتییان دانەمەزراون بەڵام چۆن دەکرێت ئەمە بکەینە بەڵگە لەسەر ئەوەی عەلمانی نەبوون؟

ئەو پەیوەستکردنەی عەلمانیەتو دیموکراسی بەشێوەیەك یەکێکیان هۆی ئەوەی تر بێت یەکێکە لە فێڵە گەورەکانی تیۆری نوێی عەلمانیەت. عەلمانییەکان دەتوانن داوای هەردوو عەلمانیەتو دیموکراسی لەیەك کاتدا بکەن بەڵام ناتوانن بڵێن فلانە نیزام عەلمانی نییە چونکە دیموکرات نییە. بۆ ئەوەی ئەو موناقەشەیەش پۆخت بکەین دوو فەرزەکە دەڵێین:

یەکەم: ئەو نیزامەی دیموکرات نییە عەلمانی نییە، لەسەرەوەشدا باسمان کرد کە ئەمە هەڵەیە ئەویش بە بەڵگەی خودی فیکرەی عەلمانی کە جیاکردنەوەی دینە لە دەوڵەتو کە دەکرێت نیزامێکی کۆمۆنیست پیادەی بکات بەوەی ئاینو پیاوانی ئاین لە کاروباری دەوڵەت دووربخاتەوە.. نەك

تەنها دەکرێت بەڵکو کردوویەتی‌و ئەو زیاتر لە نیزامەکانی تر تەئکیدی لەسەر کردووە.

دووەم: ئەو نیزامەی عەلمانی نییە دیموکرات نییە، ئەوەش لەهەموو حاڵەتێکدا دروست نییە چونکە دەکرێت نیزامێکی ئاینی بێت بەڵام شێوەیەکی تایبەتی دیموکراسی پیادە بکات کە هەڵبژاردنی تێدا بێت بەڵام سنوور بۆ ئەو هەڵبژاردنە دابنێت وەك ئەوەی نەهێڵێت عەلمانییەکان خۆیان بپاڵێون. سنووریش لە نیزامە دیموکراتەکاندا هەبووەو کەس نەیدەوت ئەوە دیموکراسییەکی ساختەیە لەبەر ئەو سنوورانە، تەنانەت جۆرە سنوورێك لە ڕۆژئاوای سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست دانرابوو کە نیوەی گەل، واتە ئافرەتانی لە دەنگدان‌و خۆپاڵاوتن دووردەخستەوە بێئەوەی کەس بڵێت بەو دوورخستنەوەیە نیزامەکە دوورکەتۆتەوە لە دیموکراسی، واتە دوورکەتۆتەوە لە حوکمی گەل.[7]

بەهەمان شێوەش دەکرێت ئەو نیزامە ئاینی بێت بەو واتایەی کار بە یاساکانی ئاین بکات‌و لەهەمان کات دیموکرات بێت بەو واتایەی پەرلەمان بۆی هەبێت یاسای نوێ دابڕێژێت بەڵام لەکۆتاییدا ئەو یاسایە لەگەڵ یاسای سەرەکیی دەوڵەت (یاسا ئاینییەکە) بەراورد بکرێت، وەك چۆن هەر یاسایەك لەهەر دەوڵەتێکی دیموکراتیدا دەبێت لەگەڵ دەستووردا بگونجێت،

---

[7] لە کتێبەکەمدا (ئەفسانەی دیموکراسی -١٩٩٨) بەشێکی گەورەم تەرخان کردووە بۆ ئەو فیکرەیەی کە دیموکراسی هێندە کۆسپی لەبەردەمدایە کە ناتوانین بڵێین حوکمی گەلە بەڵکو لەڕاستیدا حوکمی کەمایەتییە، بەڵام لێرەدا مەبەستم لەو کەسانەیە کە ئەو قەناعەتەیان هەیە کە دیموکراسی بەڕاستی حوکمی گەلەو نیزامە دیموکراتییە کۆنەکان، کە کۆسپیان دەخستە بەردەم بەشدارییەکی فراوانتری گەل، سەرباری ئەو کەموکورتییە بە حوکمی گەل دەزانن.

جیاوازییەکەش لەکۆتاییدا ئەوەیە یاسای سەرەکیی نیزامە دیموکراتە عەلمانییەکە بۆی هەیە بگۆڕدرێت بەڵام یاسا سەرەکییە، واتە دەستوور، ئاینییەکە ناگۆڕێت.. تەنانەت ئەو جیاوازییەش بەس نییە بۆ ئەوەی نەگۆڕانی دەستوور دژ بە دیموکراسی بێت چونکە بناغەی دیموکراسی حوکمی گەلە، ئەگەر گەلیش نەیەوێت دەستوور بگۆڕێت بڕیارەکەی هەر دیموکراتییە، جگەلەوەش،و وەکو واقع هەندێك دەستووری عەلمانی بڕگەی وایان تێدایە کە دەڵێت نابێت فلان یان فیسارە شت دەستکاری بکرێن یان بگۆڕدرێن، وەك دەستووری ئەمەریکی کە ڕێگە نادات نیزامی حوکمی کۆماری ئیلغا بکرێت. بەپێچەوانەشەوە، هەندێك یاسای ئاینی، چ لە یاساکان بەگشتی،و چ لە دەستوور، بۆیان هەیە بگۆڕدرێن بەتایبەت لە دەوڵەتێکی ئیسلامیدا ئەگەر دەرگای ئیجتهادی کردبێتەوە یان بڕیاری دابێت لە هەندێك شتدا کار بە مەزهەبی تر بکات تا لەکۆتاییدا ژمارەی ئەو یاسایانەی نابێت بگۆڕدرێن سنووردار دەبێت.

تا ئێرە باسی پەیوەستکردنە هەڵەکەی نێوان دیموکراسی،و عەلمانیەت بوو کە وەك وتم کراوەتە پەیوەستێکی زەڕووری، زەڕووری بەو واتایەی کە ئەگەر ئەو نەبێت ئەوی تر نابێت.. ئەمەش بیدعەیەکە عەلمانیەت، کە عەلمانیەت خۆی بیدعەیە لەچاو نیزامەکانی مێژوو، بۆ خۆی زیادی کردووە. لێرەشەوە دەگەڕێمەوە سەر میسری،و ئەو قسەیەی کە گوایە ئەو نیزامانەی دوای هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی دامەزران دیموکرات نەبوون،و تەنها بە ڕواڵەت عەلمانی بوون. میسری دوای ئەو شێواندنەی فیکرو مێژوو دەڵێت کە هێزە چەپ،و دیموکراتخوازەکان نەیانتوانیبوو ئەو واقعە بگۆڕن ئەمەش کەشوهەوایەکی گونجاوی بۆ ڕەوتە ((مەزهەبییەکان)) خۆش کرد کارلەسەر

مەسەلەی ژیاندنەوەی کۆمەڵگەی سەرەتایی ئیسلام بکەنو ئیسلام وەك تاقە چارەسەر بە خەڵکی ناوشیار بناسێنن(ل٣١١).

ئیسلامییەکان بەگشتی دروشمی (ئیسلام چارەسەرە) بەرزدەکەنەوە، زۆریش لە عەلمانییەکان ئەو دروشمەیان کردۆتە بابەتی ڕەخنەی خۆیان، بەڵام خۆ هەر ئەوانیش، بزانن یان نەزانن، هەمان ڕستە بەکاردەهێنن بەڵام لەجیاتی ئیسلام وشەیەکی تر دادەنێن، ئەگینا کێ باوەڕ دەکات عەلمانییەك باوەڕ بە ڕستەی (عەلمانیەت چارەسەرە) ناکات؟ کێ دەتوانێت بڵێت دیموکراتخوازان باوەڕیان نییە دیموکراسی چارەسەرە؟ کام چەپیش ئەگەر لێی بپرسی دەڵێت دڵنیا نیم باوەڕە چەپەکەی خۆم (مارکسیەت بێت یان هەر باوەڕێکی تر) چارەسەرە؟ هەر بۆیە ئەو بیروباوەڕانە ئەگەرچی خۆیان لە ئاین دووردەخەنەوە جۆرە ئاینێکن چونکە لەسەر ((باوەڕ)) دامەزراون. تەنهاش کەسێك کە نازانمبێژە (لاأدري) لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆیە چونکە ئەو لە هیچ دڵنیا نییە، هەرچەندە ئەو ڕاستگۆییەی سوودی نییە چونکە هەرئەوەندە ئەو باوەڕەی درکاند ئیتر ناتوانین یەك هەنگاو شوێنی بکەوین، جگەلەوەی ئەو ناتوانێت پێمان بڵێت ئەوی وڕو گێژی (نازانمبێژ)و نادڵنیا چۆن لەو نازانمبێژی (لاأدرية)یەی خۆی دڵنیا بووە. بێگومان جگە لەو نازانمبێژە ئەو ئیسلامییەش کە خاوەنی دروشمی (ئیسلام چارەسەرە)، یان هەر کەسێکی تری خاوەن باوەڕ، ئاینی یان عەلمانی، لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆیە هەتا ئەگەر وردەکارییەکانی چارەسەرەکەش نەزانێت.

دیارە سەردەمەکەمان کەمێك (ڕەنگە زۆر.. حاڵەت کەوتووە) دووڕوویی دەوێت. بۆ ئەوەی پۆشاکی زانستێتی بکەیتە سەر شانت پێویستە بە یەقینەوە شتەکان نەڵێیت، ئەو پۆشاکە زانستییەش زۆر کەس

دەخەڵەتێنێت، بەڵام پرسیاری وردو ڕاستەوخۆ وەڵامی وردو ڕاستەوخۆی دەوێت، ئێمەش دەپرسین: فلان کە باوەڕی بە فلانە شت هەیە ئایا باوەڕی بەوەشە کە فلانە شتە چارەسەرە یان نا؟ ئەگەر باوەڕی پێیەتی بۆچی ڕەخنە لە (ئیسلام چارەسەرە) دەگرێت گوایە دروشمێکە شتێکی یەقینی بە خەڵکی دەدات کەچی هەمان ڕەخنە لەخۆی ناگرێت؟ ئەو کەسە لەم حاڵەتەدا ڕاستگۆ نییە، لەحاڵەتەکەی تریشدا گەمەمان لەگەڵدا دەکات، واتە لەو حاڵەتەی باوەڕی وابێت ئەو فلانە شتە چارەسەرە بەڵام دەشکرێت وا نەبێت لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەو شتە تاقیبکەینەوە.

کەواتە هەموو کەسێك باوەڕی بە چارەسەرێك، یان چەند چارەسەرێك، هەیەو پێویست ناکات دروشمی (ئیسلام چارەسەرە) ببێتە بابەتی ڕەخنە.

بگەڕێمەوە سەر میسری:

وتمان میسری دەڵێت کە نیزامەکانی پاش هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی نادیموکراتی بوونو تەنها بەڕواڵەت عەلمانی بوون، ئیسلامییەکانیش گەشەیان سەند تا ئیسلام وەك تاکە چارەسەر بە خەڵکی ناوشیار بناسێنن چونکە چەپەکانو دیموکراتخوازەکان نەیانتوانی ببنە بەدیل.

لێرەدا یەکێکە لەو چاڵانەی عەلمانییە ((بەبیانووەکان)) تێی دەکەون. ئەوان لەلایەك تەئکید لەسەر دیموکراسی دەکەن، بەڵام هەر کاتێك دیموکراسی دژ بەوان قسەی کرد پشتی تێدەکەن.

ئەو سەردەمانەی پێشووش کە تێیاندا ئیسلامییەکان بەشداریی پرۆسەی دیموکراتییان نەدەکرد قیڕەی ئەو بەبیانووانە ئەوە بوو ئیسلامییەکان باوەڕیان بە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنو دەنگدان نییە، بەڵام کاتێك ئیسلامییەکان ئەو بەشدارییان کردو دەنگی خەڵکێکی زۆریان دەستکەوت

بەدوای تەفسیرێکدا گەڕان، تەفسیرێك ئیسلامییەکانی پێ تاوانبار بکرێن، ئیتر لەوە باشتریان نەدۆزییەوە جەماوەر تاوانبار بکەن! بەڵێ بیانووەکەیان ئەوە بوو جەماوەر کاملّو وشیار نییە، خۆ ئەگەر ئەو جەماوەرە هی ئەوان بووایە ئەو کاتە دەگەڕانەوە سەر باوەڕی خواستی گەلو ئیرادەی میللی.

نموونەیەك لەسەر ئەوە، موناقەشەی دوکتۆر یوسف قەرەزاویو دوکتۆر فوئاد زەکریا. ئەمەی دوایی پێش ئەوەی جەماوەر بەدەم ئیسلامییەکانەوە بچێت چۆکی بەرامبەر خواستی گەل دادابوو، بەڵام کە حاڵ گەیشتە ئەوەی ئەو خواستە بریتی بێت لە دەنگدان بۆ ئیسلامییەکان هەڵسایەوە سەرپێو ئەژنۆی لە تۆز تەکاندو تفێکی کردە بتەکەی.

فوئادەکەی میسر لە وەڵامی دیاردەی جەماوەرێتیی ئیسلامییەکانو دەنگدانی زۆرینە بۆیان دەیوت کە فراوانیی ئەو قاعیدەی جەماوەرییەی باوەڕێکی هەیە نابێتە پێوانە بۆ سەرکەوتوویی ئەو باوەڕە مەگەر تەنها لە یەك حاڵەتدا ئەویش هۆشیاریی ئەو جەماوەرە ((تەواو گەییو)) بێت، قەرەزاویش ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگرێت کە لەکوێ ئەو مەرجەی هێنا کە هۆشی ئەو جەماوەرە ((گەییو)) بێت، ئینجا نەك تەنها گەییو بێت بەڵکو تەواو گەییو بێت، پاشان تەنانەت ئەگەر قبووڵی ئەوەشمان کرد کێ مافی ئەوەی هەیە بڕیار بدات ئەمەیان گەییوەو ئەوەیان وا نییەو ئەمەیان بەشێکی گەییوییەو ئەوەیان هەموویەتی.[8]

هێشتا ماوە بۆ ئەم بەشە باس بکرێت، بەڵام لێرەدا بە ڕاستییەك باسەکەمان دەهێنینە کۆتایی ئەویش کە ئیخوان وەك هەر حزبێکی سیاسی هەڵەی کردووە، هەندێ جار بەرامبەر لایەنەکانی تر، جاری واشە بەرامبەر بە

[8] د. يوسف القرضاوي، الاسلام والعلمانية وجها لوجه، ل٨٩-٩٠.

خودی خۆی، گەورەترین هەڵەش ئەوەیە پێداچوونەوەیەکی فیکرو مومارەسەی خۆی ناکاتو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خۆی وەکو فیکرو کۆمەڵەیەکی مەعسووم پیشان دەدات، هەر بەهانەیەکیش بۆ نەبوونی پێداچوونەوە لەشێوەی ((دوژمن سوودی لێ وەردەگرێت)) لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت چونکە قورئان لە لوتکەی ستەمی بێباوەڕان لە پێغەمبەرو شوێنکەوتووانیو لە ئەوپەڕی بێهێزیی موسڵمانان لە مەککەدا ڕەخنەی لە پێغەمبەر گرتووە، وەك ئایەتەکانی (عبس وتولی، ان جاءه الاعمی..)، پێغەمبەر نەیوتبوو: خودایە بۆچی ڕەخنەم لێدەگری لەو کاتەی بێباوەڕان دژایەتیم دەکەن... پێداچوونەوە ئەو فەزیلەتەیە کە کەم حزبی ئیسلامی، شانازی بەوە بکات کە کردوویەتی.[٩]

---

[9] وەکو حاڵەتێکیش ڕوویدابێت تەنها ئەم نموونەیە لەسەر هەڵەکانی ئیخوان، کە لە لاپەڕەکانی پێشتردا باسم کردبوو، وەردەگرمو کە لە کتێبەکەی (باروت)دا هەیە (ئەمەشم هێندە کورت کردۆتەوە کە بەدڵنیاییەوە وێنەی تەواوی ئەو وەزعە نادات بەدەستەوە): لەو کاتەی ڕابەر، ئەلهوزەیبی، لەلایەن حکومەتی عەسکەرییەوە گیرابوو عەبدولقادر عودە کە کاروبارەکانی ئیخوانی بەڕێوە دەبرد جۆرە هەماهەنگییەکی لەگەڵ (بەرەی یەکگرتوو) کرد کە بەپاڵ ئیخوان کۆمۆنیستەکانو وەفدییەکانو سۆشیالیستەکانی تێدا بوو، دوای بەردانی ڕابەرو سەردانی عەبدولناصر بۆ ئەمیان ڕابەر داوای چارەسەرێکی بۆ وڵاتەکە کرد، ئەوانەی سەرەوەش کە پێشتر کۆمەکی ئیخوانیان کردبوو ئیخوانیان بە خیانەتکردن لە مەسەلە نیشتمانییەکەو پاراستنی ڕژێمی لە کەوتن تۆمەتبار کرد، سەرباری ئەوەش عەبدولناصر بەڵێنەکانی خۆی بۆ ئیخوان جێبەجێ نەکرد (بڕوانە درێژەی ئەوە لە باروت، ل١٨٦-١٩٠). ئەو ڕاستییە مێژووییەش باسکراوە کە کۆمۆنیستەکان لەچەند موناسەبەیەکدا دیفاعیان لە ئیخوان دەکرد.

.

## بەشی شەشەم

# تەکفیر.. هیجرەت.. جارێکی تر ئیخوان

خوێنەر ئێستا شارەزای ئەو کارانە بووە کە
میسری کردوونی: بردن، تەزویرکردن،
قسەکردن بە نەشارەزایی، تێنەگەیشتن لە
زانیارییەکان

**میسری بەشی چوارەم بۆ تەکفیر تەرخان دەکات(ل٣١٣ بەدواوە) بەوەش‌و بەو لاوەکییەش کە لەبارەی (هیجرەت)ـەوەیەو تەنها (١٨) لاپەڕەیەو هەروەکو سەرجەم کتێبەکەی سادەییەکی زاڵ هەیە کە نەیهێشتووە بەوردی لە مەسەلەی تەکفیر تێبگات.**

**دوای ئەوە بەشی پێنجەم بەناوونیشانی (ئیخوان‌و تیۆری دەسەڵات) دێت کە ٢٦ لاپەڕەیە (٣٣١-٣٥٦).**

## حاکمیەت

**سادەیی‌و بێئاگایی نووسەر لەوەدا دەردەکەوێت کە جارجار مارکسیەتی خۆیمان پیشان دەدات (ڕاستتر مارکسییەتێکی سەقەتکراو) بەڵام ڕەخنەیەك دەهێنێتەوە کە بەسەر چەپەکانیشدا، بەتایبەت ڕادیکاڵەکان، دەچەسپێت. میسری (ل٣٢٥-٣٢٧) باسی ڕەوتێکی ئیسلامیی گۆشەگیر دەکات کە دەیەوێت بیروباوەڕی خۆی بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنێت، دەشڵێت ئەمانە خەون بەشتێکەوە دەبینن کە مەحاڵە لەواقیعدا بۆیان بێتە دی بۆیە**

پێویستیان بەوە هەیە هێز بە دەروونیان ببەخشرێت، ئەوەش لە کەسایەتیی (میر)دا دەبیننەوە، ئەو میرەش لەڕێی بەکارهێنانی چەمکی حاکمیەت، هەروەها لەڕێی بەیعەتەوە قودسیەتی پێدەبەخشرێت(ل٣٢٧–٣٢٨).

میسری کاتێك ئەوە دەڵێت مارکسیەتی خۆی لەبیرنامێنێت چونکە دابڕان لەکۆمەڵگە حاڵەتێکە تووشی هەموو ڕەوتەکانی گۆڕانکاری دەبێت، ئەمانەش بۆیە دەیانەوێت گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا بەئەنجام بگەیەنن چونکە هەست بەجیاوازی خۆیان‌و بیروباوەڕەکانیان دەکەن، چەندیش ئەو جیاوازییە قووڵ بێت ئەوەندە گۆشەگیرییەکە، ئەگەر دەروونیش بێت، گەورەتر دەبێت، لە دوو حاڵەتیشدا ئەو ڕەوتە دەگاتە ڕێگەچارەی توندوتیژ: ئەو کاتەی دەسەڵات ڕێگەی چالاکیی ئاشتییانەی لەبەردەمدا دادەخات، ئەو کاتەش کە ڕێگەکە دانەخراوە بەڵام تاقمێکی ناو ئەو ڕەوتە هەڵگری فیکری دەستپێشخەریکردن لە توندوتیژی بێت.

ئەمە وەکو چۆن بۆ ئیسلامییەکان ڕاستە بۆ چەپەکانیش ڕاستە، بۆ ئەوپەڕی ڕاستیش هەر ڕاستە، بەڵام لەبەرئەوەی میسری بەنیازێکەوە قسە دەکات ئەوەی تایبەت بە تەنها ئیسلامییەکان کردووە. مەسەلەیەکی تر دەمێنێتەوە: گوایە خواستی ئەندامان بۆ هێزێکی دەروونی، ئەو هێزەش پێشەواکە دەیبەخشێت، ئەو پێشەوایەش لەڕێگەی حاکمیەت‌و بەیعەتەوە قودسیەت بەخۆی دەدات. ئەم مەسەلەیەش دیسان لەناو ڕەوتە چەپەکانیشدا هەیەو هەر ئەوەندە حاکمیەتی شەریعەت‌و بەیعەت بگۆڕین بە وشەی تر، بۆ نموونە ڕەوایەتیی خەباتی چینایەتی‌و گوێڕایەڵی بۆ سەرکردە یان بۆ حزبی پێشەوا.

شتێکی تر کە هەردوو ڕەوتە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکەو چەپە ڕادیکاڵەکە

تێیدا بەشدارنو میسری لەو ئاستەدا نییە بیزانێت ئەوەیە مەسەلەی حاکمیەت (یان بەرامبەرە چەپەکەی) لەدەوری پێشەوا کەمدەکاتەوە.

حاکمیەت کاتێك بەسەر مێشکی ئەندامانداا زاڵ دەبێت دەبێتە پێوانەیەك بۆ کەسەکانو ڕووداوەکانو هەڵوێستەکان. حاکمیەت کاتێك لەئەسڵدا لای خەوارج سەری هەڵدا دژی تەحکیمکردنی مرۆڤ بوو، ئەوان دەیانوت قورئان حوکم دەکات نەك مرۆڤ، پێشەواش لای خەوارج زاراوەی "یەکەمی هاوشانەکان" یان "یەکەمی ناو یەکسانەکان" primus interpares دەیگرێتەوە.[1]

لەم زەمەنەی ئێمەشدا ئەوپەڕی سەخافەتە بوترێت ئەو کۆمەڵانەی تەئکید لەسەر حاکمیەت دەکەن قودسییەتتان بە پێشەواکەیان داوە، لە هەندێ کۆمەڵی کۆنو نوێدا تەنانەت پێشەواکە لەسەر هەڵوێستێك تەکفیر دەکراو تەنانەت دەشکوژرا، لەمەشەوە بەیعەت لای ئەو تاقمانە ئەگەر چی گوێڕایەڵییە بەڵام پیرۆزی نییەو زۆر بەئاسانی تاکەکان سەرپێچیان لەفەرمانەکان دەکرد چونکە بەهۆی حاکمیەتەوە فەرموودەی (لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق) ئامادەییەکی بەهێزو بەردەوامی هەبوو، بەڵکو بەئاسانیش بەیعەت هەڵدەوەشایەوە.

بەکورتی لەناو ئەو جۆرە کۆمەڵانەدا وەلائـ بۆ فیکرە بەهێزترە لە وەلائـ بۆ کۆمەڵەکە، هەمووش دەزانن کە ئەو کۆمەڵە لەسەر بناغەی ئەو فیکرەیە دامەزراوەو هەر لادانێك قبووڵ نییەو زۆر جار بە ئیجتیهادێك کارێکی دیاریکراو بە لادان دەزانرێت.

---

[1] تەعبیرێکی لاتینییە بۆ ئەو کەسە بەکاردێت کە یەکەمی ناو کەسانێکی هاوشانو هاوپلەی خۆی.

لەمەشەوە دەزانین قسەكەی میسری چەند بێبناغەیە كاتێك ئیخوانی كاتی بەننا بە نموونەیەكی ئەو كۆمەڵە دەزانێت كە پێشەواكەی بەهۆی حاكمییەتەوە قودسییەتی وەرگرتووە. بەننا خاوەن كاریزما بوو ئەوە ڕاستە، بەڵام بناغەی كاریزماكەی حاكمییەت نەبووە.

## ئیخوان و (ڕەزا)

میسری بەشی پێنجەمی كتێبەكەی كە ناوی (ئیخوان و تیۆری دەسەڵات، ل ٣٣١ بەدواوە) بە ڕستەیەك دەستپێدەكات: ((كەسێك بیەوێ بەقووڵی لە گوتاری سیاسیی ئیخوان تێبگات ناچار دەبێ بگەڕێتەوە سەر تێزە فیكرییەكانی موحەممەد ڕەشید ڕەزا))، وەك بڵێیت میسری بەقووڵی لەو وتارە تێگەیشتبێت و بەڕاستی گەڕابێتەوە سەر (ڕەزا).

هەموو ئەوەش كە میسری لەبارەی ڕەزاوە دەیڵێت ئەوەیە ناوبراو نە بە كاربەدەستانی ئەزهەر رازی بووە كە كتێبە فیقهییە كۆنەكان لاسایی دەكەنەوەو نە بە ڕۆشنبیرە عەلمانییەكانیش ڕازی بووە كە یاساو سیستەمە ئەورووپییەكان لاسایی دەكەنەوە. ڕەزا بەنیاز بوو حزبێك دابمەزرێنێت نە پابەندی بیروڕای پیاوانی ئەزهەر بێت و نە چاو لەتەوژمی عەلمانیی ڕۆژئاوا بكات(ل٣٣١).

ئەگەر ئەمە هەموو ئەو بناغەیە بێت كە ئیخوان وتاری سیاسیی خۆی لەسەر بنیات نابێت كەواتە بناغەیەكی سادەیە.

## ئیخوان و هێز

یان نەزانییە یان تەزویرە، كە هەردووكیان بۆ میسری دەشێن، كە باسی

هێـز لەلایـەن حەسـەن ئەلبـەنناوە[2] لەسـەر دەسـتی میـسری سەقەتدەکرێت(ل٣٣٨). بەننا بەم جۆرە باسی هێز دەکاتو بەم جۆرە باسەکەی دەستکاری دەکرێت:

-((هێز دروشمی ئیسلامە – القوة شعار الاسلام)) میسریش وای لێدەکات: بەکارهێنانی هێز لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامدا یاسایەکی خوداییە.

-((چیت لە مرۆڤێك دەوێت شوێنی ئەو ئاینە دەکەوێت ئەوە نەبێت لەهەموو شتێکدا بەهێز بێتو دروشمەکەی بریتی بێت لە: هێز لەهەموو شتێکدا)).. میسری وای لێدەکات: هێز لە ئاینی ئیسلامدا هەموو شتێکە.

-((دەبێت ئیخوانی موسلمون بەهێز بنو پێویستە بەهێزەوە کار بکەن– ولابد ان یعملوا في قوة)) میسری دەیکات بە : ئیخوان دەبێ خاوەن هێز بێو دەبێ بەکاری بهێنێ.

## ئیسلامییەکانو عەرەبایەتی

میسری لەڕاستیدا شارەزای شتێکی ترە، ئەو شارەزای ناشیرینکردنی بەرامبەرە.

ئەوەتا جارێکی تر دەیەوێت خوێنەری کورد وابزانێت بزاڤە ئیسلامییەکان قەومینو تەنها عەرەبیان مەبەستە. نکوڵیش لەوە ناکرێت کە هەستی نەتەوایەتی کەم تا زۆر لەناو کۆمەڵە ئیسلامییەکاندا هەیە، بەوانەی کوردستانیشەوە، بەڵام ئەو وێنەیەی بۆیان دەکێشرێت زیادەڕەوییەکی زۆری

[2] بڕوانە: د. حیدر ابراهیم علی، التیارات الاسلامیة وقضیة الدیمقراطیة، ل١٩٥، میسری ئەو باسەی لەو کتێبە وەرگرتووە، ئەو کتێبەش نامەکانی بەننا وەکو سەرچاوە دەنووسێت، میسریش لێرەداو لە شوێنی ترداو بۆ زیادکردنی ژمارەکەی سەرچاوەکانی ناوی کتێبەکانی نامەکانی بەننا وەکو سەرچاوەی حەڵاڵی خۆی دەنووسێت.

تێدایەو مەبەستەکە، وەك وتم، تەنها ناشیرینکردنی بەرامبەرە (لەخوارەوەدا زیاتر لەسەری دەڕۆم).

میسری (ل٣٣٣–٣٣٤) دەڵێت ڕابەری دووەمی ئیخوان (ئەلهوزەیبی) تەنها باسی مەسیحییەکانی کردووە بۆ مەسەلەی ئازادیی ئایینیو جوولەکەی پشتگوێ خستووە هەرچەندە ئەوانیش هەر (أهل الذمة)ن بەم جۆرەش وتاری هوزەیبی لەڕاستیدا قەومییە لە پۆشاکێکی ئاینی: ((بۆیە بزوتنەوەیەکی تا سەرمۆخ ناسیۆنال هەڵوێست لە خەڵکی جوو وەردەگرێتو ئەنجام ڕووە ڕاستەقینەکەی ئاشکرا دەکات)) (ل٣٣٤).

ئەمەیە مەبەستی میسری. تەعبیری ((سەرمۆخ ناسیۆناڵ)) بەسە بۆ ناسینی گیانی زیادەڕەوی لە حوکمدا.

میسری ئامانجەکەی بەنندا، ئەویش یەکێتیی موسڵمان بە مەترسی دەزانێت چونکە تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی موسڵمانی غەیرە عەرەبەکان ناهێڵێتو ئەو میللەتانە لەناو بۆتەی یەکێتییە ئایینییەدا دەتوێنێتەوە (ل٣٣٦).

ئەوە مەترسی نییە بەڵکو ترساندنە، مێژووش بەدرۆی خستۆتەوە چونکە ئەو یەکێتییە ئاینییە چواردە سەدە هەبوو، سەنتەری فەرمانڕەوایی لە بەشێکی ئەو ماوەیەدا عەرەبی بووە بەڵام نەمانبینی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی غەیری عەرەب (جگە لە نەتەوەی کەمی نزیك لە عەرەب وەکو ئەنباتەکان) فەوتابن.. ئەوەتا پاش ئەو ماوەیە زەمانەکانی ئەو میللەتانە ماونو خۆشیان ماونو هەندێکیان تەنانەت گەشەشیان سەندووە.

بەڵام با ئەو بەڵگە مێژووییە بچێتە ئەولاوەو باس لە وەهمێکی تایبەت بەم مەسەلەیە بکەین. ئەو وەهمە باوە دەڵێت عەرەب ئاین بۆ تواندنەوە یان

بەلای کەمەوە بۆ کاڵکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی نەتەوەکانی تر بەکار دەهێنن. بەڵگەی یەکەمی درۆی ئەم قسەیە ئەوەیە ئەو عەرەبانەی کە ڕەوتی قەومییان هەڵبژاردووە خۆیان لەڕووی ئیسلامییەوە کاڵبوونەتەوەو هەموو تەرکیزیان لەسەر نەتەوەی عەرەب بووەو باسی پەیوەستی ئیسلامییان نەدەکرد، دەمێنێتەوە ڕەوتە ئیسلامییەکانو سەلماندنی ئەوەی کە ئەو ڕەوتانە ئاین بۆ ئامانجێکی قەومی بەکاردەهێنن. ئەگەر ئەوەش ڕاست بوایە هەر لەڕێوە دەبوونە کۆمەڵێکی نەتەوەییو پێویستی نەدەکرد بە هەبوونی ئەو ڕەوتە ئیسلامییەی کە ئەو کاتە هێندەی ڕەوتە قەومییەکە باوی نەبوو. ئەوانەش کە ئاینو نەتەوەیان تێکەڵ کردووە بەشێوەیەکی تر کاردەکەن: ئەوانە تەئکید لەسەر ئیسلام دەکەنو چارەسەری ئیسلامییان هەڵبژاردووە، بەڵام باوەڕیان وایە کە وڵاتە عەرەبییەکان، یان ئەو وڵاتە عەرەبییەی تێیدا دەژین، دەبێتە مەرکەزی بووژاندنەوەی ئیسلامو عەرەبو دەورێکی مەرکەزی لەو بووژاندنەوەیە دەبینێت، ئاشکراشە ئەمە جیاوازە لە ڕەوتێك هەر لەسەرەتاوە ئامانجێکی قەومیی هەیە بەڵام بەرگێکی ئاینی دەکاتە بەر کە بڕوا ناکەم کۆمەڵەیەکی وا هەر هەبووبێتو ئەگەر هەشبووبێت کۆمەڵێکی لاوازو ناوچەییە چونکە مەنتیقی شتەکان قبووڵی ناکات.

ئەو بۆچوونەش ناواقعییە کە دەڵێت ئاین لای کۆمەڵە ئیسلامییەکان پردێکە بۆ ئامانجە نەتەوەییەکان چونکە عەرەب لەناو جیهانی ئیسلامیدا کەمایەتین، لەناو ملیارێك وسێ سەد ملیۆن موسڵمان تەنها سێ سەد ملیۆن عەرەب هەن، دانیشتوانی وڵاتێکی وەکو ئەندەنووسیا بەتەنیا زیاتر لە نیوەی هەموو عەرەب دەبن.. ئەمە یەکێك بوو لەو هۆیانەی بزاڤی نەتەوەیی عەرەب لە پەیوەستی ئیسلامی دوورکەوتبووەوە چونکە دەیزانی لەڕێگەی

ئەو پەیوەستەوە ئەوان دەبنە كەمایەتی نەك ئەوان بتوانن غەیری عەرەب بتوێننەوە یان بتوانن تایبەتمەندییە نەتەوەییەكانی غەیری عەرەب بسڕنەوە، هەر خۆشیان دەزانن كە زمانی قورئان كە عەرەبییە نەیتوانیوە ئەو كارە بكات چونكە قورئان لە جیهانی ئیسلامیدا هەر ئەو قورئانەیە كەچی ئەو میللەتانە هەر بەزمانی خۆیان دەنووسنو دەخوێننەوەو كەمێكیان عەرەبی دەزانن.

## گوێڕایەڵیو مافی شۆڕش

میسری قسەی ئەوانە دووبارە دەكاتەوە كە لە نیزامی ئیسلامیدا گوێڕایەڵیی فەرمانڕەوا واجبەو ئەمە دەكەنە پێچەوانەی نیزامە دیموكراتییەكان، میسری ئەوەش دووبارە دەكاتەوە، بەڵام بێئەوەی بیر لە ئەنجامەكانی بكات، كە موسڵمانان كاتێك مافی یاخیبوونو سەرپێچییان هەیە كە فەرمانڕەوا بەحوكمی شەریعەت كاری نەكردو لە ڕێوڕەسمی ئیسلام لایدا(ل٣٤٠).

ئەم مەسەلەیە –كە زۆربەی ئەو كەسانەی لەبارەی نیزامی ئیسلامییەوە دەنووسن بەلایدا تێپەڕدەبن– ئەوەیە ئیسلام مافی شۆڕش داوە بەو گەلەی دەسەڵاتەكەی لە ئیسلام لابدات، نەك تەنها ماف بەڵكو ئەو شۆڕشەی بە ئەرك زانیوە. سەرەتای ئەو شۆڕشەش سەرپێچیكردنە لە فەرمانەكانی فەرمانڕەوایە(لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق)، ئاستێكیش لەوە بەرزتر ئەوەیە میللەت ئەو فەرمانڕەوایە لابەرێت، ئیشكالەكەش لەوەدایە ئەگەر فەرمانڕەواكە كار بە هەندێ یاسای ئیسلامی نەكاتو لەهەمان كاتدا هەندێ ڕێوڕەسمی ئیسلامی جێبەجێ بكات.

ئەم مافەش، واتە مافی شۆڕش، مەسەلەیەكی فیكریی سەدەكانی

ڕابوردووی ڕۆژئاوا بوو بەڵام پێش ئەوە شتێکی زانراو بوو لەجیهانی ئیسلامیدا، تا ئێستاش هیچ دەستوورێك بڕگەیەکی تێدا نییە بۆ مافی شۆڕش دژی حکومەتی ستەمکار.

## پیاوانی ئاینی

میسری دەڵێت کە بەبڕوای ئیخوان نوێنەرانی گەل بریتین لە (أهل الحلو العقد) ئینجا دەڵێت: بەڵام لە دیدی ئیخواندا (أهل الحلو العقد) ئەوانەن کە شارەزای شەریعەتن، واتە پیاوانی ئاین(ل٣٤١).

وەکو هەڵەی هەموو کەسێك شت لەملاو لەولا کۆدەکاتەوە میسری ئاگای لەخۆی نییە کاتێك ئەوە دەڵێت چونکە دوای ١٢ لاپەڕە هەر خۆی قسەکەی حەسەن ئەلبەننا دەهێنێتەوە سەبارەت بە (أهل الحل والعقد) کە لەناو سێ تاقمدا تەنها یەك تاقمیان زاناو موجتەهیدن، لەو لاپەڕەیەشداو تەنها بۆ مەبەستی عەیب دۆزینەوە ئەو دەستنیشانکردنە بە کاری ناچاریو بە ناڕۆشنیی فیکری ناودەبات(میسری، ل٣٥٣، بڕوانە خوارتر). بێگومان میسری ئەوەش نازانێت کە ئەو دەستنیشانکردنە هی خودی بەننا نییە بەڵکو هی فەقیهەکانی ئیسلامە.

جگەلەوەش نەشارەزاییەکی تری میسرییە کە ئەوەی شارەزای شەریعەتە پیاوی ئاینییە. شەریعەت زانستێکە لە زانکۆکاندا دەخوێنرێتو هەر کەسێك شەریعەتی تەواو کردبێت نابێتە پیاوی ئاین، جگە لەوەی کە لە ئیسلامدا پیاوانی ئاین وجوودیان نییەو ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە (زانایان)ـە کە بە کوردی بەهەڵە پێیان دەوترێت زانایانی ئاینی.

دەشبوایە میسری بیزانیایە کە کۆمەڵەی ئیخوان بەهیچ شێوەیەك قبووڵی ئەو پێناسەیە بۆ (أهل الحلو العقد) ناکات چونکە ئەگەر ئەوانە (پیاوانی

ئاینی) بن ئەی سەرکردەکانی ئیخوان، بە بەنناوە چ دەورێکیان دەبێت؟ میسری چونکە لێرەو لەویێ کۆدەکاتەوەو خۆی بەوە ماندوو ناکات ئەو زانیارییانە لەیەك بدات باسی دامەزراندنی ئیخوان لەسەر دەستی بەننا، کە زانراوە ((پیاوی ئاینی)) نییە، دەکات کە لە شەش کەسی یەکەم پێکهاتبوو: شۆفێرێك، باخەوانێك، پاسکیلچییەك (میسری دەڵێت عەرەبانچی)، ئوتووچییەك، دارتاشێك، سەرتاشێك! (ل٢٠٤).

کەواتە دەبێت کۆمەڵەکە، کە تەنها بەشێکی کەمی سەرکردەکانی پیاوانی ئاینین، کۆشش بکات تا لەکۆتاییدا حوکم بداتە پیاوانی ئاینیو خۆی بچێتە ئەولاوە!

میسری کە وەکو زۆر نووسەری بێتواناي تر خۆی بە چەند کلێشەیەك دەبەستێتەوە جارێکی تر خۆی ماندوو نەکردووە لەهەمان کتێب وردبێتەوە کە زانیارییەکانی بە سەقەتی لێوەرگرتووە، واتە کتێبەکەی (دەرپاچو باروت)، تا بزانێت چۆن بەشێکی لاوەکی لەو کتێبەدا هەیە بەم ناونیشانە: ((لە ڕێکخراوێکی شێخەکان بۆ ڕێکخراوێکی ئەفەندییەکان))(باروت، بەرگی یەکەم، ل٥٥–٥٧)و تێیدا دەڵێت لەکۆی١١٢ نوێنەر لە کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵەکە ٥٣ نوێنەریان هی قاهیرەی پایتەخت بوونو لەو ٥٣ یە تەنها ٩ کەسیان سەر بە توێژی ((شێخەکان)) بوون کە لە وەزیفەی ئاینی کاریان دەکرد یان دەرچووی ئەزهەر بوون، نوێنەرەکانی شوێنەکانی تریش بەنیوەیی لەنێوان ئەفەندییەکانو شێخەکان دابەش ببوونو زۆرتریان ئەفەندی بوون، ڕەنگە لەبەر ئەوەش بووبێت ئەندامانی نووسینەگەی گشتیی ڕابەرایەتی، کە لە ئەنجامی ئەو کۆنگرەیە دروست ببوو، لە توێژی ئەفەندییەکان بوون(باروت ل٥٥–٥٦).

## شوورا

میسری دوای ئەوەو لە باسی شوورادا بۆ جار سەدەم دەیسەلمێنێت کە شارەزا نییەو کارەکەی تەنها کۆکردنەوەی زانیارییە کە بەشێکیان بەسەقەتی کۆیان دەکاتەوەو بەوەش ناوەستێت بەڵکو تێکیشیان دەدات.

میسری دەڵێت کە ئیخوان وەك هەر ڕەوتێکی تری مەزهەبی کە شوورا دەکاتە بناغەی دەسەڵات پشت بە دوو ئایەتی (وأمرهم شورى بينهم– الشورى ٣٨)و (وشاورهم في الأمر–آل عمران ١٠٩)، دەبەستێت بەڵام ((گوتارەکە مەودای مێژوویی‌و هۆی هاتنی ئەم دوو دەقە پشتگوێ دەخا ئەو دوو ئایەتە هیچ پەیوەندییەکیان بەمەسەلەی دەسەڵاتەوە نییە)) (ل٣٤٢).

میسری دەڵێت کە ئاشکرایە ئایەتی یەکەم (مەککی)یەو ئەو کاتە ئیسلام بریتی بووە لە باوەڕ نەك دەسەڵاتو دەلالەتێکی ئەخلاقیی هەیە کە موسڵمانان پرس بە یەکتر دەکەن! هیچ فەرمانێکی تێدایە، لەبارەی مێژووشەوە سەرچاوەکان باسیان کردووە کە ئەو ئایەتە لەکاتی شەڕی (بەدر)دا هاتووە(ل٣٤٢).

نەزانی لەم قسانەدا کەڵەکە بووە بۆیە پێویستی بە شیکردنەوەیە:

١– مەرج نییە ئەو ئایەتە فەرمانی تێدا بێت چونکە فەرمانەکە لە بەڵگەی ترەوە وەرگیراوە ئەویش ئایەتی (وشاورهم في الأمر) هەروەك چۆن ئایەتی (والذين هم على صلاتهم يحافظون) کە ئەمە وەکو ئایەتی (وأمرهم شورى بينهم) وەسفێکی ئیماندارانەو فەرمانی تێدا نییە ئینجا ئایا دەتوانین بڵێین نوێژ ئەرك نییە؟

٢– لەلایەك دەڵێت ئایەتی (وأمرهم شورى بينهم) مەککییەو دوایی دەڵێت لە شەڕی (بەدر)دا هاتووە کە هەر کەسێك شتێکی کەمی لەبارەی مێژووی

ئیسلامەوە خوێندبێتەوە دەزانێت شەڕی بەدر لە ماوەی مەککیدا نەبووە، میسری پێویستی بە خوێندنەوەی مێژووش نییە چونکە ئەوەتا هەر خۆی دەلێت کاتی مەککە ئیسلام باوەڕ بووەو هیچ شێوە دەسەڵاتێکی نەبووەو نەیویستووە کەچی دوای کەمتر لە چوار دێڕ دەڵێت ئایەتەکە لە شەڕی بەدردا بووە.. کە دیارە شەڕو پێکدادان لەکاتی نەبوونی دەسەڵاتدا لەمەککەدا نەبووە.

٣– میسری دەنووسێت کە ئایەتی یەکەم لەکاتی شەڕی بەدردا بووە کە گوایە موسڵمانان بەرلەوەی پەلامار بدەن پرسوڕا بەیەکتر دەکەن‌و دووەمیان لەدوای شەڕی (ئوحود)دا بووە کە پێویستە پەیامبەر بەر لە هێرشبردن پرسوڕا بە یاوەران بکات‌و پاشان بڕیار بدا(ل٣٤٢). زانیمان ئایەتی یەکەم مەکەییەو کاتی شەڕی بەدر نەبووە، ئینجا میسری بۆ هەردوو ئایەتەکە باسی هێرش‌و پەلامار دەکات کە ئەوە هەڵەیەکی تەواوە چونکە شەڕی ئوحود بریتی بوو لە هێرشی موشریکەکانی مەککە سەر مەدینە، پێغەمبەریش وای بۆچووبوو لە مەدینەدا بمێنێتەوەو بەرگری بکەن بەڵام بەشێك لە موسڵمانان کە بەشدارییان لەشەڕی بەدردا نەکردبوو ویستیان بچنە دەرەوە، پێغەمبەریش بەناچاری قبووڵی ئەو ڕایەی کرد، دوایش کە موسڵمانان شکان قورئان نەیوت پرسکردن بە موسڵمانان هەڵە بوو و چیتر پرسیان پێ مەکە بەڵکو بەپێچەوانەوە فەرمانی دا پرسیان پێ بکات‌و بەم شێوەیە ڕێگەی لە خەڵکانی ئەو سەردەمەو هەموو سەردەمەکانی تر گرت ئەو ڕووداوە بکەنە بەڵگە لەسەر هەڵەی پرسکردنی فەرمانڕەوا بە موسڵمانان.

یەکێك لە ساختەکارییەکان لە مێژوو قسەکەی میسرییە کە گوایە ئەبو

بەکر بەیعەتی بە شمشێر وەرگرت چونکە نە بنەماڵەی هاشمی کە (عەلیو فاتیمە) ڕێبەرایەتییان دەکرد بەیعەتیان پێنەداو نە زۆربەی ئەنصارییەکان(ل٣٤٣).

لەو ڕووداوەی (السقیفة) ئەنصارییەکان ویستیان خەلیفە لە خۆیان بێت، بەڵام پاش موناقەشەی هەردوو لا ئەنصارییەکان بە خیلافەتی ئەبوبەکر قەناعەتیان کردو بەیعەتیان پێ دا، سەبارەت بە عەلیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ڕوایەتی صەحیح هەیە کە عەلی پاش مردنی فاتیمەی ژنی، کە شەش مانگ دوای ڕووداوەکە بوو، بەیعەتی بە ئەبو بەکر دا، بەڵام ڕوایەتی صەحیحیش هەیە کە عەلی دوای ڕووداوی سەقیفە بەیعەتی بە ئەبو بەکر دا.[٣]

میسری دەیەوێت بنەمای شوورا لای ئیخوان بەدرۆ بخاتەوە گوایە خۆی وتەنی ((خۆناشیێ لە خەلیفەکانی راشدین موسڵمانترو شارەزای شەریعەت بن!)) (ل٣٤٣)، ئینجا دەڵێت ئەوانەشو خەلیفەکانی دوای خۆشیان بە هەڵبژاردن دانەنراون. میسری باسی ئەبوبەکر دەکات کە بە شمشێر بەیعەتی وەرگرت ئینجا عومەر کە ئەبوبەکر داینا بەڵام ئەوەش ناڵێت کە خەڵك دوای ئەو دانانە بەیعەتیان داو دەیانتوانی بەیعەت نەدەن، باسی کارەکەی عومەریش دەکات کە دەستەیەکی دەستنیشان کرد یەکێکیان بکرێتە خەلیفەو لەئەنجامدا عوسمان کرا بە خەلیفە(٣٤٣). بێگومان ئەو ناتوانێت دەرك بەوە بکات کە لەچاو ئاستی گەشەسەندنی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە

---

[3] بۆ ئەمانە بڕوانە موناقەشەیەکی دوورودرێژی ئەو ڕووداوە لەگەڵ ڕیوایەتەکانی تەبەریو ڕیوایەتی تر لە: صحیح تاریخ الطبري، مجلد ٣، الخلافة الراشدة، ط١، ٢٠٠٧، ص١٧-٢٨.

دانانی خەلیفە بەو شێوەیە هەنگاوێکی پێشکەوتووی شوورایە.

میسری کە زۆر لە مێژووی ئیسلام نازانێت ناشزانێت کە دوایی کە عوسمانو عەلی مانەوە عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەوف کە سەرپەرشتیی هەڵبژاردنەکەی دەکرد پرسی بەهەموو کەسێك کردو تەنانەت پرسی بە کچانی پشت پەردەو تەنانەت بە منداڵانیش کردو زۆربەیان عوسمانیان لەلا پەسەندتر بوو.. ئیتر چی لەوە زیاتر بۆ ئەو سەردەمەو بۆ شارستانیی ئیسلامی کە تازە گەشەی دەسەند داوا بکەین؟

میسری بەنەشارەزایی قسە دەکاتو دەنووسێت لە دانانی عومەرو عوسمان هیچ حسابێك بۆ ویستو خواستی تاکەکەسی موسڵمان نەکراوە، میسری دوای ئەوە دێتە سەر عەلیو ناتوانێت یان ناوێرێت بڵێت چۆن بووبە خەلیفەو تەنها دەڵێت نە خەلیفەی پێش خۆی کاندیدی کردو نە وەك عوسمانیش دانرا(ل٣٤٣).

زانیمان عوسمان دانەنرا بەڵام نەمانزانی عەلی چۆن بووە خەلیفە، میسری یان نازانێتو لەخۆیەوە قسە لەسەر مەسەلەی شوورا دەکات یان دەزانێت بەڵام ناوێرێت باسی بکاتو لەجیاتی ئەوە خوێنەر بەو قسەیە دەخەڵەتێنێت.

دوو خاڵی گرنگ هەن باس بکرێن: یەکەمیان شوورا تەنها دانانی خەلیفە نییە بەڵکو بەڕێوەبردنی وڵاتیشە، دووەمیش کەسێك شارەزای مێژووی ئیسلام بێت دەزانێت شوورا بووە خولیایەکی کۆمەڵگەی موسڵمان. ئەوەی موعاویە کوڕی ئەبو سوفیان کردی، بۆ نموونە کە کوڕەکەی دانا، لەسەردڵی موسڵمانان زۆر زەحمەت بوو چونکە لاسایی نیزامی قەیسەری، زیاتریش هی کیسرایی بوو کە نیزامی پادشایەتی بوو نەك خیلافەت. ئەو خولیاییە

تەنانەت تا زۆر درەنگتر بەردەوام بوو. دووریی ئەو نیزامە لە بنەماکانی فەرمانڕەوایی ئیسلام وای کرد خەلیفەی دادپەروەری ئومەوی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کە ساڵی ٩٩ ی کۆچی بووە خەلیفە بڕیار بدات نیزامی شوورا بگەڕێنێتەوەو خەلیفەی دوای خۆی بە شوورا دابنرێت بەڵام ڕانەگەشت ئەوە بکات.

میسری لەسەر نەشارەزایی خۆی بەردەوام دەبێت کاتێك دەڵێت خۆکاندیدکردن بۆ پایەی خیلافەت بە چەند کەسێکی کەمی دەستڕۆیشتووی خاوەن پایەو پلەی کۆمەڵایەتی ڕەوا بینراوە(ل٣٤٣). ئەگەر مەسەلە دەستڕۆیشتن‌و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بێت دەبوایە پیاوە گەورەکانی قوڕەیش یا ئەنصارەکان کاندیدی خیلافەت بوونایە. گوێنەدان بە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی لە قسەکەی عومەردا دەردەکەوێت کە وتبووی ئەگەر (سالم) زیندوو بوایە دەمکردە خەلیفەی دوای خۆم بەمەرجێك سالم (مەولا)ی (حوذەیفە)، واتە کۆیلەی ئەو بوو و ئازادی کردبوو.

میسری تەنها بۆ ئەو مەبەستەی هەیەتی لەخۆیەوە قسە دەکات‌و دەڵێت کە ئەو کاتە شوورا بووە مەسەلەیەکی فیقهی کە غەیری عەرەب هەستیان بە پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆیان کردو ((گەلانی غەیری عەرەب بە مافی خۆیان دەزانی پلەی خیلافەت یاخود ئیمامەتیان پێ ببڕێ‌و هەوڵیان دا چەمکی شوورا بکەنە میکانیزمی وەرگرتنی دەسەڵات))(ل٣٤٤).

میسری جگە لەوەی نموونەی نەهێناوە ئەوەش نازانێت کە بەشێکی ئەوانەی باوەڕیان بە شوورا هەبووە باوەڕشیان وا بوو پێویستە خەلیفە لە قوڕەیش، کە تیرەیەکی عەرەبە، بێت، واتە مەسەلەی شوورا پەیوەندیی بە عەرەبایەتییەوە نییە، جگەلەوەش زووتر خەوارج، کە سنووردارییی

دەسەڵاتی ئیمام لایان گەیشتبووە ئەوەی ئوممەت بۆی هەیە ئیمام لابەرێت بەڵکو بیشیکوژێت، باوەڕیان وا بوو قورەیشێتی (کە میسری دەڵێت ئەبوبەکر کردبوویە مەرجێکی سەرەکی بۆ خیلافەت)[4] و تەنانەت عەرەبایەتی مەرجی خیلافەتو ئیمامەت نییە، زانراویشە بزوتنەوەی خەوارج لەناو عەرەبدا سەریهەڵدا.

میسری زیاترو زیاتر نەشارەزایی خۆی دەسەلمێنێتو قسە لەخۆیەوە دەکات کاتێك دەڵێت کۆمەڵگە خاوەنی پێشینەیەکی مێژوویی نەبوو لە بواری دەسەڵات وەك ئەوەی شارستانیەتی ئەورووپا هەیبوو(ل٣٤٥) ئاوا قسەکردن لەسەر ئەورووپا بەڕەهایی هەڵەیەکی زەقە چونکە ئەو سەردەمە دەوڵەتی ڕۆمایی (ڕۆمای ڕۆژئاوا) نەمابوو، کەلتووری یۆنانی کۆنیش لەبیرکرابوو، ئەوەش کە دەشێت بڵێین شێوازێکی شارستانیی هەڵگرتبوو دەوڵەتی بیزەنتی بوو. میسری سوورە نەشارەزاییەکەیمان زیاتر بۆ بسەلمێنێت کاتێك یەکسەر دوای ڕستەی سەرەوە دەڵێت: ((موجتەهیدانی ئیسلام نەیانتوانی هەندێ مەسەلەی جەوهەری یەکلایی بکەنەوە، بۆ نموونە: مەفهوومی نوێنەرایەتیی گەل یاخود مەفهوومی ڕای زۆربەی خەڵك)). میسری وا دەزانێت ئەوەی ئێستا لەئەورووپا باوە وەك نوێنەرایەتیی گەل یان ڕای زۆربەی خەڵك ئەو سەردەمەش دەگرێتەوە کە باسی دەکات، ئینجا دڵی خۆشە بەو زانیارییەی خۆیو باسی یەکدەنگی (ئیجماع) دەکات کە فیقهی ئیسلامی باسی کردبوو کە یەکدەنگیی دەستەیەك پیاوی ئاینی نەك یەکدەنگیی زۆربەی موسڵمان. ئەو داماوەش هەر خۆیەتی لە بەشەکانی

---

[4] هەرچەندە لە ڕووداوی سەقیفە باسی قورەیش کراوە بەڵام بەپێی سیاقی قسەکان مەبەست لێی موهاجیرەکان بوو.

یەکەمی کتێبەکەیدا باسی ئیجماعی کردووە کەچی لێرەدا نەیزانیوە یان لەبیریچووە (چونکە ئیشەکە تەنها نەقڵکردنە) کە ئیجماع شتێکی ترەووەکو پێناسەکەی دیاری دەکات ئەوەیە هەموو موجتەهیدانی سەردەمێکی دیاریکراو لەسەر مەسەلەیەکی فیقهی یەکدەنگ بن.. ئەوەیە ئیجماع نەك یەکدەنگیی دەستەیەك پیاوی ئاینی وەك خۆی دەڵێت، لەوەش خۆشتر ئەوەیە دەڵێت ئیجماع یەکدەنگیی زۆربەی موسڵمانان نەبووە! کێ باسی ئەوەی کردووەو کێ هەرگیز باس لەشتی وا دەکات کاتێك باسی ئیجماع دەکات؟!

## موناقەشەی فیکری لە ئیسلامدا

بەشێکی باسەکانی سەرەوە لەو بەشە لاوەکییەدان کە تێیدا میسری دەڵێت حەسەن ئەلبەننا هەوڵی دا دەسەڵاتی ئیسلام لەسەر سێ پایەدا دابمەزرێنێتو ئەوەی سەرەوە سەر بە پایەی یەکەمە کە بریتییە لە (دەوڵەتی ئیسلامی)(میسری، ل٣٣٩ بەدواوە). دوو پایەکەی تر بریتین لە (یەکێتیی نەتەوەی ئیسلامە)و (ڕێزگرتن لە ئیرادەی نەتەوەی ئیسلام). لەخوارەوەشدا دەبینین چۆن میسری زۆر لە بابەتەکەی دەردەچێت، بێگومان جکەلە ((بردن))ی سەرچاوەو نەقڵی هەڵەی زانیارییەکانو سەقەتکردنیان.

میسری نامەکانی بەننا دەکاتە سەرچاوە لەکاتێکدا دیارە کە سەرچاوەکەی کتێبێکی ترە کە میسری ناوی بردووە ئەویش (التیارات الاسلامیة وقضیة الدیمقراطیة)(ل١٩٦بەدواوە) کە ئەمەیان ناوی کتێبەکەی بەننای نووسیوەو میسری ((بردوویەتی)). پایەی یەکەمی دەسەڵاتی ئیسلامیش لەڕاستیدا (دەوڵەتی ئیسلامی) نییە، دەشبوایە میسری بەعەقڵ ئەوەی بزانیایە چونکە دەوڵەت خۆی دەسەڵاتە. ڕاستەکەش وەك لەو

کتێبەی ناومان بردووە دەردەکەوێت ئەویش کە پایەی یەکەم لای بەننا (بەرپرسیارێتیی فەرمانڕەوا)یە.[5]

میسری لەسەر پایەی دووەمی دەسەڵاتی ئیسلامی لای بەننا، واتە (یەکێتیی نەتەوەی ئیسلامە)، دەڕوات (ل٣٤٥–٣٥٢)، بەڵام زۆر باسی ئازادیی فیکریو زانیاریو مەعریفە لە ئیسلامدا دەکاتو لە بابەتەکە دەردەچێت، هۆکەشی، وەك بۆی دەچم، ئەوەیە لەژێر کاریگەریی کتێبەکەی (حوسەین موڕووە) دا بووە کاتێك ئەمیان پەیوەندییەکی کردووە لەنێوان خۆپاراستن لە موجادەلەی فیکری لەلایەكو مەسەلەی پاراستنی یەکێتیی کۆمەڵایەتی لەلایەکی تر[6] میسریش زۆر ڕۆیشتووەو مەبەستە سەرەکییەکەی خۆی لەبیرچۆتەوە.

میسری دەڵێت دەقەکانی شەریعەت جیاوازیی کۆمەڵایەتی دەگەڕێننەوە بۆ ویستی خوداو تەئکید لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ژیانی مرۆڤ نەك تەنها عەقڵ ناتوانێت بیگۆڕێت بەڵکو ناشتوانێت لە حیکمەتی ئەو جیاوازییە تێبگاتو تەنانەت ماوەش نادات قسەی لەسەر بکرێ(ل٣٤٨).

دەبێت بەڵگەی میسری چی بێت؟ ئایەتی (انظر كيف فضلنا بعضهم علي بعض وللآخرة أكبر تفضيلا –الأسراء ٢١)، جگەلەوەی ئایەتەکە بەهەڵە نووسراوە چونکە بەم جۆرەیە (وللآخرة أكبر درجات وأكبر تفضيلا) ئەو ئایەتە هیچ لەو واتایانە ناگەیەنێت کە میسری دەیانڵێت. ئایەتەکە پاش چەند ئایەتێك هاتووە کە باسی دوو تاقم دەکەن: ئەوانەی تەنها ژیانی دونیایان دەوێت کە خودا ئەوەندەی خۆی دەیەوێت بەشیان دەداتیو پاشان

[5] د. حيدر ابراهيم على، التيارات الاسلامية وقضية الديمقراطية، ل١٩٦.
[6] حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج١/ ل٣٦٣.

دۆزەخ ئاکامیان دەبێت، ئەوانەش کە ئاخیرەتیان دەوێتو کاری بۆ دەکەن کە خودا سوپاسی ئەو هەوڵەیان دەکات، واتە پاداشتیان دەداتەوە. واتای ئایەتەکە لێرەوە دەردەکەوێت کە سەرەڕای هەڵپەکردن ئەوانە چەند لە دونیادا جیاوازن.. ئێستاش کەمێك خەیاڵاوی نەبین کەس بیر لە کۆمەڵگەیەك ناکاتەوە کە هیچ جیاوازیی تێدا نەبێت .. خۆ ئەگەر قورئان پێچەوانەکەی بوتایە، واتە کۆمەڵگە هیچ جیاوازیی تێدا نەبێت، هەر میسری خۆی مارکسییەتە سەقەتکراوەکەی خۆی لەبیر دەچووەوەو دەیوت قورئان باسی خەیاڵ دەکات. سەرجەم ئایەتەکانی قورئان، فەرموودەکانیشیان بچنە پاڵ، گیانی سلبیو دەستەبەردان لەهەموو شتێك لە مرۆڤدا ناچێنن بەڵکو بەپێچەوانەوە گیانی ئیجابیەتو کارکردنیان تێدا دەچێنن، لەهەمان کاتیشدا ئاگاداری دەکەنەوە هەڵپەی دونیا نەکات.

میسری دیسان نەشارەزاییو ئارەزووی خۆی دەسەلمێنێت کاتێك ئایەتی (فإن حاجوك فقلت اسلمت وجهي لله.. آل عمران-٢٠) دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی دەقی قورئان لەگەڵ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا ناکۆکە(ل٣٤٨). جارێ میسری نەیزانیوە باس لە چی دەکرێت چونکە مشتومڕەکە لێرەدا لەگەڵ مەسیحییەکانە سەبارەت بە مەسیحو موحەممەد کەچی میسری دەڵێت لێرەدا دەق سنوور بۆ عەقڵ دادەنێت بەجۆرێك نەتوانێت مشتومڕ لەسەر هیچ مەسەلەیەك بکات کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە ژیانو گوزەرانی مرۆڤەوە هەبێت.

بەپێیێ میسری لەبەرئەوەی لای ئاین هەموو دیاردەکانی گەردوون لەلایەن هێزێکی میتافیزکییەوە دروستکراون کەواتە ژیانی مرۆڤو بیرکردنەوەی دەباتە سەر خواستی خودا بەم جۆرەش تێگەیشتن لە دونیا سەرچاوەکەی

(وەحی)یەو هەستەکانی مرۆڤ دەوریان نییە لە وشیارکردنەوەی‌و ئەو زانیارییانەی لەڕێگەی ئەم هەستانەوە دەست مرۆڤ دەکەون زانیاریی ڕووکەشین، سەرچاوەی ئەو هەستانەش خودا خۆیەتی‌و بۆیە بە مرۆڤی بەخشیون تا لە گەورەیی خودا دڵنیای بکەنەوە(ل٣٤٨–٣٤٩).

ئەگەر ئەمەی میسری، کە قسەیەکی زۆر کۆنەو دەگەڕێتەوە بۆ وڕێنەکانی پێش دەیان ساڵ لەمەوبەر، ڕاست بێت جیاوازییەکی زۆر لە نێوان مرۆڤو ئاژەڵدا نامێنێت، ئەو کاتەش پێویست بەو ئایەتانەی قورئان ناکات کە باس لە بێباوەڕەکان دەکەن کە دڵیان هەیە (واتە مێشکیان هەیە) بەڵام بیری پێ ناکەنەوە، چاویان هەیە پێی نابینن، گوێیان هەیە پێی نابیستن، ئەوانەش وەکو وڵاخ وان بەڵکو لە وڵاخیش گومڕاترن (أولئك كالأنعام بل هم اضل..).

میسری بەهۆی نەشارەزاییەوە لە ئیسلام ئایەتێك دەهێننەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ زانیارییەکانی لەڕێگەی تەجروبەوە وەردەگرێت: (والله اخرجكم من بطون أمهاتكم لاتعلمون شيئاً وجعل لكم السمع والأبصار والافئدة لعلكم تشكرون–النحل٧٨). دەمێکیش بوو ئەم ئایەتە سەرنجی ڕاکێشابووم چونکە دەتوانین بە بناغەی تیۆری زانین (نظرية المعرفة)[٧]ی ئیسلامیی بزانین کە تێیدا زانین پروسەیەکە مرۆڤ لە ژیانیدا دەستیدەکەوێت، نەك لە

[7] جیاکردنەوەیەك هەیە، هەرچەندە هەمووان نایکەن، لەنێوان دوو شێوەی تیۆری زانین: گنۆزۆلۆجیا کە پەیوەندیی بە تیۆری زانین بەشێوەیەکی گشتی هەیە لەگەڵ ئێپستمۆلۆجیا کە تایبەتە بە تیۆری زانین لە بواری زانستدا. بەڵام میسری کە زاراوەکان بەکاردەهێنێت بێئەوەی بزانێت واتایان چییە زۆر لەو بابەتانەوە دوورە. ئەو تەنانەت نازانێت زاراوەکان باس لە چی دەکەن، ئەوەتا زاراوەی ئێپستمۆلۆجیا لە شتێکدا باس دەکات کە هیچ پەیوەندیی پێوە نییە. ئەو تەنها زاراوەکەی بیستووەو ویستوویەتی بەکاریبهێنێت. میسری کاتێك باسی ئازادیی تاکەکەس دەکات دەنووسێت:

کە تێیدا زانین پروسەیەکە مرۆڤ لە ژیانیدا دەستیدەکەوێت، نەك لە فیترەتیدا هەبن، بێگومان شتی زۆر کەم نەبێت وەکو مەسەلەی هەبوونی خوداو زانینی ئەوەی کە خودا هاوبەشی نییە کە لە فیترەتی مرۆڤدا هەن بەڵام بەهۆی دەوروبەرەوە لە مرۆڤ ون دەبن.

(مورووە) ئەو ئایەتەو ئایەتێکی تر دەهێنێتەوە ئەویش لە بابەتی (تیۆری زانین) لە قورئاندا. مورووە ئاماژە بۆ قسەی لێکۆڵەرەوەیەکی عەرەب دەکاتو پشتگیریی دەکات کە کرۆکی تیۆری زانین لە قورئاندا هەیە[٨]، باسی ئیبنو حەزمیش دەکات کە ئەمیان زانین بە پرۆسەیەکی (ئیکتیسابی)ی زانیبوو[9]، بەڵام مورووە دەڵێت بەپێی ئایەتەکانی قورئان زانینی هەستەوەری بۆ ئەوەیە باوەڕی ئاینی بەهێز بێتو ئەو عەقیدەیە سەقامگیر بکات کە لەڕێگەی وەحییەوە وەرگیراون، لەگەڵ ئەوەشداو بەپێی مورووە بایەخدانی قورئان بە کاری عەقڵ لە بواری بەهێزکردنی باوەڕ، ئەویش لەڕێگەی زانینی هەستەوەری، لە بەرژەوەندیی عەقڵە چونکە ئیقرارە کە پێویستە عەقڵ باوەڕ بەهێز بکات.[١٠]

ئێرە جێگەی ئەوە نییە موناقەشەی بۆچوونەکەی مورووە بکرێت کە ئەوە زیادەڕەوییە بوترێت عەقڵ تەنها بۆ پتەوکردنی باوەڕە. نەخێر ئێمە

---

ئەبستمۆلۆژیای ئیسلام لەڕوانگەی سیستەمی یاساییەوە ناڕوانێتە مەسەلەی ئازادی. چەمکی ئازادی لەو سیستەمە فیکرییەدا بەشێکە لە ئەخلاق بۆیە هەر کە باسی ئازادی دەکرێت موجتەهیدان و نوێنەرانیان بە یاخیبوون لە فەرمانی خوداو بەرەڵایی و کاری ناشیرین تاریفی دەکەن( لاپەڕە ١٠١ پەراوێز).

[8] حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج١/ ل٣٦٨.

[9] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٦٧.

[10] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٦٨.

ناچارین لەگەڵ ئەو نەزانییە سادەیەی لە کتێبەکەی میسریدا هەیە خەریك بین.

وەك وتمان ئایەتی (والله اخرجكم من بطون أمهاتكم..) کرۆکی تیۆری ئیسلامیی زانینی تێدایەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زانین لەڕێگەی ئەزموونەوە دەستدەکەوێت، میسریش کە ئایەتەکانو فەرموودەکانو باسەکانی ئەو بابەتە لە موڕووە وەردەگرێت نازانێت چ باسەو لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەڵێت کە بەپێی ((میتۆدی ئاینی)) مرۆڤ لەسەرەتای هاتنی بۆ سەر ئەم زەوییە خاوەنی ئەم هەستانە بووەو وەکو خۆیان ئیشیان کردووەو ئەوانە بەرهەمی پرۆسەی سروشتیو کۆمەڵایەتیی پێش هەزارانو ملیۆنان ساڵ نین(ل٣٤٩).

نەهامەتییەکی گەورەیە کە پاش مشەخۆری تێنەگەیشتنیش هەبێت. ئایەتەکە ئاشکرا باس لە مرۆڤ دەکات کە لەدایك دەبێتو هیچ زانیارییەکی نییە، کەچی میسری باسەکە دەباتە سەر شتێکی تر کە پەیوەندیی بە زانینەوە نییە، ئەو نەشیتوانیوە بەم قسەیەی قسەکەی پێشووی بسەلمێنێت واتە گوایە بەپێی ئاین وەحی سەرچاوەی زانیارییەکانی مرۆڤە. میسری وەستایی خۆی لە تێنەگەیشتن لە سەرچاوەکانو شێواندنیان دەسەلمێنێت کاتێك دەڵێت قسەکردن لەسەر (( مەسەلەکانی بوونو نەبوون))و دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان مرۆڤ تووشی گومڕایی دەکات(ل٣٤٩–٣٥٠)، کە هەڵەیەکی وا زەق تەنها لە خراپترین چاپی مارکسیەت دەوەشێتەوە، ئەگینا (موڕووە) کە میسری زۆربەی ئەو باسانەی لێوەرگرتووە مارکسی بووە بەڵام خۆی تووشی ئەو فەزاحەتە نەکردووە. ڕاستە ئەو لە سەرەتای ئەو بەشە لاوەکییەدا (ل ٣٥٩بەدواوە) دەڵێت کە زانینی سەرچاوەی جیهانو

مەسەلەکانی بوونو[11] یاساکانی سروشتو کۆمەڵگەو فیکر دەگەڕێنەوە بۆ یەك سەرچاوە کە سەرچاوەی خودابییە (وەحی) نەك کۆئەندامی دەرککردن لای مرۆڤ. موڕووە ئەو قسەیە وەکو (ئەگەر) باس دەکاتو لە لاپەڕەکانی دواتر موناقەشەی ئەو ئەگەرە دەکاتو پەسەندی دەکات، بەڵام دواتر بەو دەرئەنجامەدا دەچێتەوەو باسی تیۆری زانین لە قورئاندا دەکات کە دەورێکی گەورە بە هەستەکان دەدات، هەرچەندە ئەو هەڵوێستەش دەوری عەقڵ دەکاتە بەهێزکەری باوەڕ بەڵام، وەك لەسەرەوەدا ئاماژەمان بۆ کرد، هەڵوێستێکە لە بەرژەوەندیی عەقڵە، بەڵام هێشتا سنوور بۆ عەقڵ هەیە کە نابێت بیانبەزێنێت.

چاوەڕێ ناکەین میسری، کە خوێنەرێکی خراپەو نووسەرێکی خراپترەو لە باسی زۆر لەوە سادەتر تێناگاتو دەیانشێوێنێت، ئەم قسانە کە بەدرێژایی ئەو بەشە لاوەکییە هاتوون پێکەوە کۆبکاتەوەو لێیان تێبگات. ئەو تەنها (ئەگەر)ـەکەی سەرەتای ئەو بەشەی بینیوەو وایزانیوە دواقسەی موڕووەیەو نەقڵی کردووە. بێگومان بەهیچ جۆرێکیش چاوەڕێ ناکەین ڕەخنە لە بۆچوونەکەی موڕووە بگرێتو ئەو سنوورە تەسکە قبووڵ نەکات کە بۆ مەودای کاری عەقڵ لە ئیسلام دایناوە.

ئیسلام کە تەئکیدی لەسەر بیرکردنەوە کردووە بە چەند بابەتێکی کەم نەیبەستۆتەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو مەسەلانە زۆر سنووردارن کە ئیسلام فەرمانی داوە موسڵمان لێیان نەکۆڵێتەوە وەك پرسیاری ((ئەگەر خودا

---

[11] بڕوانە موڕووە لێرەدا باسی (مەسەلەکانی بوون) دەکات، کە بوون سەرەکیترین بابەتی فەلسەفەیە، میسریش کە ئاگای لەو شتانە نییەو ئەو قسەیەی نەقڵ کردووە دەنووسێت (مەسەلەکانی بوونو نەبوون)!

بوونەوەری دروست کردووە ئەی کێ خودای دروستکردووە))، کە پرسیارێکی بێمانایە، هەروەها بیرکردنەوە لەو شتانەی پەیوەندییان بە خوداوە هەیە بێئەوەی مرۆڤ ئەو کەرەستە عەقڵییەی هەبێت کە بەهۆیەوە بتوانێت بگاتە ئەنجامێکی مەنتقی.

لەو بوارە فیکرییەش کە بە (علم الكلام) ناسرابوو، کە عیلم نییە، ئەو باسانە زۆرن کە مرۆڤ ناتوانێت شتێکی یەقینی لەبارەیانەوە بزانێت وەك قسەکردن سەبارەت بە سیفاتەکانی خودا یان قەدەر.. تاد کە موناقەشەکردنی ئەو شتانە زیانی بە بە شارستانیەتی ئیسلامی گەیاند چونکە بەشێکی زۆر لە توانای موسڵمانان لە (قسە)دا سەرف بوو لەجیاتی ئەوەی بۆ زانستی عەمەلی تەرخان بکرێت، ئەورووپاش ئەو پێشکەوتنەی دەستکەوت کاتێك بایەخی بە زانستی تەجریبی دا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لەگەڵ گەشەسەندنی زانست فەلسەفە پاشەکشەی دەکرد چونکە دەردەکەوت کە تەنها ڕێکخستنی وشەیەو بوارێکە هەموو کەسێك دەتوانێت تێیدا هەموو شتێك بڵێت.

بەدەر لەو بوارە تەسکەش زەوییەکی فراوان هەیە مرۆڤ دەتوانێت تێیدا ئەسپی بیرکردنەوە تاو بدات تا دەگاتە ئەوەی خودا خۆی فەرمان بە مرۆڤ دەدات بیر نەك تەنها لە بوونەوەر بکاتەوە بەڵکو بیر لە چۆنێتیی دروستبوونی ئەو بوونەوەرەش بکاتەوە (قل سيروا في الارض فانظروا كيف بدأ الخلق–العنكبوت٢٠)، کە ئەمە تەنها بوونەوەری مردوو ناگرێتەوە وەك دروستبوونی زەوی‌و ئەستێرەو هەسارەکان‌و گەردوون بەگشتی، بەڵکو بوونەوەری زیندووش کە ئاژەڵ‌و مرۆڤ دەگرێتەوە، چونکە ئایەتی پێش ئەوە دەڵێت (أولم يروا كيف يبدئ اللّٰه الخلق ثم يعيده) کە ئەوە هەموو بوونەوەر،

زەویو ئاسمانو مرۆڤ، دەگرێتەوە بەڵکو مێشك زیاتر بۆ مرۆڤ دەچێت، ئینجا یەکسەر دوای (قل سیروا في الارض فانظروا كيف بدأ الخلق) دەڵێت (ثم الله ينشأ النشاة الاخرة) کە دروستبوونەوەی بوونەوەر، بەمرۆڤەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا دەگرێتەوە، بۆیە ئەو وێنەیەی بۆ دروستبوونی ئادەم بڵاوبۆتەوە کە گوایە خودا کە لە خۆڵ یان لە قوڕ وەکو پەیکەر دروستی کردووە ڕاست نییە چونکە ئەگەر وا بێت ناتوانین بیر لە ((دروستبوونی یەکەم)) بکەینەوە.

هەر لەو بەشە لاوەکەییەی کتێبەکەی موڕووەدا باسی موناقەشەی فیکری لە ئیسلامدا کراوە کە ڕێگەی پێنەدرابوو. میسری ئەم دوو ئایەتە لە موڕووە نەقڵ دەکات:

(يسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي وماأوتيتم من العلم إلا قليلاً– الإسراء ٨٥).

(وأن جادلوك فقل الله أعلم بما تعملون –الحج٦٨).

هەروەها ئەو فەرموودەیە لای (موسلم) کە تێیدا صەحابییەك لە پێغەمبەر دەپرسێت ئایا ئەو کارەی دەیکەین بەپێی چارەنووسێکە بۆمان نووسراوەو بڕاوەتەوە یان ئیختیاری خۆمانی تێدایە، پێغەمبەریش پێی دەڵێت چارەنووسەکە دیاریکراوە ئەویش لێی دەپرسێت کەواتە بۆچی کاربکرێت، پێغەمبەریش دەڵێت: کار بکەن چونکە هەموو کەسێك ئەوکارەی بۆ ئاسان کراوە کە بۆی نووسراوە.[١٢]

ئەمە واتای سەرجەمی فەرموودەکەیە. میسری لای خۆیەوە (ل٣٥٠) فەرموودەیەك دەخاتە ناو کەوانەوە بەواتای ئەوەی ئەمە دەقی فەرموودەکەیە لەکاتێکدا ئەوەی نووسیویەتی تێکەڵەیە لە دەقەکەو

---

[12] حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج١/ ل٣٦٠.

لێکدانەوەی مورووە ، سەرباری ئەوەش دەقەکە بەسەقەتی وەردەگێڕێت، ، بۆ نموونە لەجیاتی ((ئایا ئەو کارەی دەیکەین.. تاد)) دەنووسێت: ((ئێستا چی بکەین)).

ئینجا میسری بخەینە ئەو لاوەو لەگەڵ مورووەدا بمێنینەوە. مورووە دوو ئایەتەکەی سەرەوە (لەگەڵ ئایەتی تر)و فەرموودەکە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە جیدالی فیکری لە ئیسلامدا ڕەفز کراوە.

ئەمەش ئەو دەلالەتە نادات کە مورووە ویستبووی چونکە:

١–مەسەلەی ڕووح: ئایەتەکە بە مرۆڤەکانی کاتی هاتنی قورئان دەڵێت زانیاریتان کەمە، بۆیە مەرج نییە ئەو نەزانییە دەبارەی ڕووح تاسەر بمێنێتەوە، ئایا ئەگەر صەحابییەکان لەبارەی زانیارییەکی فەلەکی، کە ئەمڕۆ ئێمە دەیزانین، پرسیاریان بکردایەو وەڵامەکە لەئاستی زانستی سەردەمەکەیان نەبوایەو قورئان بیوتایە زانیاریتان کەمە ... ئایا ئەوە دەبووە بەڵگە لەسەر ئەوەی موناقەشە لە ئیسلامدا حەرامە؟

٢ – لە حاڵەتی ئایەتەکەی ترو لە حاڵەتی تری قورئانیشدا موناقەشەی پێغەمبەر لەگەڵ بێباوەڕان دەگاتە بنبەست چونکە بێباوەڕان سوور دەبن لەسەر هەڵەو ناڕێکیی خۆیان بۆیە یەك ڕێگەچارە دەمێنێتەوە ئەویش گەڕاندنەوەی زانیارییەکە بۆ خودا بۆیە یەکسەر دوای ئەو ئایەتە قورئان دەڵێت: (الله يحكم بينكم يوم القيامة فيما كنتم فيه تختلفون)، واتە لە حاڵەتی بنبەستدا قورئان پێیان دەڵێت لە ڕۆژی قیامەتدا خودا حوکمی خۆی دەدات، نموونەی ئەو ئایەتانەش زۆرن‌و کەس نەیوتووە ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی موناقەشەکە لە ئیسلامدا حەرامە چونکە ئەسڵەن ئەو ئایەتانە لە سیاقی موناقەشەی قورئان لەگەڵ بێباوەڕاندا هاتوون.

٣ – فەرموودەکەش دیسان نابێتە بەڵگە لەسەر حەرامیی موناقەشەکە چونکە باس باسی موناقەشە نییەو پێغەمبەر بەو صەحابییە ناڵێت موناقەشە مەکە. پرسیارەکە لەبارەی یەك شتەوەیە: ئایا ئەگەر من ئەهلی بەهەشت بم بۆچی کاری بۆ بکەم؟ پێغەمبەریش سەرنجی ئەویش‌و ئێمەش بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە گرنگ کارکردن خۆیەتی بۆیە موناقەشە سوودو ئەنجامی نییە (نەك وەك موڕووە لێکیداوەتەوە گوایە بۆتان نییە بپرسن‌و میسری کردوویەتی بە دەقی فەرموودەکە). کاتێکیش حاڵی خراپ دەبووکە جگە لە بڕیاری خودایی بوترایە کارکردن سوودی نییە.

پاش ئەو گەشتە دووروودرێژە بگەڕێمەوە سەر میسری‌و ئەوە دووبارە بکەمەوە کە لەو بەشەدا کە دەبوایە باسی (یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام)ی بکردایە زۆر لەسەر زانین‌و زانیاری ڕۆشت، هۆکەشی ئەوەیە سوودی لە موڕووە وەرگرتووە(بێگومان بەسەقەتی)، بەڵام موڕووە بۆیە باسی ئەو ئایەت‌و فەرموودانەی کردووە چونکە پەیوەستێکی کردووە لە نێوان ئیحراج بوون لە موجادەلەی فیکری لەلایەك‌و مەسەلەی یەکێتیی کۆمەڵایەتی لەلایەکی تر،[١٣] بۆیە هێندە لەسەر مەسەلەی موجادەلەی فیکری ڕۆشتووە بەڵام میسری ئاگای لەو مەبەستەی موڕووە نییە لەبەرئەوە مەسەلەی (زانین)ی خستۆتە ناو باسی یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام بۆ ئەوەی ئەو پەیوەستە دروست بکات کە موڕووە کردوویەتی، ئەمەش یەکێکە لە نموونە زۆرەکانی ئاکامی ((بردن))و نەقڵکردنی کوێرانە کە کەسانی بێبەهرە ڕاهاتوون بیکەن.

میسری بەپێی زانیارییە کەمەکانی لە قورئان دەیەوێت قسە بکات.

---

[13] حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج١/ ل٣٦٣.

ئایەتی (ولا رطب ولا یابس إلا في كتاب مبين– الأنعام٩٣)، دەهێنێتەوە وەك بەڵگە لەسەر ئەوەی گوایە قورئان ئیدیعای ئەوەی كردووە كە هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە ڕوونیكردۆتەوە(ل٣٥١)، بەڵام ئەوەی كە میسری نەیزانیوەو كە بۆی ناكرێت بیزانێت، چونكە مەبەستەكەی لێكۆڵینەوە نییە، ئەوەیە ئەو (كتاب مبين)-ەی هەموو وشكێكو تەڕێكی تێدا تۆماركراوە قورئان نییە بەڵكو باسی ئەوەیە كە خودا ئاگای لە هەموو بوونەوەرەو هەموویانو هەموو ڕووداوەكان لای ئەو نووسراون.[14]

میسری دوای ئەوە ئەو ئایەتانە دەنووسێتەوە كە باس لە ڕێزگرتن لە مرۆڤ دەكەن، ئەو ئایەتەی باسی بەگەڕخستنی ئەو شتانەی ئاسمانەكانو زەوی بۆ مرۆڤ، ئایەتی ڕێزگرتنی خودا لە مرۆڤەكانو بەخشینی شتە خۆشە حەڵاڵەكان پێیان، ئەو ئایەتەی باسی فەرمانی خودا دەكات بۆ مەلائیكەت كە كڕنووش بۆ ئادەم بەرن. میسری دەزانێت مرۆڤ، بەپێی قورئان، هێندە لای خودا پلەی بەرزە كەچی دەپرسێت: دەشێت بەرامبەر چارەنووسێك بۆی نووسراوە بێ ئیرادە بێت؟(ل٣٥١). لەبەرئەوەش وەك وتمان میسری لێكۆڵینەوە ناكات دەیبینین دەڵێت سەرەڕای ئەو ڕێزو پیرۆزییەی بۆ مرۆڤ دانراوە مافی نییە لە نهێنییەكان بكۆڵێتەوەو سروشت كۆنترۆڵ بكات(ل٣٥٢).

كەسێك مەوزووعیانە لەمە بكۆڵێتەوە پێویستە گومان لەوە بكات گوایە مرۆڤ ڕێگەی پێ نەدرابێت بەدوای نهێنییەكاندا بگەڕێت، بەڵام میسری بڕیاری داوە كە ئەو گومانە نەكاتو لەو مەسەلەیە نەكۆڵێتەوە، بەڵكو قسەكانی فڕێدەداتو یەكسەر بازدەداتەوە بۆ باسی ئیخوان.

---

[14] بڕوانە تەفسیری ئیبنو كەثیر، بەرگی ٢، ل١٣٧.

## گەڕانەوە بۆ پایەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی

کەواتە بەکورتی میسری باسی بەننای کردبوو کە هەوڵیدابوو لەسەرسێ پایە دەسەڵاتی ئیسلام بنیات بنێت کە دووەمیان (یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام)ـە، ئێستاش کە باسی ئەو بابەتە دەکات لە باسەکەی دەردەچێتو لە زانینو چارەنووسی مرۆڤ ((دەکۆڵێتەوە))، ئینجا لەکۆتاییی ئەو بەشەداو پاش باسکردنی ئەوەی گوایە ئاین ڕێگە بە مرۆڤ نادات لە نهێنییەکان بکۆڵێتەوەو پێی ڕەوا نابینێت یاساکانی سروشت کۆنترۆڵ بکات.. تاد دەپرسێت ئەی ئیخوان لەسەر چ بنەمایەك دیالۆگو ئاڵوگۆڕکێی بیرورا .. ڕادەگەیەنێت؟ (ل٣٥٢) میسری وەڵام دەداتەوە کە ئیخوان لەلایەك دەیەوێت ڕووبەڕووی دەوڵەتی عەلمانی ببێتەوەو لەلایەك جیابکاتەوە لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامیو دەوڵەتی ئاینیو دەیەوێت بڵێت ئیسلام دینیشەو دونیاشە، بەرهەمهێنانەوەی پرۆژەکەی (محمد عبده)شە کە دەیوت ئیسلام سروشتێکی عەلمانیی هەیەو دەتوانێت بەپیر پەرەسەندنی ژیانەوە بچێت...ئینجا دەڵێت میکانیزمی ئەم پرۆسەیەش دەوڵەتی ئیسلامییە کە گیانی شەریعەت دەپارێزێت(ل٣٥٢).

بەم جۆرە پایەی دووەمی دەسەڵاتی ئیسلام لە دیدی حەسەن ئەلبەننا، واتە یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام، تەواو دەبێتو میسری دەچێتە سەر پایەی سێیەم بەڵام لەکۆتایی پایەی دووەمدا لەبیری دەچێت کە ئەو باس لە (یەکێتیی نەتەوەی ئیسلام) دەکات چونکە ئەو تەنها شتەکان ڕیز دەکات خۆیشی نازانێت چیی نووسیوە، ئەو تەنها دەیویست بڵێت تەرحەکەی ئیخوان سەبارەت بە بیروڕای ئازادو پشتبەستن بە دەستکەوتە زانستییەکانی لەگەڵ دەقدا ناگونجێن، واتە ویستوویەتی تەنها عەیب بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو

عەیب دۆزینەوەیە بۆتە نەخۆشیو ئەو نەخۆشییە نەیهێشتووە بزانێت كە ئەو لە شوێنێكدا باسی ئەوە دەكات كە لەبارەی شتێكی ترەوەیە.

## شەریعەتو هەڵبژاردن

ئینجا میسری دەچێتە سەر پلەی سێیەم (ڕێزگرتن لە ئیرادەی نەتەوەی ئیسلام) (ل٣٥٢ بەدواوە). بەپێی میسری بەننا مافی داوە بە موسڵمانان چاودێریی فەرمانڕەوایان بكەنو لەكاتی پێویستدا لێیان بپێچنەوەو سیستەمی هەڵبژاردنیش گونجاوەو تەعبیر لە ئیرادەی موسڵمان دەكات، ئینجا میسری دەپرسێت: كەواتە ئەمە چ جیاوازییەكی لەگەڵ سیستەمی پەرلەمانیی ڕۆژئاوایی هەیە؟

میسری ئەمە بە قەیرانی فیكری دەزانێت! ئینجا دەڵێت بۆ ئەوەی بەننا خۆی لەم قەیرانە ڕزگار بكات ناچارە مەسەلەكە بەتەواوی یەكلابكاتەوە بەوەی بڵێت مەرج نییە لە ئیسلامدا ڕای تێكڕای نەتەوە وەربگیرێت تاكو لەسەر هەموو شتێك ڕا دەرببڕنو ئەوەندە هەیە لەكاتی ئاساییدا كار بە بیروڕای دەستەیەكی خاوەن دیدو تەجروبە بكرێت(ل٣٥٣).

میسری دەڵێت بەننا بەپێی ئەمە مافی فەتوای تێكەڵ بە مافی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا كردووە(ل٣٥٣) لەكاتێكدا هیچ تێكەڵییەك نییە مەگەر لە بیركردنەوەی میسریدا تێكەڵی هەبێت چونكە بەننا لەو دەقەدا كە میسری هێناویەتی باسی تەنها بڕیاردانی لەسەر مەسەلەكان كردووە، ئەوەی بەننا باسی كردووە هەمان نیزامی پەرلەمانییە كە تێیدا پەرلەمانتارەكان نوێنەری جەماوەرن. میسری كە ئەم شتانە لە مێشكیدا ڕۆشن نین دەڵێت گوایە ئەو ناڕۆشنییە لە فیكری بەننادا ناچاری كردووە پلەو پایەی ئەو كەسانە دەستنیشان بكات كە بە خاوەنی تەجروبە ناویان دەبات كە ئەمانەن:

یەکەم: زاناو موجتەهیدان.

دووەم: ئەوانەی لە کاروباری گشتیدا خاوەن تەجروبەن.

سێیەم: ئەوانەی لەناو خەڵکدا پلەوپایەی سەرۆکو ڕێبەریان هەیە وەك سەرۆکی بنەماڵەو سەرۆك خێڵو عەشیرەتەکان.

تێکەڵییەکە بەردەوام دەبێتو وا دەزانێت بەننا باسی شارەزای نەکردووە بۆیە دەڵێت تێکەڵکردنی سیاسەتی گشتیی دەوڵەت بە جێبەجێکردنی شەریعەت بێ حساب کردن بۆ شارەزایی لەگەڵ هەلومەرجی شارستانیی ئەمڕۆدا نایەتەوە.. ئینجا باسی زاناو موجتەهیدانو مەسەلەکانی پلانو پەرەپێدانی ئابووریو پەروەردە...تاد دەکات.

میسری جگە لەوەی لە قسەکەی بەننا تێنەگەیشتووە نازانێت نیزامی پەرلەمانی چۆنە. لە هەڵبژاردندا نوێنەرانی گەل مەرج نییە شارەزای ئەو بوارانە بن. حزبەکان پاڵێوراوانی خۆیان دەستنیشان دەکەن کە مەرج نییە پسپۆڕ بن، تەنانەت وەزیرەکانیش مەرج نییە پسپۆڕ بن چونکە کارەکەیان ئیدارییەو هەردوو پەرلەمانو حکومەت بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕییە پشت بە پسپۆڕان دەبەستن، هەرگیز حکومەتی پسپۆڕان (یان حکومەتی تەکنۆکرات) نەبۆتە مەرجی حکومەت دیموکراتی یان هەر جۆرێکی تری حکومەت، مەگەر تەنها حکومەتی تەکنۆکرات خۆی.

هەڵەیەکی تێگەیشتن لە پەیوەندیی نێوان شەریعەتو دەوڵەت، هەڵەیەك کە شایەنی ئاستی زانستیی ئەو نووسەرەیە، قسەکەیەتی کە دەڵێت کە شەریعەت سەرچاوەی هەموو شتێك بێتو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە پێشوەخت دەستنیشانی کردبن ئیتر چ پێویست دەکات ئەو کەسانەی یاسا دادەنێنو ئەوانەی جێبەجێی دەکەن لەڕێگای هەڵبژاردنەوە

دەسەڵات وەربگرن؟(ل٣٥٤).

ئەو قسەیە تێنەگەیشتنە لە هەردوو شەریعەتو دەوڵەت چونکە با شەریعەت سەرچاوەی هەموو شتێك بێت بەڵام شەریعەت مرۆڤ نییە خۆی خۆی جێبەجێ بکات. کە شەریعەت پێویستی بە مرۆڤەکان بێت بۆ چەسپاندنی دەستنیشانکردنی ئەو مرۆڤانەش هەر پێویستە، هەر بۆیە چوار خەلیفە راشیدەکە خیلافەتیان گرتەدەست، هەر یەك بەشێوەیەكو هەر بۆیە دەکرێت خەلیفەی نوێ بەشێوەی هەڵبژاردنی نوێ دەستنیشان بکرێت.

ئەو تێگەیشتنەی میسری لە تێگەیشتنی پۆلی یەکەمی خوارج دەچێت کە باوەڕیان وا بوو قورئان دەبێت حوکم بکات لەکاتێکدا صەحابییەکان، کە نزیکتر بوون لە سەرچاوەکانی ئیسلام، دەیانزانی قورئان خۆی بۆ خۆی حوکم ناکات بەڵکو مرۆڤ حوکمی پێ دەکات. خەوارج دروشمی (حوکمێك نییە جگە لە حوکمی خودا)یان بەرزکردەوەو وتیان نابێت پیاوان حوکم بکەن بۆیە عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: ئەمە قسەیەکی ڕاستە بەڵام مەبەستێکی ناڕاستی لەپشتەوەیە، هەروەها لە وەڵامدا وتبووی کە ڕاستە قورئان حاکمە بەڵام پیاوان حوکمی پێدەکەن، میسریش دەڵێت کە شەریعەت حاکم بێت ئیتر چ پێویست دەکات ئەو کەسانە هەڵبژێردرێن کە ئەو یاسایە جێبەجێ دەکەن.

لێرەدا ئەو بەشە پێنجەمە بەو سەقەتییەی خۆیەوە تەواو دەبێتو نۆرەی بەشی شەشەم دێت کە ئەمە ناوونیشانێتی: ((چەمکی دەسەڵات لە تیۆری (حاکمییەت –جاهیلییەت)دا ))و کە دوایەمین بەشی ئەو کتێبەیە(ل٣٥٧–٤٠٢).

## بەشی حەوتەم

# چەمکی جاهیلیەت

## دوایەمین بەشی کتێبەکەی میسری

(ئەبو زەید) بی یان (ئەبو عەمر)..

زانیاریو سەرچاوەکانت

هەر دەبەم

**کەواتە بەشی شەشەمی کتێبەکەی میسری دوایەمین بەشەو لێرەدا، وەك لەهەموو بەشەکانی کتێبەکەیدا، بەئارەزووی خۆی زانیاریو سەرچاوە ((دەبات))و ڕاستییەکان هەڵدەگێڕێتەوەو تێنەگەیشتنی خۆی لە قسەکان دەسەلمێنێت... تاد.**

**لەم بەشە کە وتمان ئەم ناوەی لێناوە ((چەمکی دەسەلات لە تیۆری (حاکمییەت –جاهیلییەت)دا )) دوو یان سێ کتێب وەردەگرین، یەکەمیان بەرهەمێکی یوسف ئەلقەڕەزاوییەو ئەوەی تریان کتێبێکی نەصر حامد ئەبو زەیدە، لەگەڵ ئاماژەیەکیش بۆ کتێبێکی فەهمی هوەیدی. کتێبی یەکەمو سێیەم لە کتێبەکەی ئەبو زەید ((براون))، زانیاریی زۆریش لە ئەبو زەید ((دەبات)) بێئەوەی ناوی بهێنێت. سەرباری ((بردن))ـەکە دڵ چەند حەز بکات ئەو زانیارییانە سەقەتکراون. سەرەتا باسی ئەو ((بردنانە))یە پاشان ئەگەر بەکورتیش بێت باسی چەمکی جاهیلییەتە.**

## (( بردن )) لە کتێبەکەی ئەبو زەید

### ( ١ )

### (( بردن ))ی قسەکانی ئەبو زەید

لاپەڕە ٣٧٦ تا ٣٩٢ ی میسری لە کتێبەکەی دوکتۆر نەصر حامد ئەبو زەید (نقد الخطاب الديني)-ەوە ((براوە)). لاپەڕە ٣٧٦–٣٧٧ چەند قسەیەکن لە کتێبەکەی ئەبو زەیددا دەبینرێن، لەوەش بەدواوە میسری شوێنپێی ئەبو زەید هەڵدەگرێتو تەنانەت تەرتیبی پارەگرافەکانیش وەکو ئەوانەی ئەبو زەیدن. بەدرێژایی ئەو لاپەڕانەش، بەتایبەت لاپەڕە ٣٧٨ تا ٣٩٢، واتە بەدرێژایی ١٥ لاپەڕە، لەکۆی ٢٦ پەراوێز میسری تەنها لە ٣ پەراوێزدا ناوی کتێبەکەی ئەبو زەید دەنووسێتو بۆ ئەوانەی تر هەمان زانیارییەکانی ئەبو زەیدو ناوی سەرچاوەکانی ((دەبات)).[١]

ئەبو زەید نووسیویەتی: ((موسڵمانە یەکەمەکان زۆر جار لەبارەی هەڵوێستێکی دیاریکراوەوە دەیانپرسی ئاخۆ ڕەفتارەکەی پێغەمبەر بە وەحی یان بە ئەزموونو عەقڵ حوکم کرابوو. زۆر جاریش لەگەڵیدا ناڕێك دەبوونو ڕەفتارێکی تریان پێشنیار دەکرد ئەگەر بوارەکە هی عەقڵو ئەزموون بوایە))(لاپەڕە ٧٨).

میسریش دەنووسێت: ((مێژووی ئیسلام لەزۆر شوێنو جێگادا دەیگێڕێتەوە کە: یارانی پەیامبەر هەوڵی زۆریان داوە بزانن ئاخۆ ئەو بڕیارو حوکمانەی ڕۆژانە پەیامبەر دەریدەهێنانو چارەسەری هەندێ ڕووداوی

---

[١] جگەلە دوو پەراوێز کە هی یەك سەرچاوەن ئەویش کتێبی (جند الله ثقافة واخلاقا)ی سەعید حەووا.

کتوپڕی پێ دەکردن، بە (وەحی) بۆی دەهات، یان هەوڵی شەخسی خۆی بووەو عەقڵو تەجرەبەی ژیان فێری کردوون؟ زۆرجاریش ڕێکەوتووە لەگەڵ یاوەرانی هاوبیرو هاو هەڵوێست نەبووە، جار هەبووە بە قسەی کردوونو جاری وابووە ڕای خۆی پێ پەسەند بووە)) (لاپەڕە ٣٧٨).

میسری پێشو دوای قسەکەی سەرەوە کە بینیمان لە ئەبو زەیدی ((دەبات))، واتە زانیارییەکەی ئەو نەقڵ دەکات بێئەوەی ناوی بهێنێت، باسی تیۆری حاکمییەت–جاهیلییەت دەکات کە ماناو مەبەستی دەق دەخاتە چوارچێوەیەکو گوایە تەنها خۆی، واتە تیۆرەکە، لەو دەقە تێگەیشتووە: ((تۆ بڵێی خاوەنی ئەو تێزە هەستی بەوە نەکردبێ کە ئەم بیرکردنەوەیە بەڵگەی ئەوەیە بەناوی خواوە قسە دەکا؟!!))(میسری، ل٣٧٧). ئەبو زەیدیش هەمان شت دەخاتە ڕوو، واتە وتاری ئاینیی هاوچەرخ ئیدیعا دەکات کە ئەو مەبەستە خوداییەی ناو دەقەکان دەستگیر دەکاتو ((..نازانێت کە دەچێتە ناوچەیەکی پڕ دڕکوداڵ ئەویش ناوچەی((قسەکردن بەناوی خوداوە)) کە وتاری ئیسلامی–بەدرێژایی مێژووەکەی جگەلە چەند ئیستسنائێکی کەم کە حسابیان بۆ ناکرێت–خۆی لە سنوورەکانی دووردەخستەوە)) (ئەبو زەید،ل٧٨).

ئەبو زەید ڕەخنە لەو بۆچوونە دەگرێت کە ئیسلام دەکاتە یەك ئیسلام کە تەنها زانایان شارەزاینو ئەمە بەشێکە لە بونیادی ئالیەتێکی فراوانتری ناو وتاری ئاینیو ئەو ئالیەتە ئەو ساکارە نییە وەك لە هەستی ئاینیی ئاساییدا دەردەکەوێت(ل٨١) ، میسریش دەنووسێت: ((نکوڵی کردن لە ڕۆڵی عەقڵ وەك ئەوەی تیۆری حاکمییەت–جاهیلییەت پیادەی دەکا، مەسەلەیەکی ئاسایی نییەو ناکرێ چاوپۆشی لێبکرێ. بۆچی؟..))(ل٣٧٨).

میسری ((بۆچی))یەکەی بەوە وەڵام دەداتەوە کە بناغەی ئەو تیۆرە لەسەر باوەڕی ئاینی ڕاوەستاوەو بەپێی ئاین هێزێك دونیای دروستکردووەو لەئیسلامدا خودا ئەو هێزەیەو پەیدابوونی دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خودا، واتە نەمرۆڤ دەوری هەیەو نەیاسای سروشتیش لە گۆڕێدایە. دەشبێت پیاوانی ئاینی هەڵوێستیان هەبێت لەئاست هەر دیاردەیەكو دەستکەوتێکی زانستی(ل٣٧٨). ئەم قسانەش هەر ئەوانەی ئەبو زەیدن. ئەبو زەید لەهەمان پاراگرافەکەی سەرەوەدا دەنووسێت کە هەموو عەقیدەکان باوەڕیان وایە هۆکارێکی یەکەم یاخود بنەمایەکی یەکەم[٢] هۆی پەیدابوونی جیهانە– کە لەئیسلامدا بریتییە لەخودا–و وتاری ئاینی، نەك عەقیدە، هەموو دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان تەفسیر دەکات بەوەی بۆ هۆکاری یەکەم بیانگەڕێنێتەوە.. ئینجا ئەبو زەید باسی ئیلغاکردنی مرۆڤو ((یاسا)) سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان دەکات، هەروەها قەدەغەکردن (مصادرة)ی هەر زانیارییەك کە وتاری ئاینی یان دەسەڵاتی زانایان پشتیوانیی لێناکەن(ئەبو زەید،ل٨١).

ئەبو زەید باسی وتاری ئاینیی کردووە کە هەموو دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان بۆ هۆکاری یەکەم دەگەڕێنێتەوە، ئینجا دەڵێت کە ئەمە هەر دەبێت سەر لە ((حاکمییەت))ی خودایی، وەك بەرامبەرو دژی حاکمییەتی مرۆڤ، دەربکات:((من شأنه ان يقود بالضرورة الى ((الحاكمية))

[٢] هۆکاری یەکەم (العلة الاولى) یاخود بنەمای یەکەم (المبدأ الاول) زاراوەیەکی فەلسەفییە مەبەست لێی ئەو هۆکارەی پێش هەموو بوونێك بووەو لەوەوە بوونەوەر پەیدا ببوو. وشەی (هۆکار) پڕبەپێستی (علة) نییە چونکە هۆکار هەردوو (علة)و (سبب) دەگرێتەوە. (علة) هۆکارێکی عاقڵەو (سبب) مەرج نییە عاقڵ بێت.

الالهية بوصفها مقابلا ونقيضا لحاكمية البشر)) (ئەبو زەید، ل٨١و ٨٢)، بەڵام بینیمان میسری، کە شتەکانی لە ئەبو زەید ((بردووە))، ڕێگەکەی کورتکردۆتەوەو دەنووسێت کە تیۆری حاکمییەت—جاهیلییەتە کە ئەمە دەکات. بەواتایەکی تر لای ئەبو زەید زنجیرەیەك هەیە: وتاری ئاینی دیاردەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ هۆکاری یەکەم، ئەو گەڕاندنەوەیەش دەمانگەیەنێتە حاکمییەتی خودایی، بەڵام لەبەرئەوەی کاری میسری تەنها ((بردن))و مشەخۆرییە ((بردنەکەی)) سەقەتەو شتەکە پێچەوانە دەکاتەوە: حاکمییەت—جاهیلییەت دیاردەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خودا.[٣] ئەمەش نەك تەنها تێنەگەشتنە لە ئەبو زەید کە میسری دەستی بەسەر قسەکانیدا گرتووەو ناوی نەهێناوە بەڵکو لەڕووی مەنتیقشەوە هەڵەیە.

باقی لاپەڕە ٣٧٨ی میسری بەم جۆر یان بەو جۆر لە ئەبو زەیدەوە ((براون))، تەنانەت تاکە جارێکیش ناوی ئەو پیاوە نەوتراوە. دێڕی دوایەمین و لاپەڕەکەی دوای ئەویش بەهەمان شێوە ((بردن))ێکی ڕووتن. ئەبو زەید باسی وتاری ئاینی دەکات کە چۆن قسەو ئیجتیهادەکانی پێشین (سەلەف)ی کردۆتە ((دەق)) کە جێگەی قسەلەسەرکردن نین، لەوەش زیاتر ئەو وتارە ئالیەتی ((یەکخستنی نێوان فیکرو ئاین)) —کە پێشتر لێی دوابوو— بەکاردەهێنێت، پاشان هەڵوێستی پراگماتی (نەفعی)و ئایدیۆلۆجی لەمەڕ (تُراث) کە ئەوەی ((عەقڵی))یە دووریدەخاتەوەو ئەوەی

---

٣ میسری ناوی حاکمییەت-جاهیلییەت دەبات، هەروەها هۆکاری یەکەم (العلة الاولى) یاخود بنەمای یەکەم (المبدأ الاول) کە وتمان زاراوەیەکی فەلسەفەییە سادە دەکاتەوە بۆ وشەیەکی گشتیی: ((هێزێك))، ئەمانە لەگەڵ هەڵگێڕانەکەی سەرەوە نموونەن لەسەر ئیبداعەکانی میسرییەکەی خۆمان.

((دواکەوتووە)) دادەمەزرێنێت (ئەبو زەید، ل٨٤—٨٥).

میسری ئەو قسانە ((دەبات)): ((.. ئیجتیهادی پیاوانی ئاینیش دەکاتە چەند دەقێکی چەسپاوو نەگۆڕ. بەجۆرێك تێیان دەڕوانیٚ قابیلی قسە لەسەرکردن نین. تا ئەو ڕادەیەی بیروڕاو ئیجتیهادەکان لەناو ئاینەکەدا جۆش دەداو ئاوێتەی یەکتریان دەکا. ئەمە بۆ خۆی بەڵگەی ئەوەیە کە بەیەك چاو ناڕوانێتە کلتووری ئیسلامو بەهەڵوێستێکی پراگماتییانەوە دێتە مەیدانەوەو تەنها ئەو لایەنەی کلتووری ئیسلامی پیٚ پەسەندە کە لە خزمەتی تێزەکەی خۆیدایە.)) (لاپەڕەل٣٧٨—٣٧٩).

میسری یەکسەر دوای ئەوە دەنووسێت: ((ئەو کلتورەش هەمیشە بەدرێژایی مێژوو لە خزمەت دەسەڵاتداران بووەو پایەی سیاسییانی ڕاگرتووە)).. ئەمەش هەر لە ئەبو زەیدەوە ((بردوویەتی)) بەڵام زۆر بە کورتی چونکە ئەبو زەید باسی ئومەوییەکان —نەك خەوارج— دەکات کە حاکمییەتیان بۆ مەبەستی شەرعیەتدان بە حوکمەکەیان بەکارهێنابوو، ئینجا دەڵێت پەنابردن بۆ شێوازی ئومەوی ڕەفتارێکی بەربڵاو بوو لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا لەهەموو شێوازەکانی ئەو وتارە ئاینییەی پشتگیریی نیزامە ناشەرعییەکانی فەرمانڕەوایی کردووە(ل٨٥).

ئەگەر بەکورتیش بێت پێویستە لێرەدا موناقەشەی ئەبو زەید بکەین: ئەبو زەید کاتێك دەڵێت ئومەوییەکان چەمکی حاکمییەتیان هێنایە کایەوە دوو هەڵەی ئەنقەست دەکات بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی تێپەڕێنێت، یەکەمیان ئەوەیە دەڵێت وتاری ئاینیی هاوچەرخ وای بڵاوکردۆتەوە کە خەوارج چەمکی حاکمیەتیان خستە ڕوو، ئەمەش هەڵەیەکی زەقە چونکە چەمکەکە هەبووەو بەدەقی قورئان هاتووەو هەموو موسڵمانان دەیانزانی، ئەوەندە هەیە وشەو

زاراوەی وەك حاكمیەت (ڕاستەكەی دروشمی "لاحكم الا لله" چونكە وشەی حاكمیەت نوێیە) بەكارهات. بەم جۆرە وتاری ئاینیی هاوچەرخ خستنەڕووی چەمكەكە ناخاتە پاڵ خەوارج بەڵكو تێگەیشتنی هەڵەی چەمكەكە دەخاتە پاڵیان، ئەوەش كە عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب پێشتر ڕوونیكردبووەوە: ((ئەو ئەمە قسەیەكی هەقە بەڵام مەبەستێكی ناهەقی لەپشتەوەیە)).

هەڵەیەكی تری ئەنقەستی ئەبو زەید ئەوەیە خستنەڕووی چەمكەكە دەخاتە پاڵ ئومەوییەكان... بەڵام كەی؟ كاتێك موعاویە بەقسەی عەمر كوڕی ئەلعاصی كرد كە پێی وت قورئان بخاتە سەر نووكی ڕمو بەرزیبكاتەوەو داوا بكات قورئان بكرێتە حەكەم لەنێوان دوو لایەنە شەڕكەرەكە(ئەبو زەید، ل٨٥)،[٤] بەڵام ئایا ئەمە بەتەنیا بەسە بۆ ئەوەی موعاویەو حزبەكەی، كە ئەو كاتە دەوڵەت نەبوون، بكرێنە ئەو لایەنەی چەمكەكەی دامەزراند؟ ئایا ئەو ماوە كورتەی نێوان كارەكەی موعاویەو دەعواكەی (لاحكم الا لله)ی ئەو كەسانەی دوایی بوونە خەوارج بەسە بۆ ئەوەی داهێنانەكە بدرێتە پاڵ ئومەوییەكان؟ پاشان كێ لە مێژوونووسە كۆنەكان، ئەگەر باسی وتاری ئاینیی هاوچەرخ نەكەین، وتوویەتی ئومەوییەكان حاكمییەتیان بۆ شەرعیەتدان بە حوكمەكەیان بەكارهێنابوو؟ ڕەنگە خوێنەر بپرسێت: ئەبو زەید ئەمەی بۆ كردووە؟ وەڵامەكەش بە

[4] بەرزنجی، موحەققیقی مێژووی تەبەری، دەڵێت بەرزكردنەوەی قورئان لەسەر ڕم ڕیوایەتێكی صەحیح نییەو ڕاستەكەی ئەوەیە كاتێك كوشتاری ئەهلی شام لە (صیففین) زۆر بوو پەنایان بۆ گردێك برد، عەمریش بە موعاویەی وت: موصحەفێك بۆ عەلی بنێرەو بانگی بكە بۆ كتێبی خودا چونكە ئەوە ڕەت ناكاتەوە(صحیح تاریخ الطبري، مجلد ٣، ل٤٠٨).

بۆچوونی خۆم ئەوەیە ئەبو زەید سەر بەو قوتابخانە فراوانە کۆنەیە کە بایەخی بە بزاڤە سیاسیو فیکرییە نەیارەکان دەدا. ئەو قوتابخانەیە، بەتایبەتی ئەوانەی باوەڕیان بە شۆڕش هەبوو، ستایشی خەوارجی دەکرد کە شۆڕشی چەکدارییان بەرپاکردبوو، ئەوەش بەپێچەوانەی ڕەوتە زاڵەکە کە ملکەچبوون بۆ فەرمانڕەوا، هەتا ئەگەر (فاجر)یش بێت، بە ئەرکێکی ئاینیی دەزانی. ئێستاش ناکرێت ئەبو زەید حاکمیەت، کە لەدژی قسە دەکات، بخاتە پاڵ خەوارج، بۆیە باشترە بخرێتە پاڵ لایەنێك کە لای زۆربەی موسڵمانان قێزەونە ئەویش ئومەوییەکان.

دوای چەند باسێك؛ جەبرو سەبەبییەو غەزالیو ئەشعەرییەت، ئەبو زەید باسی وتاری ئاینیی هاوچەرخ دەکاتو بەتایبەت ناوی سەید قوتب دەبات: باسی ((نەوەی قورئانیی تاك))، واتە نەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر، دەکات کە هەموو زانیارییەکانی تەنها لە قورئان وەرگرتبوو بەڵام دواتر سەرچاوەکان تێکەڵ بوونو فەلسەفەی یۆنانەکانو ئەفسانەی فارسەکان..تاد هاتنە ناوەو (ئەبو زەید، ل٨٦—٨٧). میسریش بەهەمان تەرتیب باسی ئەمانە دەکات: نەوەیەکی دەگمەنو دانسقە کە جگە لە قورئان بیروباوەڕیان لە هیچ سەرچاوەیەکی تر وەرنەگرتووە هەرچەندە شارستانیی تر لەئارادا هەبوون: ڕۆماییەکان، یۆنانەکان، فارسو هیند..(میسری، ل٣٧٩).

هەرچەندە ئەبو زەید یەك جار ناوی کتێبەکەی قوتب (مَعالِم في الطريق) وەك سەرچاوە دەهێنێت بەڵام میسری سێ جار دەینووسێت، هەرچەندە ئەو دەقەی میسریش کە لەبارەی شارستانییەکان دەیهێنێتەوە جیاوازەو دوورودرێژترە بەڵام بەبەڵگەی پاراگرافەکانی پێشەوەو ئەوانەی دواتر دێنو بەبەڵگەی تەرتیبی قسەکانی سەید هیچ گومانێك لەوەدا نامێنێت کە میسری

هەر وەکو شتەکانی تر ئەمانەی لە ئەبو زەید ((بردووە))و هەموو ئیشەکەی چەند زیادکردنێکە لە کتێبەکەی سەید.

ئەبو زەید دوای ئەوە باسی هەڵوێستی هەڵبژاردنکاری پراگماتی لەمەڕ (تُراث) دەکات، میسریش بەهەمان شێوە باسی دەکات ئینجا شتێکی خۆی زیاد دەکات گوایە هەڵوێستی سەید لووتبەرزییەو خۆبەزلزانینەو دەنووسێت: ((بەرجەستەبوونی فیکری شۆفینیزم لەژێر پەردەی ئایندا)). بێئەوەی زۆریش لەسەری بڕۆین هێندە بەسە بڵێین کە ئەوەی کەمێکی لە نووسینەکانی سەید خوێندبێتەوە ئەو ڕاستییە باش دەزانێت کە هیچ شوێنەوارێکی هەستی نەتەوایەتی، چ جای شۆڤینیزم، لە نووسینەکانی سەیددا نییە. ئەگەر زاراوەی (ئومەمیەت)یش بەکاربهێنین سەید تا دوا سنوور ئومەمی بووە، بێگومان لەسەر ئاستی موسڵمانانو جیهانی ئیسلامیدا.

میسری کە موناقەشەی قسەکەی سەیدی کردووە نەیتوانیوە تاسەر قسەی خۆی بخاتە گەڕ، ئەو نەیتوانیوە لە ئەبو زەید وەرنەگرێت. ئەبوزەید کە باسی ئەو هەڵوێستە هەڵبژاردنکارەی کردووە نووسیویەتی: وتاری ئاینی..شانازی بەو لایەنەی توراس دەکات کە ڕەفزی دەکات بەڵام سنووورداری دەکات بە بەراوردکردنی ئەورووپای سەدە ناوەڕاستەکان لەگەڵ شارستانیی موسڵمانان(ئەبو زەید، ل٨٧). میسریش دەنووسێت: تەنها بەراوردی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا بە شارستانیەتی ئیسلام دەکات (میسری، ل٣٨٠). پاش ئەم ((بردن))ـەش قسەیەکی خۆی زیاد دەکات: ((بۆ خۆدزینەوە لە حەقیقەتە مێژووییەکان پرکێشی ناکا چاوێك بە شارستانیەتی ئەورووپای پێش سەدەکانی ناوەڕاستدا بگێڕێتەوەو لەگەڵ

واقیعی کۆمەڵگای عەرەبستانی هەمان سەردەم بەراوردی بکا)).

بەدەر لەوەی ((وتاری ئیسلامی)) شانازی بە سەردەمی جاهیلیەتی عەرەبی ناکاتو ئەمە کاری قەومییە عەرەبەکانە، ئەو قسەیەی میسری کە ئەمجارە هی خۆیەتی نیشانەیە لەسەر ئەوەی چەند شارەزای ((حەقیقەتە مێژووییەکان))ـە (بڕوانە میسری بەردەوام باسی "حەقیقەت" دەکات). ئەگەر بە دابەشکردنە باوەکەی سەردەمەکان قەناعەت بکەین، سەردەمە ناوەڕاستەکانی ئەوروپا لە سەدەی پێنجەمی زاینییەوە دەست پێدەکەن، کەواتە چ شتێکی زۆر عەجایەب پێش ئەوە هەیە؟ سەردەمی فەلسەفەو ئەدەبو هونەری یۆنانیو سەردەمی یاساو ئیدارەی ڕۆمایی سەدان ساڵ پێش ئەوە پووکابووەوە. خۆ ئەگەر بچینە پێش سەردەمە زێڕینەکەی یۆنانو ڕۆما سەردەمانێکی تری دواکەوتوویی دەبینینەوە. جگەلەوەش نیمچە دورگەی عەرەب لەو سەردەمانەدا لە شارستانی خاڵی نەبوو بەتایبەت لە قەراغەکان وەك یەمەن.

(٢)

## ((بردن))ی زانیارییەکانی کتێبەکەی فەهمی هوەیدی

میسری قسەیەکی (هوەیدی)، لە کتێبی (القرآن والسلطان)، دەهێنێتەوە لەبارەی ئەو دروشمەوە کە بەم جۆرەیە: ((پێشتر چەکمان بەدەستەوە بوو لەپێناو سەرکەوتندا یەك جار بەکارمان هێنا پاشان فڕێمانداو ملی ڕێگای شکستمان وەبەرنا... ئەو کاتەی قورئان ئازاد کرا، نەتەوەیش لەگەڵیدا ئازاد دەبێ))[5].

[5] فهمی هوەیدی، القرآن والسلطان، ل ١٨—١٩ لەدەقە ئەسڵییەکەدا: ((پاشان فڕێمانداو ئیتر ملی ڕێگەی شکستو پووکانەوەمان گرتەبەر)).

میسری ئەو کتێبەی (فەهمی هوەیدی)ی نەبینیوەو ئەو دەقەی لە کتێبەکەی (ئەبو زەید) وەرگرتووە چونکە لە لاپەڕەکەی دوای ئەوە میسری قسەیەکی تری هوەیدی دەهێنێتەوە:

میسری دەڵێت: تیۆریستێکی هاوچەرخ پێی وایە دابڕانی ئیسلام لە ژیانی خەڵك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ((بونیادی سیاسیی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلام لاواز بوو، دەلاقە کەوتە ڕیزی موسڵمانانو سیستەمی خیلافەت هەرەسی هێنا))(ل٣٨٥).

تێبینی بکە ئەو دوو دێڕە لەناو کەوانەدا دانراوە(بیرمان بێت میسری بۆ وەرگرتنی دەقاودەق تاکە کەوانە، نەك جووتە کەوانە، بەکاردەهێنێت)و لەپەراوێزدا لاپەڕە(٢٠-٢١)ی ناوی کتێبەکەی هوەیدی وەکو سەرچاوە دەنووسێت.

میسری ئەو قسەیەی هوەیدیی لە ئەبو زەیدەوە وەرگرتووە بەڵام ئەبو زەید نەیخستۆتە ناو جووتە کەوانە بەنیشانەی وەرگرتنی دەقاودەق بەڵکو ئەو دەڵێت کە مەرج نییە وتاری ئاینی بەهەمان ئەو دڵنیاییەی هەیەتی لە چارەسەرەکە کاتی جیابوونەوەی نێوان ئیسلامو واقعی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان یان هۆکانی دەستنیشان بکات، ئەگەر هەندێکیش بیگەڕێننەوە بۆ ماوەی ململانەی نێوان موسڵمانەکان لە ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی کۆچی یان شتێك پێشتر، هەندێکی تر دەیگەڕێننەوە بۆ ئەو لاوازییە گشتییەی تووشی بونیاتی سیاسیی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بوو و بە نەهێشتنی یەکێتییەکەیو نەهێشتنی خودی خیلافەت کۆتایی پێهات(ئەبو زەید، نقد الخطاب الديني، ل٩١).

ئەبو زەید لێرەدا پەراوێزێك دادەنێت دوو سەرچاوەی تێدایە: کتێبێکی

سەید قوتب لەگەڵ کتێبەکەی هوەیدی (لاپەڕە ٢٠ – ٢١).

بەواتایەکی تر ئەبو زەید بەگشتی قسەی کردووەو دەقێکی نەهێناوەتەوە کەچی میسری وا تێگەیشتووە ئەمە دەقە بۆیە ئەو قسەیەی سەرەوەی هوەیدی خستۆتە ناو کەوانەی وەرگرتنی دەقاودەقی قسەو سەرەڕای ئەوەش پێش قسەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە تیۆریستێکی هاوچەرخ پێی وایە دابڕانی ئیسلام... تاد.

((بردنەکە))ش تەواو ئاشکرا دەبێت کاتێك دەبینین ئەبو زەید ئاماژە بۆ لاپەڕە (٢٠ –٢١)ی کتێبەکەی هوەیدی دەکاتو دەشبینین کە ئەو دوو دێڕەی ئەبو زەید نووسیونی کورتکراوەی قسەی دووردرێژی هوەیدین کە لەو دوو لاپەڕەیەدا نووسیویەتی. ئەم دوو دێڕە کورتەش لای میسری بوونەتە قسەیەکی دەقاودەق. خۆ ئەگەر میسری قسەکەی هوەیدیی نەخستایە ناو کەوانە ئەوا ((بردنەکەی)) وەکو ئەوە ئاشکرا دەبوو چونکە ئەگەر هەزار کەس بهێنیو دوو لاپەڕەکەیان بدەیتێو داوایان لێبکەیت هەریەك بۆ خۆی ئەو دوو لاپەڕەیە کورت بکاتەوەو بیانکاتە دوو دێڕ هەرگیز دوو کەس لەو هەزار کەسە نابینی وەکو یەکتر کورتی بکەنەوە، ئینجا چۆن کورتکردنەوەی میسری وەکو ئەوەی ئەبو زەید دەرچوو ئەگەر ((بردن)) نەبێت ؟

(٣)

## قەرەزاوی لەژێر ڕەحمەتی میسری

میسری بەهەمان ئەو چاویلکە ڕەشەی لێوەی تەماشای ئیسلامییەکان دەکات تەماشای یوسف ئەلقەرەزاوی دەکات، بەڵام هەر کەسێك شارەزای کەسایەتیی قەرەزاویو بەرهەمەکانی بێت دەزانێت کە ئەو هەڵوێستە

توندەی کاردانەوەی ئەو حاڵەتەیە کە تووشی موسڵمانان بووەو ئەو تاوانانەی بەرامبەریان دەکرێن، دەنا ئەگەر چەند بەرهەمێکی بخوێنی دەزانی قەرەزاوی یەکێکە لە کەسایەتییە دیارەکانی ڕەوتی ئیسلامیی میانڕەو. بەم جۆرە حوکمدان لەسەری لەڕوانگەی ئەو هەڵوێستەی وەکو حوکمدانە لەسەر ئەو کوردەی لە کاردانەوەی زوڵمی ڕژێمەکان هەڵوێستێکی توندی هەیە.

ئەوەی سەیرترە گوایە میسری پشتی بە بەرهەمێکی قەرەزاوی بەستووە، کە دواتر دەزانین ئەو کتێبەی نەبینیوەو لەڕاستیدا لە کتێبەکەی ئەبو زەید ((بردوویەتی))، کە نموونەیەکە لەسەر مامەڵەی میانڕەوانەی قەرەزاوییە لەگەڵ ڕەوتی ئیسلامیدا.

کتێبەکەی قەرەزاوی ئەم ناوونیشانەی هەیە (الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف). هەر لەو ناوونیشانەوە دیارە کە قەرەزاوی ڕێگەیەکی ناوەڕاستی وەرگرتووە لەنێوان ئینکارکردنی ڕابوونی ئیسلامی لەلایەکەو پەڕگیریی ئیسلامی لەلاکەی تر. قەرەزاوی باسی چەند شتێکی کردووە: تێگەیشتن لە پەڕگیری، ئیسلام بانگەشەی بۆ میانڕەوی کردووەو خەڵکی وریاکردووە لە پەڕگیری کە بە (غلو)، واتە ڕۆچوون، ناوی دەبات، عەیبو دەردەکانی پەڕگیری، هەڵەی کردنی شتێك بە ئەرك لەسەر خەڵك کە خودا نەیکردووە بە ئەرك وەك موحاسەبەکردنی خەڵك لەسەر سوننەتەکان وەك چۆن واجب بن و هەر دەبێت بکرێن لەکاتێك سوننەتەکان واجب نین، توندوەرگرتنی شتەکان لەو شوێنەی شیاوی توندی نییە، مامەڵەی زبر لەگەڵ خەڵکدا، گومانی خراپ بە خەڵك، دەردی تەکفیر...

قەرەزاوی باس لە هۆکارەکانی پەڕگیری دەکات وەك خراپ تێگەیشتن لە ئاینو زیادەڕەوی لە حەرامکردنو کەمتەرخەمیی زانایان ئیسلامو هێرش

بردنە سەر موسڵمانانو پەنابردنە بەر ئەشکەنجەو گرتن لەلایەن ڕژێمەکانەوە..تاد.

قەرەزاوی پاش ئەوە لە چارەسەر دەدوێت: پێویستە فەرمانڕەوایان بگەڕێنەوە بۆ شەرعی خودا، وەکو باوکو برا مامەڵە لەگەڵ ئەو گەنجانە بکەن، زیادەڕەوی نەکرێت لە وێنەکێشانی پەرگیری، دابینکردنی کەشوهەوایەکی ئازادانە.. ئەرکی لاوانی ئەو کۆمەڵە ئیسلامییانەش چەند شتێکن: تێگەشتن لە ئیسلام، شارەزابوون لە حوکمە شەرعییەکانو جیاوازیی نێوان ئیجتیهادەکانی زانایانی ئیسلام، لەبەرچاوگرتنی وزەعی خەڵکو عوزرەکانیان... کتێبەکەش بە فەسڵی (ئامۆژگاریی باوکانە بۆ لاوانی ئیسلام) کۆتایی پێدێت: ڕێز بگرن لە پسپۆڕی، شت لەوانە وەربگرن کە لەخوداترسنو میانڕەون، شتەکان بۆ خەڵك ئاسان بکەنو لەسەریان قورسیان مەکەن، بانگی خەڵك بە حیکمەتو چاکە بکەن، لەبارەی ئەدەبی بانگەوازو حیوار، لە ئاسمانی خەونەکان وەرنەخوارەوەو ژیان لەگەڵ خەڵکیدا بەرنەسەر، گومانی چاکە بە موسڵمانان بەرن.

ئەمە بەکورتی ئەو کتێبەیە کە گوایە سەرچاوەیەکە میسری چەند شتێکی لێوەرگرتووە، با بشزانین ئەمە تا چەند ڕاستەو چەند لەو دەقانەی ناو کتێبەکە تێگەیشتووە.

میسری قسەیەکی قەرەزاوی دەهێنێتەوەو بەئارەزووی خۆی تەفسیری دەکات. میسری (ل٣٨٢) نووسیویەتی کە وتاری ئیسلامی لەهەموو شتێکدا خۆی بەڕاست دەزانێتو دیالۆگو لێکۆڵینەوەی قبووڵ نییە، بگرە تەکفیریشی دەکات، تەنانەت قبووڵی نییە باس لەکۆمەڵە ئیسلامییەکان بکرێت، ئەوەتا یەکێك لە دیارترین ڕێبەری ئەو ڕەوتە، واتە قەرەزاوی،

دەڵێت: ((خەڵكێكی زۆری نەزانو داخ لەدڵو بەكرێگیراو و بێئەوەی شارەزاییەكیان هەبێ، بێئەوەی بگەڕێنەوە بۆ قورئان كەوتنە نووسینو قسەكردن. لە حاڵێكی وادا دەبوو قەڵەمی زانایانی ئیسلام بكەوێتە كارو مەسەلەكان روونبكەنەوەو بەشاراوەیی نەیانهێڵنەوە. لەدەرگاوە دێنە ژوورەوەو حەق لەشوێنی خۆیدا دابنێنەوە..)) (الصحوة الاسلامية..)[٦] .

ئەو قسەیەی قەرەزاوی لەگەڵ ((تێگەیشتنەكەی)) میسری بەراورد بكە دەبینی قەرەزاوی نە كەسی تەكفیر كردووەو نە حیوارو لێكۆڵینەوەی رەتكردۆتەوە.. قەرەزاوی وەك لە دەقی قسەكە دیارە باس لەوانە دەكات كە لەخۆیانەوە یان بەنیازێكی خراپەوە باسیان لەو دیاردەیە كردووە (واتە پەرگیریی ئاینی)، قسەكردنیش لەسەر ئەو مەسەلەیە ئەركی زانایانە..تاد. ئێستاش ئەمە بەسەر كتێبەكەی میسریدا بچەسپێنە: ئەگەر بڵێین میسری لەخۆیەوە شتی نووسیوەو خۆیشی نەیزانیوە باسی چی دەكاتو لەجیاتی ئەوەی خۆی سەرچاوەكان بخوێنێتەوە چووە ناوەكانیانو زانیارییەكانیان لە سەرچاوەی تر ((بردووە)) بۆ ئەوەی خوێنەر بخەڵەتێنێت گوایە زیاتر لە سەد سەرچاوەی بەكارهیناوە.. ئەگەر ئەمانەو لەمانە زیاتر بڵێین ئایا ئەمە دەبێتە تەكفیركردنو قبووڵنەكردنی حیوارو لێكۆڵینەوەو لەم جۆرە لیستەی تاوانباركردن؟

---

[6] میسری لاپەڕە ٢٢٤ دەنووسێت بەڵام راستەكەی ئەوەیە كە دەقەكە لە پێشەكیی كتێبەكەدایە (چاپی لای خۆم: لاپەڕە ١٦). واش دیارە ئەو ((بردنە))ی لێ تێكچووەو ئەو لاپەڕە (٢٢٤)ـەی لە پەراوێزێكی تری ئەبو زەید ((بردووە)) كە باسی شتێكی تر دەكات، بڕوانە ئەبو زەید، ل٨٠، پەراوێزی ١٣.

هەرچەندە میسری ئەو دەقەی خستۆتە ناو کەوانەوەو[٧] دەبوایە دەقاودەق قسەکەی وەربگێڕایە بەڵام هەڵەی لە وەرگێڕانەکە کردووە. قەرەزاوی نووسیویەتی ((بغیر علم و لاهدی ولا کتاب منیر)) کە ئەمە تەعبیرێکە لە قورئانەوە وەرگیراوە: ((ومن الناس من یجادل فی الله بغیر علم ولاهدی ولاکتاب منیر–لقمان:٢٠))، ئەو ((کتاب منیر))ـەی ئەم ئایەتەش بەواتای هەر کتێبێك لەلایەن خوداوە هاتبێت، ئەو تەعبیرەش چۆتە ناو ئەدەبییاتی عەرەبی بۆ ئەو کەسانەی لەخۆیانەوە موجادلەکە لە ئاین دەکەن، کەچی میسری قسەکەی قەرەزاوی کە ئەمەی تێدا هاتووە وا وەردەگێڕێت ((بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ قورئان)) !

سەربارى ئەوەش میسری ئەو قسەیەی قەرەزاویی، لەگەڵ ناوی سەرچاوەکە لە کتێبەکەی ئەبو زەید ((بردووە)) (ئەبو زەید، ل٨٩)، ئەویش وەکو قسەکانی تری. ئەو تەنانەت تێگەیشتنە سەقەتەکەی ئەبو زەیدیش ((دەبات)) کە گوایە، بەپێی ئەو نموونەیە، وتاری ئیسلامی خۆی بە خاوەنی ڕاستیی ڕەها دەزانێت..تاد.

میسری (لاپەڕە ٣٨٢) پاش قسەکەی سەرەوە دەڵێت کە مەبەستی ئەو تیۆریستە[٨] ئەوەیە نابێت جگەلە پیاوانی ئاینی کەس قسە لەسەر گرووپە ئیسلامییەکان بکات، بە قۆرخکردنی نووسینو رادەربڕینیش ناوەستێتو دەڵێت پێویستە پشتگیریيان بکرێت: ((زۆر شت لەوانەی لایەنە توندڕەوەکان

---

[7] وتمان میسری بۆ وەرگرتنی دەقی کەوانەی تاك بەکاردەهێنێت کە ڕاستەکەی جووتەکەوانەیە.

[8] واتە (مونەززیر) ئەو وشەیە لە چاپی یەکەمدا هاتووە، بەڵام لەچاپی دووەمدا تایپێستەکە بەهەڵە نووسیویەتی (تیرۆریست).

حەرامیان کردوون ڕاستن‌و لەگەڵ ئیجتیهادی چەندین زانای ئەم سەردەمە یەکدەگرنەوەو لەگەڵ شەرع‌و فیقهی ئیسلام‌و کەلتووری ئیسلامیدا دەگونجێن–الصحوة الاسلامیة، ل٤٢، چاپی لای خۆم ل٣٨)).

میسری ئەو قسەیەی گوایە قەرەزاوی نووسیویەتی لە ئەبو زەیدی ((بردووە))(ل٨٩–٩٠)، بەڵام سەرباری سەقەتیی تێگەیشتنی ئەبو زەید، میسرییەکەی خۆمان لەوەش سەقەتتری کردووە، ئەمەش، بە کەمێك درێژی، مەبەستی قەرەزاوییە:

قەرەزاوی دەڵێت کە ئینساف نییە بە کەسێك بڵێین پەرگیرە تەنها لەبەر ئەوەی بۆچوونێکی فیقهیی توندی وەرگرتووە کە بە ڕاستتری دەزانێت ئەگەرچیش کەسێکی تر بە لاوازی بزانێت، چونکە ئەو کەسە تەنها لەو شتە بەرپرسە کە خۆی باوەڕی پێیەتی، نموونەی ئەو پیاوەش دەهێنێتەوە کە بەو بۆچوونە فیقهییە کار دەکات کە ریشتاشین حەرامە، ئینجا دەپرسێت: ئایا مافی ئێمەیە ڕێگری لەو هەڵبژاردنە بگرین تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ بۆچوونی ئێمەدا ناگونجێت، بەتایبەتی کە ئەمە شتێکە پەیوەندیی هەیە بە ژیانی خۆیەوە نەك ژیانی کەسانی تر(الصحوة الاسلامیة، ل٣٦–٣٧). قەرەزاوی لەمەوە دەڵێت کە زۆر لەو شتانەی وەکو رەخنە لەو کەسانە دەگیرێن کە بە پەرگیر ناویان دەبەین ئەسڵێکی شەرعییان لە فیقه و توراسماندا هەیەو هەندێك لە زانا هاوچەرخەکان باوەڕیان پێ هێناون‌و خەڵکیان بۆ بانگ کردوون(ل٣٨)، لەکۆتاییشدا دەڵێت: لەمەوە ناتوانین موسڵمانێك بە پەرگیر بزانین تەنها لەبەرئەوەی بۆچوونێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە کە پێی وایە خودا زیاتر پێی خۆشەو بۆ ئاخیرەتی سەلامەتترە، مافی ئێمەش نییە زۆری لێبکەین تا واز لەو باوەڕەی بهێنێت‌و تەنها بۆمان

هەیە بە حیکمەت بانگی بکەینو بە شێوازی چاك گفتوگۆی لەگەڵدا بکەینو بە بەڵگە قەناعەتی پێبکەین..(ل،٣ —٣٩).

ئەبو زەید دەگاتە ئەوەی کە قەرەزاوی بەو بۆچوونەی هەموو بۆچوونە توندەکان لە خانەی پەرگیری دەکاتە دەرەوە گوایە پەرگیر نین. با جارێکی تر وەرگێرانە کوردییەکەی میسری بنووسینەوە تا بزانین ئەمیان تا چەند سەقەت تێگەیشتووە:

قەرەزاوی بە قۆرخکردنی نووسینو رادەربڕینیش ناوەستێتو دەڵێت پێویستە پشتگیرییان بکرێت: ((زۆر شت لەوانەی لایەنە توندڕەوەکان حەرامیان کردوون ڕاستنو لەگەڵ ئیجتیهادی چەندین زانای ئەم سەردەمە یەکدەگرنەوەو لەگەڵ شەرعو فیقهی ئیسلامو کەلتووری ئیسلامیدا دەگونجێن)).

میسری یەکسەر دوای ئەوە ((دەگاتە)) ئەنجامی قسەکانی قەرەزاوی:

کەواتە توندرەوی شتێك نییە لەگەڵ گوتاری ئاینی ناکۆك بێو ناشێ تەکفیرکردنی کۆمەڵگەو دەسەڵاتی سیاسی بە توندڕەوی لە قەڵەم بدرێ(میسری،ل٣٨٣). بزانە میسری چۆن بازێکی گەورەی داوە! جگەلەو بازە نامەنتقییە کتێبەکەی قەرەزاوی خۆی ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە چونکە ئەو باسی تەکفیری کۆمەڵگەی نەکردووە بەڵکو کتێبەکەی دژ بەو تەکفیرەیە، ئەو تەنانەت بەلای تەکفیری دەسەڵاتیشدا نەچووە.

میسری کە ئەنجامەکەی سەرەوەی خۆی دەڵێت دەپرسێت ((بۆچی؟)) وەڵامەکەشمان پێ دەڵێت:((چونکە بناغەی باوەڕی ئاینی ئەوەیە ئیماندار بگاتە ئەو باوەڕەی خۆی لەسەر حەقەو بەرامبەرەکەی لەسەر ناحەق— الصحوة الاسلامية، ل ٤٠، چاپی لای خۆم: ل٣٦)).

ئەوەی خۆشە ئەوەیە بینیمان میسری قسە سەقەتکراوەکەی سەرەوەی قەرەزاویی لە ئەبو زەید ((بردبوو))، دوایی بینیمان یەکسەر دەگاتە ئەنجامێکی ((مەزن)) ئێستاش دەڵێت: ((چونکە بناغەی باوەڕی ئاینی..تاد)) کە ئەمەی دیسان لە ئەبو زەید ((بردووە))، ئەی کەواتە ئەو ئەنجامە ((مەزنە))ی تر، واتە ((توندڕەوی شتێك نییە لەگەڵ گوتاری ئاینی ناکۆك بێو ناشێ تەکفیرکردنی کۆمەڵگەو دەسەڵاتی سیاسی بە توندڕەوی لەقەڵەم بدرێ))، لە کێ ((براوە))؟ ئەمەی لە ئەبو زەید نەبردووە بەڵکو ئیبداعی خۆیەتی، ئەمەش نموونەیەکی ترە لەسەر ئەو ساتانەی تێیاندا میسری ئیبداع دەکات بەڵام ئیبداعەکە سەقەتییەکی گەورەیە، بۆیەش بینیمان ئەو بازەی دابووی چەند گەورە بوو.

پێویستە بۆ دوایین قسەی قەرەزاوی واز لە میسری بهێنینو بە ئەبو زەیدەوە خەریك بین کە ئەو قسەیەی قەرەزاویی نەقڵکردووە.

قەرەزاوی دەڵێت کە باوەڕدار تەنها بەوە نابێتە پەرگیر ئەگەر خۆی لەسەر هەق بزانێتو بەرامبەرەکەی لەسەر ناهەق. باوەڕدار لە هەلومەرجی تایبەتدا دەبێتە پەرگیر، وەك زۆرکردن لە بەرامبەر بۆ باوەڕهێنان. خۆ ئەگەر بەو مەنتیقەی ئەبو زەید (میسریش دوای ئەو و لەو زیاتر) قایل بین دەبێت ئەویش پەرگیر بێت چونکە لای ئەو بەرامبەرەکەی، کە کەسی ئیسلامییە، بە ناهەق دەزانێت، بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە ئەبو زەید ئەو کاتە پەرگیرە کە دوژمنایەتیی کوێرانەی ئیسلامییەکان بکاتو دوژمنایەتییەکەی سنوورەکانی بوهتانکردنو هەڵگێڕانەوەی ڕاستییەکانو باسکردنی تەنها لایەنە خراپەکانو گەورەکردنی عەیبەکان.. تێپەڕێنێت تا بگاتە بانگەشەی ڕیشەکێشکردنی ئیسلامییەکان بەهەموو شێوەو ڕەوتو کۆمەڵەکانیانەوە..

ئەمجارە واز لە ئەبو زەید دەهێنین.. میسری پەڕگیرە چونکە هەموو ئەوانە دەکات.

میسری (لاپەڕە ٣٨٣بەدواوە) باس لەوە دەکات کە وتاری ئیسلامی هەمیشە ((جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە گوایە ئاینی ئیسلام لە ژیانی خەڵك جیاکراوەتەوە))، واتە کۆمەڵگەی موسڵمان لە ئاینی ئیسلام دوورخراوەتەوە، باسی فەهمی هوەیدیو سەید قوتب دەکات، ئینجا (ل٣٨٥) قسەیەکی قەرەزاوی دەهێنێتەوە کە دابڕانی ئیسلام لە ژیانی خەڵك دەخاتە ئەستۆی (کەمال ئەتاتورك)و ڕای وایە ((ئیلغاکردنی خیلافەت ئاینی ئیسلامی لە ژیانی خەڵك دەرهاوردو دەوڵەتەکەی ژێروزەبەر کرد)).

میسری ناوی کتێبەکەی قەرەزاویو ئەوەی هوەیدیو کتێبێکی سەید وەك سەرچاوەی حەڵاڵی خۆی دەنووسێتو بەزەییەك بەرامبەر ئەبو زەید نانوێنێتو ناوی کتێبەکەی نانووسێت کە ئەو قسانەو ناوی ئەو سەرچاوانەو ژمارەی لاپەڕەکانی لە کتێبەکەی ئەو ((بردووە))و تەنها ژمارەی لاپەڕەی کتێبەکەی سەیدی گۆڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ چاپەکەی لای خۆی بگونجێت.

ئەبو زەید قسەکەی قەرەزاویی لە باسی باوەڕی وتاری ئاینی سەبارەت بە جیابوونەوەی واقعو ئاین لە یەکتر هێناوەتەوە، قەرەزاویش ئەوەی لەو بەشەدا باس کردووە کە تێیدا باس لە هۆیەکی پەڕگیریی کراوە ئەویش دوورکەوتنەوەی لاوانی دیندار لە زانایانی ئیسلام. هۆی ئەوەش، بەپێی قەرەزاوی، ئەوەیە هەندێك لەو زانایانە کەوتوونەتە تەڵەی پشتگیریکردنی دەسەڵاتو زۆرێك لە ((زانا گەورەکان)) بوونە ئامێری دەستی سوڵتان، هەندێکی تریش فەرموودە دانراوەکان دەکەنە بەڵگەو فەرموودە صەحیحەکان ڕەتدەکەنەوە... قەرەزاوی باسی ئەوانە دەکات کە چۆن

بەپێی ئارەزووی سوڵتان قسە دەکەن، چەند نموونەیەکیش دەهێنێتەوە، یەکێکیان زانایەکی ئاینیی دیارە کە پاش گرتنی زۆر لە ئەندامانی گرووپە ئیسلامییەکان لە میسر وتبووی: ئەگەر ئەوانە بەڕاستی پشتیوانی ئیسلام بوونایەو ئەگەر خودا بەکارەکانیان ڕازی بوایە ئاوا پشتی بەرنەدەدان.. قەرەزاویش ئەمە رەتدەکاتەوەو دەڵێت سەرکەوتن مەرجی هەیەو لەوانەیە خاوەن هەق هەموو ئەو مەرجانە دەستگیر نەکات لەکاتێکدا دەکرێت هەلگری ناهەق ئەو مەرجانەی دەستکەوتبێت بۆیە بۆ ماوەیەکی زۆر یان کەم سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، دەشڵێت: لەم سەردەمەماندا زۆرمان بینی بانگەشەیان بۆ ناهەق دەکرد بەڵام سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، یان ئەوانەی بانگەشیان بۆ هەق دەکرد بەڵام ژێرکەوتن.. ئینجا بۆ وەڵامی ئەو ((زانایە)) ئەتاتورك بە نموونە دەهێنێتەوە: ((کێمان لەوە بێئاگایە کە چۆن گەلی موسڵمانی تورك بە سەرکردایەتیی زاناکانی لەژێر ستەمکاریی ئەتاتوركو تاقمەکەی پلیشێنرا؟ چۆنیش ئیسلام لە خانەی خیلافەت دەرکراو عەلمانیەتی نادینی بە ئاگرو ئاسن بەسەر گەلی تورکیادا سەپێنرا؟ کام لا لەسەر هەق بوو و کامیان لەسەر ناهەق؟)).

بەکورتی قەرەزاوی لە سیاقی باسی دوورکەوتنەوەی لاوان لە زانایانی ئاینی باسی ئەتاتورکی هێناوەتە پێشەوە ئەویش بۆ مەسەلەی سەرکەوتنی ناهەق بەڵام ئەبو زەید لە سیاقی باسی جیابوونەوە لەنێوان واقعو ئاین ئەو قسەیەی قەرەزاوی دەهێنێتەوە، میسریش لەبەرئەوەی سوودی لە ئەبو زەید وەرگرتووە لەهەمان سیاقی ئەودا قسەکەی قەرەزاوی نەقڵ دەکات بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئاماژە بۆ ئەبو زەید بکات پاڵێکی پێوە ناوەو ناوی کتێبەکەی قەرەزاویی وەك سەرچاوەی خۆی نووسیوە.

ناوی کتێبەکەی قەرەزاوی دوایین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی میسری ناو و زانیارییو ژمارەی لاپەڕەکانی ئەو کتێبەی لە ئەبو زەید ((بردووە)). ناوی دروستی کتێبەکە ئەمەیە: (الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف) کە دەربڕی فیکرەکەی قەرەزاوییە، بەڵام ئەبو زەید ناوی کتێبەکە وا دەنووسێت: (الصحوة الاسلامية بين الجمود والتطرف)، ئەویش دوو جار؛ جارێك لەناواخنی باسەکانیدا(ل٣٥)و جارێکی تر لە پەراوێزێکدا (ل٨٠)، واتە وشەی (الجمود)ی لەجیاتی (الجحود) نووسیوەو ئەو وشەیە پەیوەندیی نییە بە مەبەستی کتێبەکە، کە وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا وتبووم، قەرەزاوی ویستبووی رێگەیەکی ناوەڕاستی وەربگرێت لەنێوان ئەوانەی ڕابوونی ئیسلامی قبووڵ ناکەن (الجحود)و پەڕگیریی ئیسلامی (التطرف). هەرچەندە چاپێکی بازرگانیی کتێبەکە ناوی (الجمود)ی نووسیوە، بەڵام مەبەستی کتێبەکە ئەو وشەیە قبووڵ ناکات، هەروەها لیستی بەرهەمەکانی قەرەزاوی لە کتێبی تردا هەیەو ناوە دروستەکەی تێدایە، جگەلە پێشەکییەکەی (عمر عبيد حسنة) کە بۆ کتێبەکەی نووسیوە(ل١٩).

(٤)

## ئەمانەش چەند ((بردن))ی دیکەن لە ئەبو زەید

١- ئەبو زەید باسی گوناهی کۆلۆنیالی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی دەکات(ئەبو زەید، ل٩٢) میسریش قسەکە ((دەبات))، بەڵام وەك ((دەبیات)) ڕەحمی پێ ناکاتو سەقەتی دەکات : وتاری ئاینی باس لە کۆلۆنیالکردنی جیهانی ئیسلامی دەکاتو ئۆباڵی داگیرکردنەکە دەخاتە ئەستۆی ڕۆژئاوا(میسری، ل٣٨٥) وەك دەشبینن ئەبو زەید باسی داگیرکردن ناکات بەڵکو دواکەوتن. ئەبو زەید دەڵێت دواکەوتنی جیهانی

ئیسلامی کاری کۆڵۆنیالیزمی ئەورووپیی ئاسان کرد کە ئەو دواکەوتنە قوولّترو هەمیشەیی بێت(ل٩٢) میسریش باسی دواکەوتوویی ڕژێمەکە دەکات، ئەویش بۆ ئەوەی دوای ئەوە بلّێت: ئەو ڕژێمە (واتە خیلافەت) بە ئاگرو ئاسن حوکمی گەلانی موسلّمانی نەکردایەو ئەگەر نەبوایە بە بەشێك لە پرۆژەی ئابووریی ڕۆژئاوا دەولّەتە کۆلّۆنیالیستەکانیش نەیاندەتوانی بەو ئاسانییە بێنە ناوەوە.. تاد.

دوای تاوانبارکردنی موسلّمانان ئیلهام بەسەر میسریدا دادەبەزێتو دەپرسێت: بۆچی گەلانی ئەفریقیاو ئەمەریکای لاتین و باشووری ڕۆژهەلاّتی ئاسیا توانیان خۆیان ڕزگار بکەنو ((پاشان لەبواری ئابووریو کۆمەلاّیەتیو ڕۆشنبیردا هەنگاوی بەرچاو بهاوێژن؟)) (ل٣٨٥) بەلاّم بەداخەوە ئەو ئیلهامە سوودی نییە چونکە هەر کەسێك زانیاریی زیاتری لەبارەی جیهانەوە لە میسری هەبێت دەپرسێت: کامەتا ئەو ولاّتانەی ئەفەریقیا کە هەنگاوی بەرچاویان ناوە لەو بوارانەدا؟ ئایا هەموو ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی باشووری ئاسیاو ئەمەریکای لاتین ئەو هەنگاوانەیان داوە؟ ئیلهامی میسری پێی دەلّێت: جیهانی ئیسلامی دواکەوتووە ئەویش سەری بۆ دەلەقێنێتو دەلّێت: کەواتە هەموو جیهان پیشکەوتووە.. ئەمەش یەکێك لەو دەرفەتانەی میسری قسەی خەلّکی تر ((نابات)) بەلّکو قسەی خۆی دەلّێتو ئەو ئیبداعە دەکات کە دەبێتە بەلّگەی تر لەسەر نەشارەزاییەکەی.

٢-ئەبو زەید دوایی بەیاننامەیەکی ڕێکخراوی جیهادی ئیسلامی لە فەلەستیندا دەهێنێتەوە کە گوایە هێنانی دەولّەتی نەتەوەیی بۆ جیهانی ئیسلامی بە گوناهی ئەورووپای زانیوە(ل٩٣)، میسریش شوێن پێی هەلّدەگرێت بەلاّم دەقی بەیاننامەکە ناهێنێت(ل٣٨٥-٣٨٦)و لەجیاتی ئەوە

دەقی قسەیەکی سەید قوتب دەنووسێت(ل٣٨٦) کە ئەبو زەید نووسیویەتی(ل٩٤).

تێبینیش بکە کە ئەبو زەید قسەکەی سەیدی بە تێکەڵی هێناوە، بەشێك بە نەقڵکردنی واتاو بەشێك نەقڵی دەقاودەقی ناو جووتە کەوانە، بەڵام میسری هەموویان وەکو نەقڵکردنی دەقاودەق دەنووسێتەوە، لەوەش خراپتر ئەوەیە ئەبو زەید قسەکەی سەید دەنووسێت کەوا شارستانییەتی ئیسلامی هەرگیز ((عەرەبی نەبووە بەڵکو هەمیشە ئیسلامی بووە، قەتیش ناسیۆنالیست نەبووە بەڵکو عەقیدی بووە)) (ل٩٤) بەڵام میسری کە خۆیمان لێ دەکاتە کوردێکی ناسیۆنالیست ئەم قسەیەی سەیدی پشتگوێ خستووە.

دواتێبینیش لەم خاڵەدا ئەوەیە ئەو دەقەی بەیاننامەکەی سەرەوە باسی دەوڵەتی نەتەوەیی ناکات بەڵکو باسی لەتکردنی جیهانی ئیسلامیی کردووە، نموونەکانیشی بریتین لەو شەڕانەی لە وڵاتانی عەرەب ڕوویان داوە، بەم جۆرەش ئەوەی ئەبو زەید وتوویەتی بریتییە لە تێگەیشتنی خۆی. بەڵام میسری لەو تێگەیشتنەوە دوورە چونکە پاش دەقەکەی سەید سەبارەت بە نەبوونی پەیوەندیی ڕەگەزو خاك ورەنگ.. لە ئیسلامدا دەڵێت کە سەید هەمان تێزی فیکری شۆڤێنیزمی عەرەب دەجوێتەوە(٣٨٦). بێگومان کەسێك عەرەبایەتیو نێونەتەوەیی ئیسلامی تێکەڵ بەیەك بکات لە شتی تر بێئاگاترە. وڵاتی (میسر) لەژێر دروشمی پاراستنی یەکێتیی خاکی عەرەب دەستی نەخستۆتە چارەنووسی گەلی باشووری سودان وەك ئیلهامەکەی میسری پێی دەڵێت(٣٨٦) چونکە بەهۆی ناکۆکیی نێوان حکومەتی میسرو حکومەتی سودان بەتایبەت لەکاتی دەستڕۆشتنی (حەسەن ئەلتورابی) میسر لە مەسەلەی کێشەی باشوور پشتی سوودانی بەردابوو، هەروەها کێشەی

گەلی بیابانی ڕۆژئاوا کێشەی نێوان مەغریبی عەرەبیو بیابانی ناعەرەبی نییە چونکە گەلی بیابانی رۆژئاوا عەرەبن! دوای باسکردنی جەزائیریش (میسری نەیتوانیوە ناوی ئەو گەلە بلێت کە جەزائیر ئامادە نییە دەدان بە مافە نەتەوایەتییەکانیدا بنێت) دێتە سەر کوردستانو ((کوردایەتییە))کەی خۆیمان پێ دەفرۆشێت.

٣-دیارە لە لاپەڕە ٩٥ تا ١٠٢ ی کتێبەکەی ئەبو زەید بەکەڵکی میسری نایەت بۆیە دەبینین دوای ئەوە باز بۆ لاپەڕە ١٠٣ بەدواوە دەدات (بڕوانە ل٣٨٦ی کتێبەکەی میسری).

لێرەدا میسری قسەیەکی ئەبو زەید وەردەگرێت کە باس لە بۆچوونێکی ئەبولئەعلای مەودوودی دەکات لەبارەی دزەکردنی بێباوەڕیو شیرك یان بتپەرەستیو سۆفیگەری بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکان پاش سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان، دواییش هاتنی فەلسەفەو ئەدەبو زانستی یۆنانیو ئێرانیو هیندی(....) هەروەها هونەرەکانی سەماو مۆسیقاو وێنەکێشان...(ئەبو زەید ١٠٣-١٠٤).

لێرەدا میسری ناوی کتێبەکەی ئەبو زەید دەنووسێتو ناوی کتێبەکەی مەودوودی ((نابات)).. بۆچی؟ چونکە ئەبو زەید کە ئەم قسانەی مەودوودی نەقڵ دەکات ناوی سەرچاوەیەك بەزمانی عەرەبی نانووسێت تا میسری ((بیبات)) بەڵکو سەرچاوەکە لێرەدا ئینگلیزییە، لێرەشدا پێویستە شایەتیی ((ئەمانەت))ی بۆ بدەین چونکە زۆر نووسەری لای خۆمان هەن چەند وشەیەکی ئینگلیزی دەزانن کەچی سڵ لەوە ناکەنەوە ناوی سەرچاوەی ئینگلیزی لە نووسەری تر ((ببەن))... ئینگلیزی؟!! نەخێر! هەیانە بەوە ناوەستێو ناوی سەرچاوەی فەڕەنسیو ئەڵمانی.. تاد ((دەبەن)).

بگەڕێمەوە بۆ ((بەهرەکانی)) میسری. نموونەیەك لەسەر ئەو بەهرانە زیادکردنی (سینەما)یە بۆ هونەرە کۆنەکان. ئەوەتا باس لە هونەرەکانی سەردەمە کۆنەکان (هی پێش زیاتر لە هەزار ساڵ) کراوە: سەماو مۆسیقاو وێنەکێشان کەچی میسری سینەمایان بۆ زیاد دەکاتو دەڵێت: (هونەرو سینەماو مۆزیكو وێنەکێشان)!!(ل٣٨٧).

## چەمکی جاهیلییەت

بگەڕێینەوە سەر باسی دروشمی (ئیسلام چارەسەرە)و ئەو باوەڕەی کە ئیسلام لە ژیانی خەڵك دوورخراوەتەوە کە وتمان لە ئەبو زەیدی ((بردووە))و لێرەدا خێرێکی بەم نەکردووەو ناوی کتێبەکەی نەنووسیوە.

یەکێك لەوانەی لەبارەی دوورخستنەوەی ئیسلام لە ژیان دواون (سەید قوتب)ـە، خۆ ئەگەر سەیدیش نەبێتو هەرکەسێکی ترو بەچاوێکی بێلایەنانە تەماشای واقعی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بکات دەبینێت زۆر شت لەو کۆمەڵگانە دەکرێن لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێن، شتیش هەن دەبوایە بکرانایە بەڵام فەرامۆش کراون. بێگومان ئەوە هەموو کۆمەڵگەکە ناگرێتەوە بەڵکو بەشێکی، هەروەها هەر کۆمەڵگەیەك بەئەندازەیەك ئەو دیاردەیەی تێدا دەبینرێت.

ئەو دوورکەوتنەوەیەش کۆمەڵگە موسڵمانەکان ناگەیەنێتە ڕادەی کافربوون. ڕاستە خەڵکانێکی کافر لەو کۆمەڵگانە پەیدا بوون، بەڵام باسەکە لەبارەی چەند تاکێکەوە نییە، چەند ئەو تاکانە زۆر بن، بەڵکو دەبێت حساب بۆ زۆرینە بکرێت ئەو کاتە بڕیار بدرێت کە تێکڕای کۆمەڵگە کافر بووە.

لەلایەکی ترەوە مەرج نییە (جاهلیەت) کە سەید قوتب وەکو تایبەتییەك

**لکاندوویەتی بە کۆمەڵگەی بەشەریی هاوچەرخەوە یەکسان بێت بە کوفر[9]، کۆمەڵگە هەن کافرن لەبەرئەوەی بەپێی ئیسلام کافرن، بەڵام کە باس دێتە سەر کۆمەڵگەکانی جیهانی ئیسلامی چەمکی جاهلیەت واتا فراوانەکەی خۆی نیشان دەدات چونکە جاهلیەت تەنها لە عەقیدەدا نییە[10]، تەنانەت لەعەقیدەشدا هەموو کاتێك مرۆڤ ناگەیەنێتە کافر بوون. جاهلیەت**

[9] سەید بەڕوونی لەنێوان کۆمەڵگەی ئیسلامیو جاهیلی جیادەکاتەوە بەجۆرێك بەئاسانی دەتوانین کۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەکان بە جاهیلی بزانین. سەید دەنووسێت: ئیسلام تەنها دوو جۆر کۆمەڵگە دەناسێت: ئیسلامیو جاهیلی یەکەمیان ئەوەی ئیسلام تێیدا لەڕووی عەقیدەو پەرستنو شەریعەتو نیزامو ڕەوشتو سلووکەوە دەچەسپێنرێت، جاهیلیش ئەوەیە کە تێیدا ئیسلام ناچەسپێنرێت نە لەڕووی عەقیدەو بۆچوونو نە لەڕووی بەهاو پێوانەکانی ئیسلام، نیزامەکەیو یاساکانی، ڕەوشتیو سلووکی.... ئەوەش کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی نییە کە خەڵکی تێیدا خۆیان بە موسڵمان ناوبنێنو هەتا نوێژو ڕووژوو و حەجیش بکەن، لەکاتێکدا شەریعەتی ئیسلام یاسای ئەو کۆمەڵگەیە نییە(معالم فی الطریق، ل١١٦). لە (في ظلال القران) یشداو لە باسی ئایەتی (افحکم الجاهلیة یبغون -المائدة: ٥٠) باسی جاهیلییەت دەکات کە فەرمانڕەوایی مرۆڤەکانە بەسەر مرۆڤەکانو کۆیلایەتیی مرۆڤەکانە بۆ مرۆڤەکانو دەرچوونە لە کۆیلایەتی بۆ خودا (بەرگی ٢، ل٩٠٤) . دواییش کاتێك باسی ئەوانە دەکات کە پاساو بۆ حوکمنەکردن بە شەریعەتی خودا دەهێننەوە دەڵێت: غەیری موسڵمان دەتوانێت هەرچییەك بێت بیڵێت بەڵام موسڵمان یان ئەوانەی ئیددیعای موسڵمانێتی دەکەن چۆن دەتوانن شتی وا بڵێنو لەدوای ئەوە لەسەر شتێکی ئیسلام بێننەوە یان شتێکی ئیسلامییان بۆ بهێنێتەوە (ل٩٠٥)، لێرەشدا دەڵێت جاهیلییەت ماوەیەکی دیاریکراوی زەمەن نییە بەڵکو وەزعێکە یان حاڵەتێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوە کە تەسەورێکی دیاریکراوی بۆ ژیان هەیە (بەرگی ٥ ، تەفسیری سوورەتی ئەلئەحزاب، ل٢٨٦١).

[10] پێشتر وتمان عەقیدە بەو واتایەی لە زانستە ئیسلامییەکاندا هەیە چەند بنەمایەکی فیکرییە پەیوەندییان بە ئیمانەوە هەیە. عەقیدە ئەو بنەمایانەیە کە باس لە هەبوونیو وەحدانیەتی خوداو سیفاتەکانیو لە قەدەرو ئیمانبوونو کافربوون...تاد دەکەن.

لەڕەفتاریشدا هەیە، هەر لەبەرئەوەشە پێغەمبەر بە (ئەبو ذەر)ی وت تۆ کەسێکیت جاهیلیەتت تێدایە[11]، نە(سەید)یشو نە ئەوانەش کە ئاستی فیکرییان لە سەید کەمترە لەوە بێئاگا نین کە (ئەبو ذەر) صەحابییەکی بەرزی خاوەن باوەڕێکی پتەو بوو، ئەی بۆچی پێی وتبوو جاهلیەتێکت تێدایە؟ بڕوانە پێغەمبەر نەیوتووە تۆ کەسێکی جاهیلیت چونکە وەسفی جاهیلی ئەو کاتە یەکسان بووە بە سەردەمی پێش ئیسلام، هەروەها حاڵی غەیری موسڵمانەکان لەو سەردەمەدا، لەجیاتی ئەوەش ئەبو ذەر لەو کاتەدا بەشێکی جاهلیەتی تێدا بووە، هۆکەشی ئەوە بوو قسەی بە دایکی پیاوێك وتبوو کە عەرەب نەبوو. بەم جۆرەش هەر کەسێك ئەگەر ئیمانداری تەواویش بێت هەر کاتێك قسە بە کەسێك بڵێت لەبەر ڕەگەز یان ڕەنگ یان زمانی...کارێکی جاهیلیی کردووەو ئەخلاقێکی جاهیلیی تێدایە، فەرموودەش هەیە باسی هەبوونو مانەوەی هەندێك کاری جاهیلییەت لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا وەك شانازی کردن بە ڕەچەڵەکو تانەدان لە ڕەچەڵەکی خەڵکی ترو شیوەنکردن بۆ مردوو..تاد[12] بەهەمان شێوەش کوفری بەشەکی (جوزئی) هەیە وەك ئەو فەرموودەیەی دوو گوناھ لەوەی سەرەوە، تانەدان لە ڕەچەڵەکی خەڵکو شیوەنکردن بۆ مردوو بە کاری کوفر ناودەبات.

ئەوەم وت کە دروشمی (ئیسلام چارەسەرە) پەیوەندیی بەو فیکرەوەیە هەیە کە ئیسلام لەژیانی کۆمەڵگە دوورخراوەتەوە، میسری دەست بەسەر پرسیارەکانی (نەصر حامد ئەبو زەید)دا دەگرێتو دەیانکاتە پرسیاری

---

[11] صحيح البخاری، ٨، كتاب الادب، باب ماينهی من السباب واللعان.

[12] بڕوانە صەحیحی موسلم، ٣، كتاب الجنائز، باب التشديد فی النياحة، بەشێوەیەکی نزیکیش لەوە لە صەحیحی بوخاری، ج٥، باب ايام الجاهلية، القسامة في الجاهلية.

خۆیو دەڵێت: ئەو وتارە لەخۆی ناپرسێت ئەو دابڕانەی کۆمەڵگە لە ئیسلام کەیو چۆن ڕووی دا؟ میسری وەڵامنەدانەوەی ئەو پرسیارە بە خۆدزینەوە دەزانێت گوایە ئەو وتارە دەیەوێت لە موسڵمانانی بگەیەنێت گوایە ((ئیرادەی خواوەند بەو ئەنجامەی گەیاندوون))، شتێکیش ئیرادەی خوای لەسەر بێت لەتوانای ئادەمیزاد بەدەرەو بەم جۆرە ئەو وتارە دەیەوێت کۆمەڵگەی موسڵمان بەداخراوی بهێڵێتەوە(ل٣٨٣ –٣٨٤).

باس لە بیری ئوسووڵی ئیسلامی بەتایبەتی بیری ئیسلامیی هاوچەرخ باس لەوە نییە کە داڕمان ئیرادەی خودای لەسەرەو مرۆڤ لەتوانایدا نییە گۆڕانکاری بکات، خۆ ئەگەر ئەوە بوایە ئیسلامییەکان سووچەکانی مزگەوتیان دەگرتو تەنانەت تێکەڵیی خەڵکیشیان نەدەکرد، کێشەی نەیارانی ئیسلامییەکانیش ئەوەیە ئەو ئیسلامییانە سووچی مزگەوتەکانیان جێهێشتووەو کەوتوونەتە کار: بانگەواز، کاری سیاسی، ڕێکخستنی نهێنی، کاری ڕاگەیاندن، تا دەگاتە جیهاد.. تا دەشگاتە تێکدانی واتای جیهاد ئەویش کاتێك ئەو جیهادە لە بنەما ئیسلامییەکانی دووردەخرێتەوەو لەجیاتی جەنگین (القتال) دەبێتە هاوتایەك بۆ کوشتن (القتل)و کوشتن دیارترین پەیامی ئەو کەسەیە جیهادی شێواندووە.

هەروەکو بەشەکانی تری کتێبەکەی میسری هەڵەی زۆر ماوە باس بکرێت بەڵام ناچارین لەبەر کورتبڕی ئەم چەند خاڵە کەمەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:

١–میسری کە خۆی وەکو پارێزەرێکی دیموکراسی پیشان دەدات نەشارەزایی خۆی لەبارەیەوە دەسەلمێنێت کاتێك دەڵێت، ئەوەش ئەگەر بەڕاستی قسەی خۆی بێتو لە خەڵکی تر ئاوا بەسەقەتی وەرینەگرتبێت، کە

هەندێ تیۆریستی ئیسلامی هەوڵیان داوە دیموكراسی لە لیبڕالیزم جیابكەنەوە، ئەوانیش باش ئەو حەقیقەتە دەزانن كە سیستەمی دیموكراتی لە مناڵدانی لیبڕالیزم گەورە بووەو گەشەی كردووەو چاوی بە دونیا هەڵهێنهاوە(ل٣٩٨). میسری هەبوونی دیموكراسیو لیبڕالیەت پێكەوە دەبینێتو وا دەزانێت كۆنیش هەر وا بووە، بەڵكو لیبڕالیەت بە دایكی دیموكراسی دەزانێت، ئەوەش كە میسری نەیزانیوە ئەوەیە دیموكراسی، چ ئەوەی یۆنانی كۆنو چ زیندووبوونەوەی لە ئەوروپا، دوور بووە لە لیبڕالیەت. دیموكراسی تەركیزی لەسەر كۆمەڵگە دەكرد لەكاتێكدا لیبڕالیەت بەو تەئكیدەی لەسەر تاكو بەو سنوورەی بۆ دەوڵەتی دادەنێت داهێنانێكی نوێیە. لیبڕالیەت تەنانەت لە سەدەی بیستیشدا نەیتوانی ببێتە مۆركی تایبەتی دیموكراسی بەجۆرێك هەردوو ئاوێتەی یەكتر بن چونكە ئەوەیان تەنها قوتابخانەیەك بوو، قوتابخانەكەی تر كە تەئكیدی لەسەر كۆمەڵگەو لەسەر دەوری دەوڵەت بەتایبەتی لە بواری ئابووری دەكرد لە سەدەی بیستدا بەهێز بوو، ئەوە لە ئەمەریكا پاش قەیرانە ئابوورییە گەورەكەی ١٩٢٩ ڕووی دا،[13] لە وڵاتانی تری ڕۆژئاواش ڕووی داو تەنانەت حزبی لیبڕالی لە بەریتانیا، كە یەكێك بوو لە دوو حزبە سەرەكییەكەی وڵات، بۆ پلەی سێیەم پاشەكشەی كرد.

٢ —لاپەڕەیەك پێش ئەوە میسری بە یەكجار دوو سەرچاوە ((دەبات)) ئەوانیش: یەكەمیان كتێبەكەی بودۆنو بوریكۆ: المعجم النقدی لعلم الاجتماعو دووەمیان كتێبەكەی میشێل متیاس، هیجل والدیمقراطیة،

---

[13] قەیرانە ئابوورییەكەی ئێستای جیهانو بەتایبەتی ئەمەریكاو ئەورووپا جارێكی تر مەسەلەی دەوری دەوڵەتی هێناوەتە پێشەوە.

هەردووکیشیانو هەموو باسەکەش لە کتێبەکەی د. حەیدەر ئیبراهیم عەلییەوە، التيارات الاسلامية وقضية الديمقراطية(ل١٥٠–١٥١)، وەرگیراون، سەرباری ئەوەش ((بردن))ـەکانیشی هەڵەن. سەرچاوەی یەکەم باسی چەمکی ئازادی لە دیموکراسیی لیبڕاڵی دەکات کە ئەوەیە دەسەڵات خۆی نەخنێتە بازنەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان ((مەگەر لەبەر بەرژەوەندیی گشتی کە بەشەرعی ددانی پیا نراوە ئەویش بەشێوەیەکی ناڕێك))، مەبەستی ئەو دوو نووسەرەش ئەوەیە ناڕێکییەك هەیە لەو بەکارهێنانەی پاساوی بەرژەوەندیی گشتی لە باوەڕێك ڕێگە بە دەسەڵات نادات خۆی بخنێتە بەرژەوەندیی تایبەت.[14] میسری بەشێوەیەکی عەشایەری مامەڵە لەگەڵ ئەو قسەیە دەکاتو باسی چەمکی ئازادی بەڕەهایی دەکات (نەك لە دیموکراسیی لیبڕاڵی)و باسی ئەو ناڕێکییەش ناکات، سەرباری ئەوە ئەو لێرەدا مارکسیەتی خۆی لەبیر دەچێت چونکە ئەمەیان بێت یان ئەوەیان بێت باس باسی ئازادییە لە فیکری ((بورجوزای))دا.

باسی هێگلیش بەهەمان شێوە لە کتێبەکەی دکتۆر حەیدەرەوە ((براوە))و دیسان سەقەتکراوە چونکە ئازادی لای ئەو ئەوەیە مرۆڤ بەفعل بەرژەوەندییە سەرەکییەکی بەجێبهێنێت بەوەی کە بوونەوەرێکی

14 دوو نووسەرەکە باسی دیموکراسیی لیبڕاڵیەت دەکەن کە ئەولەویەت بە ئازادی دەدات: بودۆنو بوریکۆ، المعجم النقدي لعلم الاجتماع، ل٣١١، لە ناواخنی ئەو باسەش کە بۆ دیموکراسی تەرخان کراوە باسی جیاوازیی نێوان دیموکراسیی ڕادیکاڵو دیموکراسیی لیبڕاڵ دەکەن. هەبوونی ئەو تەعبیرە، واتە بەشێوەیەکی ناڕێك (بصورة متناقضة)و تێگەیشتن لە مەبەستەکەی، کە دوو نووسەرەکە بەپێویستیان نەزانیوە ڕوونی بکەنەوە، پێویستی بە شارەزایی لە دیموکراسیو قوتابخانەکانیو بۆچوونەکان لەبارەیەوە، کە میسری زۆر لەو شارەزاییە بێبەشو داماوە.

مرۆڤانەیە[15]، بەڵام میسری دیسان بەعەشایەری قسەکە وەردەگرێت: بەپێی هێگل بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەحەقیقەت ئازاد بێت دەبێت بەکردەوە وەك بنیادەم بەرژەوەندییەکانی بەڕێوە ببا (میسری، ل٣٩٧)، واتە مەسەلەکەی بچووك کردەوە بۆ ((بەرژەوەندی)) کە دەچێتە سەر بەرژەوەندیی ئابووری نەك بەجێهێنانی بوونی مرۆڤانە.

خۆش ئەوەیە میسری دوای ئەوە دەنووسێت: ((مەبەستم لە نوسینەوەی ئەم تێزەی هیگڵ ئەوەیە بڵێم..))، نەك تەنها ئەوەش بەڵکو ئەو مەبەستەی کە لە بەشی زۆی ئەو پاراگرافەدا دەیڵێت دیسان قسەی خۆی نییە بەڵکو لە د. حەیدەر ((بردوویەتی))، ئەویش وەك خوێنەر چاوەڕێ دەکات بە سەقەتکردنەوە، بۆ نموونە حەیدەر باسی فەلسەفەو مەزهەبە نوێکانی کۆمەڵگە نوێکان دەکات بەتایبەت ئەوانەی بەرهەمی ململانەی نێوان کەنیسەو ئاین لەلایەکو کۆمەڵگەو دەوڵەتو تاك لەلاکەی تر بوون(ل١٥١)، کەچی میسری باسی ئەو فەلسەفە نوێیانە دەکات کە لەلایەك دژ بە دەسەڵاتی کەنیسەو ئاین وەستانو لەلایەکی ترەوە بەرهەمی ململانەی نێوان دەسەڵاتو کۆمەڵگەو تاکەکەس بوون(ل٣٩٨)، کە ئەمە سەقەتکردنێکی تەواوی قسەکەیە.

٣ –میسری دەڵێت کە دەقی قورئان تەنها ئەوانە بە موسڵمان دادەنێت کە لە مەدینە بوونو لەسەرەتادا هیجرەت بۆ مەدینە کرایە مەرجی موسڵمان بوون(ل٣٩٥). ئەوەش نەزانییە لەبارەی مێژووی ئیسلامو لەبارەی قورئانو فەرمووده چونکە ئەوەندە دەق هەن بەس بن بۆ مرۆڤ بزانێت کە ئەوانەی

[15] د. حيدر ابراهيم علي، التيارات الاسلامية وقضيةالديمقراطية، ل١٥٠-١٥١.

هیجرەتیان نەکردبوو بە موسڵمان دەزانران بەڵام بێبەش بوون لەو وەلایەتەی لەنێوان موسڵمانانی مەدینە بە موهاجیرەکانو ئەنصارەکانەوە هەبوو، واتە ئەوانە وەلیی موسڵمانانی مەدینە نەبوون وەك چۆن هەر موهاجیرێكو ئەنصارییەك وەلیی یەکتر بوونو میراتیی یەکتریان وەردەگرت (تا ئەو کاتەی ئایەتەکانی میرات دابەزین)، هەروەها ئەوانەی هیجرەتیان نەکردبوو بەشیان نەبوو لە دەستکەوتەکانی شەڕ (مەگەر بەشداریی شەڕیان کردبێت)، لەگەڵ ئەوەشدا قورئان فەرمانی بە موسڵمانانی مەدینە دا ئەگەر ئەو موسڵمانانەی هیجرەتیان نەکردووە داوای یارمەتییان لێکردن ئەویش بەهۆی کێشەیەکی ئاینەوە پێویستە بەهانایانەوە بچن مەگەر کێشەکەیان لەگەڵ کەسانێك بێت موسڵمانانی مەدینە پەیمانیان لەگەڵدا بەستبێت.[16] نەشارەزاییەکەی میسریش دوو توێیە چونکە لەلایەك ئەو شتانەی نەزانیوەو لەلایەکی تر هەر خۆی لەهەمان پاراگرافدا ئەو ئایەتەی سوورەتی ئەنفال دەهێنێتەوە کە باسی ئەو پەیوەندییە دەکات کەچی ئەو ئایەتە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی گوایە قورئان هەر ئەوانە بە موسڵمان دادەنێت کە لە مەدینە جێگیربوون! خۆش ئەوەیە ئایەتەکە نەك تەنها ئەو کەسانە بە موسڵمان دادەنێت بەڵکو بە ئیمانداریش ناودەبات (والذين امنوا ولمْ يهاجِروا..)، ئیمانیش وەك زانراوە لە ئیسلام گەورەترە، بۆ نموونە وەك لە سوورەتی (ئەلحوجورات)دا هاتووە کە باسی عەرەبە کۆچەرەکان (ئەعراب) دەکات: (قالتِ الأعرابُ آمنَّا قُل لمْ تؤْمنوا ولكن قولوا أسلمْنا ولمَّا يدخلِ الايمانُ في قلوبكمْ –الحجرات ١٤).

---

[16] بڕوانە تفسير القران العظيم (تەفسیری ئیبنو کەثیر)، بەرگی٢، تەفسیری سوورەتی ئەنفال، ل٣٢٨ -٣٢٩.

٤ – میسری یەکسەر دوای ئەوە دەڵێت: دوای کۆنترۆڵکردنی مەککە دەبوایە هیجرەت بۆ دەرەوەی عەربستان بوایە واتە مەفهوومی هیجرەت گۆڕدرا بۆ جیهاد ئەویش وەك فەرمووده دەڵێت: لاهِجرةَ بعدَ الفتح ولكن جهادٌ ونيّة. ئەمەش نەشارەزاییەکی ترە چونکە دوای فەتحی مەککە شوێنی زۆری تر مابوون نەکەوتبووە دەستی موسڵمانان، واتە جیهاد لەناو نیوەدوڕگەی عەرەبدا مابوو، نەك یەکسەر دوای فەتحی مەککە هیجرەت بوو بە هیجرەت لە بەرگی جیهاددا بۆ دەرەوەی عەرەبستان

٥– کتێبەکەی میسری بە کارێك کۆتایی پێ دێت کە نموونەی هەمووئەو کارانەی باسم کردوون، واتا ((بردن))ی سەرچاوەو سەقەتکردنی زانیارییەکان یان تێنەگەیشتن لێیان یان هەڵگێڕانەوەیان.

میسری باسی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دەکات کە دژ بە بنەمای شوورایەو ئیسلامییەکان دەسەڵاتی یاسادانان دەدەن بە خودا ئەویش بەپێچەوانەی سیستەمی دیموکراتی، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانیش زامنی یەکەمی دیموکراسییەو دژ بە فیکری سیاسیی ئیسلامە کە بەناوی شەرعییەتی ئاینەوە دەسەڵاتێکی ڕەها دەداتە خەلیفەو لەهەوڵی ئەوەدایە سیستەمێك بژیێنێتەوە هاوشێوەی سیستەمی سەرەتای ئیسلام کە (هەموو دەسەڵاتەکان بریتی بوون لە دەسەڵاتی وەحیو دەسەڵاتی پەیامبەر، ڕۆڵی بنچینەیی وەحی دادانی یاسا بوو لەبەرئەوە موسڵمانان پێویستیان بە دەسەڵاتێکی دیکەی یاسادانان نەبووە. هەرچی دەسەڵاتەکانی ترە، پەیامبەر خۆی ڕایپەڕاندوونو جێبەجێی کردوون)(میسری، ل٤٠١–٤٠٢).

ئەوەی لەنێوان کەوانەیە گوایە میسری لە کتێبی (هاني الدرديري، نظام الشورى الاسلامي مقارنة بالديمقراطية النيابية المعاصرة) وەریگرتووە کە

لەڕاستیدا ئەو کتێبەی نەبینیوەو ئەو قسەیەش‌و قسەکانی پێشووشی لە کتێبێکی تر ((بردوویەتی))[١٧]، بێگومان پاش سەقەتکردن چونکە بەپێی د.حەیدەر نووسەرەکە، واتە الدردیری، دەڵێت کە کاتی پێغەمبەر دەزگا فەرمانڕەواکان تەنها وەحی‌و پێغەمبەر بوون بەڵام دوای ئەو سەردەمە دەتوانرێت باس لە چەند دزگایەکی نزیك لە سێ دەسەڵاتەکە لە نیزامی دیموکراتیدا بکرێت. حەیدەر دەڵێت دەوری سەرەکیی وەحی یاسادانان بوو بۆیە موسڵمانان پێویستیان بە هیچ دەسەڵاتێکی تری یاسادانان نەبوو، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ قسەی الدردیری کە پێغەمبەر دەوری دووەمی پاش وەحیی دەبینی‌و تەبلیغی دەکرد لە بواری یاسادانان هەروەها ئیمامەت‌و قەزاو فەتوا لە بواری ڕاپەڕاندن.

قسەکەی میسریش کە فیکری سیاسیی ئیسلامی دەیەوێت نیزامی سەرەتای ئیسلام بژێینێتەوەو ئەوە دەسەڵاتێکی ڕەها دەداتە خەلیفە لەڕاستیدا قسەی حەیدەرە کە بەشێوەیەکی ترە: ئەو دەڵێت کە بزاڤە ئیسلامییە سیاسییەکان بانگەشە بۆ کۆمەڵگەی دەوڵەتی مەدینە دەکەن ئەوەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گەڕانەوە بۆ ئەو نموونەیە دەگەیەنێت، لەمەشەوە ترسی ئەوە هەیە ئیمام قودسیەت یان عوسمەت بەخۆی بدات. حەیدەر دەڵێت: زەمانەتی نەبوونی ئیستبداد، ناشڵێم دیموکراسی لە نیزامی سیاسیدا بریتی نییە لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەڵکو بەهێزی یان لاوازیی ڕێگرە ئاینییەکەیە، ئیسلامییەکانیش خۆیان لەوە دەترسن.

---

[17] ئەویش: د. حیدر ابراهیم علی، التیارات الاسلامیة وقضیة الدیمقراطیة، ل١٦٠ - ١٦١.

## سەرچاوەکان

- ابو الاعلى المودودي، الجهاد في سبيل الله، دون مترجم، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٣٩٧–١٩٧٧.
- ابو زهرة، محمد، اصول الفقه، دار الفكر العربي، ١٣٧٧–١٩٥٧.
- اسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي(الحافظ) (ت ٧٧٤هـ)، تفسير القران العظيم، دار المعرفة، بيروت، ١٣٨٨–١٩٦٩.
- التهانوي، ظفر احمد العثماني، قواعد في علوم الحديث، حققه وراجع نصوصه وعلق عليه عبدالفتاح ابو غدة،ط٣، مكتب المطبوعات الاسلامية، بيروت، ١٣٩٢–١٩٧٢.
- حسين مروّة، النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، ج١–٢، دار الفارابي،بيروت، ط٦، ١٩٨٨ (ط١ ١٩٧٨).
- حيدر ابراهيم علي (الدكتور)، التيارات الاسلامية وقضية الديمقراطية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ط ٢، ١٩٩٩ (ط١ ١٩٩٦).
- ريموند بودون و فرانسوا بوريكو، المعجم النقدي لعلم الاجتماع، ترجمة د. سليم حداد، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع،بيروت، ط١، ١٩٨٦.
- سنن ابن ماجة، حقق نصوصه ورقم كتبه وابوابه واحاديثه و علق عليه محمد فؤاد عبدالباقي، دار الفكر، دون تاريخ.
- سيد قطب، في ظلال القران، دار الشروق، ط ١٥، ١٤٠٨–١٩٨٨.
- سيد قطب، معالم في الطريق، ط٨، ١٤٠٣–١٩٨٣، طبعة دار الكتاب الاسلامي على الاصل، قم (ايران).

- السيوطي، جلال الدين، تاريخ الخلفاء، دار المعرفة، بيروت، ط٤، ١٤٢٠-١٩٩٩.
- الشافعي، محمد بن ادريس، الرسالة، تحقيق وشرح احمد محمد شاكر، شركة مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي واولاده، القاهرة، ط١،١٣٥٨-١٩٤٠.
- الشهرستاني، الملل والنحل، تصحيح وتعليق احمد فهمي محمد، مكتبة الحسين التجارية، القاهرة، ١٩٤٨.
- صحيح البخاري، دار احياء التراث العربي.
- صحيح تاريخ الطبري، مجلد ٣، الخلافة الراشدة، تحقيق وتخريج الروايات وتعليق محمد بن طاهر البرزنجي، اشراف ومراجعة محمد صبحي حسن الحلاق، دار ابن كثير، دمشق-بيروت، ط١، ٢٠٠٧
- صحيح مسلم، دار الفكر، بيروت.
- عبدالجواد ياسين، السلطة في الإسلام، العقل الفقهي السلفي بين النص والتأريخ، ط١، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء، ١٩٩٨.
- عبدالكريم زيدان (الدكتور)، الوجيز في اصول الفقه، طبعة دار (نشر احسان)، ايران، على الطبعة السادسة، ١٩٧٦.
- علي الوردي (الدكتور)، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٣، مطبعة الشعب، بغداد، ١٩٧٢.
- فتحية النبراوي (الدكتورة)، محمد نصر مهنا (الدكتور)، تطور الفكر السياسي في الاسلام دراسة مقارنة، ج١-٢، ط١، دار المعارف، القاهرة، ١٩٨١.
- فهمي هويدي، القرآن والسلطان، هموم اسلامية معاصرة، دار الشروق، بيروت، -القاهرة، ط٢، ١٩٨٢.

- فيصل دراج وجمال باروت (محرران)، الأحزاب والحركات والجماعات الإسلامية، ج١، المركز العربي للدراسات الاستراتيجية، دمشق–صنعاء، ط٤، ٢٠٠٦.
- محمد بلتاجي (الدكتور)، مناهج التشريع الاسلامي في القرن الثاني الهجري، دار السلام، ط٢، طبعة دار السلام الاولى، ٢٠٠٤
- محمد حسنين هيكل، خريف الغضب، ط١١، شركة المطبوعات للنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٨٥.
- محمود الطحان (الدكتور)، تيسير مصطلح الحديث، دون تاريخ.
- مناع القطان، تأريخ التشريع الاسلامي، التشريع والفقه، ط ٢، الطبعة الاولى لمؤسسة الرسالة، بيروت، ٢٠٠١.
- میسری، فوئاد مەجید، کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا، چاپی ٢، ٢٠٠٠.
- نصر حامد ابو زيد (الدكتور)، نقد الخطاب الديني، ط٢، سينا، القاهرة، ١٩٩٤.
- يوسف القرضاوي (الدكتور)، الاسلام والعلمانية وجها لوجه، مؤسسة الرسالة، ط٣، بيروت، ١٩٩٢.
- يوسف القرضاوي (الدكتور)، الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف، طبعة (نشر ادب) على الاصل، قم (ايران)، ١٣٧١ هجري شمسي.

## بڵاوكراوەكانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەكەم) | جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵلا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان (كتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |

| ژ | ناونیشان | نووسەر |
|---|---|---|
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا<br>و: شوان هەورامی |
|---|---|---|
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ – ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنە دنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |

| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
|---|---|---|
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە) قانع خورشید پێشەکی بۆ نووســـــــــــــــــیوەو رێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کـــۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووســینی:یوســف حــاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شاربازێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:<br>ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا ١٩٠٦-١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی: محمد عەبدول رەحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧-٦٥٦ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانـی: عبـدالرحیم |

| | | |
|---|---|---|
| | | معرفتی |
| ٥١ | وەڵامێك بۆ کتێبی کچانی خوا | نووسینی: ئامینە صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری ئوسووڵیی ئیسلامی لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێنەواریدا– نەزانیو نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی لە کتێبی بیری ئوسووڵیی ئیسلامیی فوئاد مەجید میسری | نووسینی: فاضل قەرەداغی |